زنجیرەی سێ کتێبی عیرفانی – ئەدەبی

# مەحوی ناسی

هیمداد شاهین

﴿کتێبی یەکەم﴾

ناوی کتێب: مەحوی ناسی
بابەت: لێکۆڵینەوە
نووسینی: هیمداد شاهین
بەرگ : هێرش سدیق
دەرهێنانی هونەری: ئەنجام سەعید
لە بڵاوکراوەکانی یەکێتیی نووسەرانی کورد– لقی کەرکووک ژمارە (١٣٤)
چاپخانە: کارۆ
چاپی یەکەم– ٢٠١١
تیراژ: (٥٠٠) دانە

*پێشکەشە بە :*

هاوڕێم (( ڕێبین هەردی ))،پیاوێك پڕاو پڕ لە جوانی،تەنانەت توڕەبوونەکانیشی هەر جوانن .

هاوڕێم (( سەباح ئیسماعیل ))،کوڕی مەملەکەتی ڕۆمانەکان،پیاوێك بۆ ڕۆمان .

وتم کوابێ ئەو ڕۆژەی بگەم بە وەسڵت ، وتی : جوان بگەڕی ، ڕەنگە گەیشتبیت بە دیداری ئەو وەسڵە .

((فەیزی کاشانی))

تۆ یەك نیت و تەنیا نیت ئەی هاوڕێ ، بەڵکو گەردونێك و دەریایەیەکیت .

(( مەسنەوی،مەولانا))

فیرعەون تەنها خۆی بینی و بەڵام خودای لەدەست چوو ، منیش تەنها خودام بینی و خۆمم لە دەست چوو .

((مەنصوری حەللاج))

## پێشگوفتار :

پەیوەندی نێوان شیعر و ، شاعیر ، پەیوەندی نێوان دوو جۆر بوون نیە لێکدی جیاواز یان دوو شێواز لە بوون بەیەك دی ناکۆك و یەك ئەوی دی نەفیکەربن ،بەڵکو پەیوەندیەکی پتەو و گرێدراویان پێکەوە هەیە ، ئەزموونی مەولانا مەحوی یەکێکە لە ئەزموونە هەرە مەزنەکانی نێو دونیای شیعری نەتەوە ، مەحوی ئەو پیاوەی کە من ڕۆژ بە ڕۆژ عاشقتری ئەبم ، پیاوێك لە درزی دەرگاکاکانەوە پێماندەڵێت ئێستا کاتیەتی ، کاتی ڕەتکردنەوەی مانا ڕووتەکانی سروشتە ، کاتی فەرامۆشکردنی سێبەر و خۆری سروشتە ، ئێستا ئیدی کاتی گەڕانە بە شوێن ماناکانی تری سروشت دا ،

ئەزیزانی من ئەم کتێبە بریتیە لە شەش باسی زانستی جیاواز ، کە تا ئەندازەیەك توانیومانە هەندێك ڕەهەندی تازە و جیاواز دەربخەین و ئیشمان لەسەر کردووە ، وە هەروەها توانیومانە لە کۆنێکتی نێوان مەحوی ڕۆح و مەحوی جەستە تێبگەین و هەروەها ئەوەشمان خستۆتە ڕوو کە مەحوی ئەو کەسەیە کە لە ئێستا دا بە دەیان و سەدان کێشەی سایکۆلۆجی و مەعریفی و ڕۆحی گەورەی بۆ هەموو نەوەکانی کۆمەڵگای ئێمە دروست کردووە ، وە هەربۆیە لە ئەمڕۆ دا  ئەو تێکستانەی پێویستی زیاتری بە شیکردنەوە و هەڵسەنگاندن و پێداچوونەوەیە ، وە ئێمە توانیومانە چەند لایەنێکی مەعریفی دینی و فەلسەفی بخەینە ڕوو لە ڕێگای تێکستە شیعریەکانیەوە ، هەڵبەت بەشێکی گرنگی نێو ئەم کتێبە ئەو بەشەیە کە دەربارەی غەم و شادییە ، تا ڕادەیەك هەوڵمداوە بە وردی قسەی لەسەر بکەم ، وە بەو پێ یەی ئەدەبی مەحوی ئەدەبی پێش جەنگی جیهانی یەکەم و پێش مۆدێرنەیە ، بابەتێکی تر لەسەر مەسەلە وجودییەکانە لە لای مەحوی ، هەڵبەت ئەو بابەتیش بە وەرگرتنی کۆمەڵێك سەرچاوەی فەلسەفی و فیکری پێك هاتووە ، وە ڕاستیەکەی نوسینی من لەسەر مەحوی تەنها لەبەر ئەوەبووە کە ئەو منی بردوە ، تا ئەندازەی ئەوەی کە دەمانێك بە خۆم بێگانە بووم

و بەو ئاشنا بووم ، بەڵام دوای سەرنجدان لە بەشێك لە تێکستەکانی ، وەکو سروش ئەڵێ : از خود بیگانگی و بازگشت بە خویشتن ، بێگانە بووم بە خۆم و بەڵام ئیدی گەڕامەوە بۆ خۆم ، ئەویش هەر لە ڕێگەی ئەوەوە ، کەسێك کە خوای پێ ناساندم ، لە هەمان کات دا ناساندمی بەخۆم و دواتر دونیاشی پێ ناساندم ، خۆشەویستی من بۆ مەحوی حەزرەت هەمیشە وەکو ئاگرێکی کڵپەدار وایە و بێ کوژانەوەی تا هەتایی ، لە نێو باغی یادەوریەکانما ئەو یەکێکە لەوانەی کە شوێنێکی زۆر گەورە و تایبەتی گرتووە ، من تا ئێستایش لە خۆم تێرم و لەو هەر تێر نەبووم ، گەر لەخۆم پەشیمان بم لەو پەشیمان نیم ، سەردەمانێك پێش ئێستا کە شیعرەکانیم ئەخوێندەوە وەکو شتێکی سادە لێ ی تێدەگەیشتم ، بەڵام دواتر بۆم ڕوون بوو وەوە ، کە من بەرامبەر بەچی وەستاوم و ئەمەوێت چی بیخوێنمەوە ؟ ئەو چیایەکە هەمیشە پشتم پێ بەستاوە ئەگەر خودا یارمەتی بدات ، من کە ئەوم خوێندەوە تەنها بۆ ئەوە بوو کە بتوانم لە دونیای شیعری کلاسیك دا کەمێك شارەزا بم ، بەڵام ، بردمی و بردمی ، بەرەو چەم کە تینوو بووم ، مەیدانی ئەو، ئەو مەیدانەیە کە ئەبێت سەرتی تیا ببەخشیت وەکو خۆی پێمان دەڵێت ، هەڵبەت ئەم کتێبە زۆر بچوکە لە ئاست گەورەیی

ئەو دیوانە و ئەو حەزرەتە دا ، وە من هەندێك مەسەلەی زۆر سەرەتاییم باس کردووە کە باس نەکراون ، ئەویش لەبەر ئەوەی دونیای نەتەوەی ئێمە ئەو دونیایەیە کە تا ئێستاش نەیتوانیوە هەندێ لێکۆڵینەوەی بە پێز و جددی لەسەر ئەو تێکستە شیعریانە بکات و هیچ کات هەستی بە بەرپرسیاریەتی نەکردووە لە بەرامبەر پێگەی مەعریفە ، من بڕوام وانیە کە تائێستا پێنج کتێبی باش هەبێت چ لەسەر مەحوی و چ لەسەر نالی و چ لەسەر وەفایی و قانیع و هەردی و ... هتد ، ئەویش بەهۆی ئەوەی کە لە ئێستا دا بەڵی مەعریفە و ڕۆشنبیری کوردی لە قەیرانێکی بەر بڵاو و فراوان و با ئاشکرا هەستپێکراو دا دەژیت ، بۆیە من ەیوام وایە کە ئەم وەرزی لاتی لە مەعریفەیە تێپەڕێنین و ئارەزو وە تینوی ئەو دونایەیە بین کە ناوی دونیای مەولانا مەحویە و وە هەروەها پیاوانی تری دونیای مەعریفە ، ئەو بە نیسبەت کوردەوە هیچ کات کەمتر نیە لە مەولانا ڕۆمی ، هەرچەندە مەولانا ڕۆمی بە کۆمەڵێك پلە لەو بەرزترە و گەورەترە ، بەڵام وەکو کورد ئێمە دەبێت زۆر شانازی بە مەحویەوە بکەین ، چونکێ ئەو لە نێو کورد دا لە جێ ی ڕۆمی گەورەیە بۆ ئێمە ، ئەم کتێبە ئەو لێکۆڵینەوانەن کە بە کەمێك دەسکارییەوە کە هەندێکیان ، چەند بەشێکیان لە ڕۆژنامەی چاودێر لێ

بڵاو بۆتەوە ، هەڵبەت لەبەر ئەوەی دورودرێژن هەر لەبەر ئەوەیش هەمووم دانەبەزاندن ، وە هیوادارم بەم کتێبە توانیبێتم کەمێك خزمەت بە کتێبخانەی کوردی بکەم .

هیمداد شاهین

# دونیا ناسی لە دیدی:
# (حەزرەتی مەحوی) ە وە

**ئەو مەسخەری زەمانە بە شاه و وەزیری کرد**
**ئەو کەتنە قەت مەڵێ بە گەداو و فەقیری کرد**
**کلکێکی پێوە کرد و بەرەو ژوری ژوری برد**
**تێی هەڵدەدا شەقێك و سەرەو ژێری ژێری کرد**
**((مەحوی))**





**بۆ ئەوەی لە نهێنی زۆر لە گوتارەکانیی نێو دونیای ئەدەبی کوردی بە گشتی و ئەدەبی کلاسیکی کوردی تێبگەین , پێویستە لە نێو ستراکتۆری شاردراوە و دیوی نهێنی تێکستەکان بە دوای ماناکانی تری تێکست دا بگەڕێین ,مەولانا مەحوی یەکێکە لەو عاریف و لە هەمان کات دا فەیلەسوفەی کە پەیامەکەی لە شێوە و ڕێگەی شیعرەوە گەیاندۆتە نێو دونیای نەتەوەی کورد، ئەم عاریفە لێوانلێو لە موحیبەت نواندن و سەرگەشتەی عیرفان و سەودا زەدەی عیشقی ئیلاهی لە دڵ و دەرونیدا بە تەواوی ڕەگی خۆی داچەقاندبوو ,هەر ئەمەش وای لە جەنابیان کرد کە شیعرانێك بنوسن هاوشانی شیعرەکانی مەولانای ڕۆمی و شێخی سەعدی و حافزی شیرازی و ... هتد بێت، تێگەیشتن لە پەیامی ئەم پیاوە عاجباتیە ئاسان نیە ، چونکێ هەموو تێکستەکانی یەك پلەی شیعرییان هەیە ، ئەویش پلەی باڵای شیعرە ، بۆ ئەوەی جورعەیەك لە دونیا عیرفانیەکەی ئەم پیاوە گەورەیە تێبگەین سەرەتا دەبێت بگەڕێینەوە بۆ نێو مەملەکەتی تێکستە شاردراوە و نهێنیەکانی , تا بزانین ئەم پیاوە بەڕاستی عاریف بوە یان نا ، واتا خواناسێکی عاریف و دونیا ناسێکی عاریف،سەرەتا با لە سادەترین پرسیارەوە دەست پێ بکەین**

، ئەویش ئەوەیە کە بپرسین عیرفان چیە و عاریف کێ یە، یان بە کێ دەوترێت عاریف ، هەڵبەتە هەردوو کۆنسێپتەکە هەم پەیوەندیەکی گشتگیر وە هەم پەیوەندیەکی ناگشتگیریان هەیە پێکەوە،دەمەوێت ئەوە بڵێم پوختەی وەڵامی ئەم دوو پرسیارە ئەمەیە : ئەگەر ئێوە سەیرێکی دونیاو چۆنیەتی ژیان تێدا گوزەراندنی ئینسانەکانی نێوی تێبگەن ،ئەوا جۆرێك لە بچووك بوونەوەی خۆتان لەبەرامبەر گەورەیی گەردون لە خۆتان دا هەست پێ دەکەن,ئەمە چ جای ئەوەی کە لە تەواوی وجوودیەت ورد ببیتەوە ، هەڵبەتە دەبێت بزانین عیرفان بریتیە لە دۆزینەوە و زانینی نە دۆزراوە و نەزانراوەکانی کۆی گەردوون،واتا گەڕان بە دوای مانا شاردراوەکانی بوون،ئیدی گرنگ دۆزینەوەی مانا دروست کانی کۆی بوونە بە ورد و درشتی یەوە ، کەسی عاریفیش ئەو کەسەیە کە بەتەواوی(کامل و شامل) ئاشنای بوونە و بوون دەناسێت،ئەوەی کە کەسێك دەکات بە عاریف ، لە ڕاستیدا بیرکردنەوە و پرسیارە ناخیەکانیەتی، وە ئەوەی بۆ عاریف گرنگە دۆزینەوەی بوونە لە ڕێگەی خودی بوون خۆیەوە،هەڵبەت بە بڕوای کەسی عاریف جگە لەو ڕێگەیە لە ڕێگەی دیەوە پەی بە زانینی نەزانراوەکانی بوون بەرێت,بۆیە کاتێك ئاشنای بەشێك لە نەزانراوەکانی بوون





دەبێت،ئەوا بەشێك لە پرۆسێسی چوون بەرەو گەورەیی خودا لە بوونی خۆیدا دەبێت بە بەشێك لە ڕیالەتی ئەو کەسە (عاریفە)، وە هەر لەبەر ئەم هۆیەشە کە عاریفەکان کەم تا زۆر هەمیشە جۆرێك لە سنوراندنی گەورەیی خودییان تێدا بەدی دەکرێت , هەڵبەت ئەمیش هۆیەکەی ناسین و دۆزینەوەی بەشێکی نەزانراوی گەردوونە کە مرۆڤی ئاسایی بە ئاسانی پێ ی ناگات و نایدۆزێتەوە,بۆیە وەکو سەرەتایەك بەباشم زانی ئەو خاڵە گرنگە بوروژێنم سەبارەت بە بۆچوونی مەولانا مەحوی بەرامبەر دونیاو دواجار وەکو دەرگایەکیش بێت بۆ ئەوەی بچینە نێوە پاکێجی خودا ناسی ئەم پیاوەوە :

زەمانە بەعزە کەسانێ لەپڕ کە هەڵدەبڕێ
ئەوەندەی هەڵدەبڕێتن هەتا لەکەل دەبڕێ
بەیەك دوو کلکە بەرەو ژوری بردەوە دنیا ،
بە تاقە نوکە شەقێکی فڕێ دەدا لە پڕێ

(مەحوی)

**مەحوی گەورە لە قەصیدەیەکی تا ئاستێك دور و درێژدا بە جوانی ڕۆڵی دونیا نرخاندوە لە بازنەی بەتاڵ و ڕۆڵی ئینسانەکانیشی نرخاندوە لە نێو بازنەی ژیان دا ، من لە قەصیدەی بەحری (نور) دا چەند بەیتێکی دەهێنمەوە بە نموونە،لە ڕاستیدا حەزم دەکرد هەمووی بهێنمەوە بە نموونە،بەڵام ڕاستیەکەی ئەو قەصیدەیە زۆر دوور و درێژە و سەر و ١٢٠ بەیت دەبێت، بەڵام ئێمە لێرە دا وەکو نموونە سەروی (٣٠) بەیتی دەهێنینەوە ، ئەویش لە بەیتی ٨٩ تا کۆتایی قەسیدەکە ،چونکە بە ڕاستی ئەو قەصیدەیەی ئەو زۆر گوزارش دەکات لە بابەت دونیا و مۆڤەکان و تەماسیان لە گەڵ گەردوون و خودا دا بۆیە من هەموو ئەو ٣٥ بەیتەی کۆتاییم وەکو خۆی پەیست کردوە، تا ڕوون بێتەوە مەحوی عاریفێکی خواناس ووە و هەر لەم ڕێگە و بەم میتۆدەش لە دونیا گەیشتوە و سەرنج و قسەی گەورە لە سەر کۆی دونیا و ئینسانەکان دەکات :**





**چتیریٚ و مەنیٚ جۆ ڕۆژی خەندەق قوتی دە سەد کەس**
**بە تەکمیلی ، بە ڕوو خۆشی عەتا فەرموو کەریمانە**

**لەهەر ڕێیەك دەڕۆیی ، بۆ سەلام و سوجدە بردن**
**چ جۆشیٚ بوو دەکوتە دار و بەردی ئەو مەکانانە**

**بە هەوری تێمەگەن ، ئیللا مەلائیك شەهپەڕی خۆیان**
**هەموو دەم یەك دە دا بۆ سایەبانی ئەو سولەیمانە**

**دوعا فەرمونی بۆ عاهات و دەردی بیٚ دەوا سەیرە**
**لە دڵیایە کە ئاساری ئیجابەی مەرەەمی جانە**

**چیە ئیبرا ، وەرە سەر موعجیوەی ئیحیا بە حەددێکە**
**لە ئەنفاسی (نفخت فیه من روحی) نومایانە**

**ئەوەندە چاوی پڕ بیٚ نوری پڕ نور و مونەووەر کرد**
**کە نەرگس چاوە چاوی نوریە لەو نوری چاوانە**

**خەبەردانی لە موستەقبەل قسەی چی لیٚ بکەم تاحەشر**
**هەموو بەر تیبقی فەرمودەی ئەوە ئەم واقیعاتانە**

**بەیانی شەش حەو ئیعجازی لە جوملەی صەد هەزار ئیعجاز**
**ئەوی دەیکا پەشیمانە ، ئەوی نەیکا پەشیمانە**

**ئەگەر بیٚ موعجیزاتی صەد یەکیٚکی بیٚنمە تەحریر**
**دەبیٚ هەر تاقە بەیتیٚکم ، ببیٚتە صەد کوتوبخانە**

**چ قابیل من بە صەد بەیتیٚکی کوردی، صەد هەزار ئەسرار**
**بدەم شەرح و بەیانی کەم لەگەڵ ئەم عەقڵی نوقصانە**

**کە هەر سیڕڕیٚکی عەقڵی کول تیا کول مایەوە (بالکل)**
**کە هەر سڕڕیٚکی صەد عاریف تیا مەدهۆش و حەیرانە**

**فەقەت نابیٚ کە دەرکی کول نەبوو یەکبارە تەرکی کول**
**بە باغیٚکە لە کن بولبول گوڵیٚ لەو باغ و بوستانە**





**لە (همزیە) و لە (بردیە) م چونکە کەم دی ئیستیفادی کورد**
**منیش ئەم کوردیەم دانا ، لە ڕیزی ئەو قەصیدانە**

**زوبانی عیشقبازی خۆشە گەر کوردی وەگەر تازی**
**قسەی بیٚ سۆزی عیشق ئەر گەوهەر، مەحبوبی بیٚ ئانە**

**ئەلا ئەی فەخری عالەم (رحمە للعالمین) ی تۆ**
**لە دەرحەق ناکەس و کەس ڕەحم و لوتفی ئیٚوە یەکسانە**

**بدە ئیزن ، ئەم قەصیدە کوردیەش بیٚتە مەقامی عەرچ**
**ئەگەرچی وەك شعورم شیعرەکانیشم پەریٚشانە**

**موکەڕڕەر بوو قەصیدەی بوردە ، نەشئەی عالەمی پڕ کرد**
**بفەرموو بەم قەصیدە کوردە نۆبەی نەشئە پیٚوانە**

**ئەگەر بوردە ئەگەر کوردە ، ئەگەر سافە ئەگەر دوردە**
**قوبوڵی تۆ کە و لەبریٚزی نەشئەی ڕەوح و ڕەیحانە**

**قوبوڵی تۆ نەبوو ، سەد با عەرەب بێ هەر ئەبوو جەهلە**
**قوبوڵی تۆ ئەگەر بو ، فورسی دووسەد ساڵە سەلمانە**

**منم وەك ئەو زەعیفە ، ئەم قەصیدە ، ئەو گلە دەزوە**
**ئەمن کڕیاری ماهی (لا مکان) ، ئەو ماەی کەنعانە**

**منم موری زەعیف و ئەم قەصیدە لاقە کولەی من**
**فەقەت من هەدیەکەم خدمەت سولەیمانی سولەیمانە**

**بەچاوی مەرحەمەت بڕوانە هەدیە و ساحێبی هەدیە**
**بە زۆری ڕابوێرە ئەم کەمە لەم کەمترینانە**

**قوبوڵی کەم لە کەم کردن ، وەها وا تێبگا زۆرە**
**بەتۆ زۆری بزانم کەمتری شیمەی کەریمانە**

**ئەدەب وایە کە لەم گوستاخییانەش تۆبەی کەی ((مەحوی))**
**خەیاڵی خاوە عەنقا ناکەوێتە داوی ئەفسانە**

**دەبێ هەر موو زوبانێ ، هەر زوبانێ داستانێ بێ**





**بکەم نەختێ بەیانی ناکەسی خۆ بەو زوبانانە**

**ئەوەندەی زاتی ئێوە مەخزەنی فەزڵ و کەماڵاتە**
**لە مندا بەو حەددە نەقص و ڕەزائیل دەرج و پەنەانە**

**دەخیلی سەگی ئەو بەرقاپییەم جارێ بە یەگجاری**
**سەرئەفرازم بکە ، فەرمو : سەگی بەر دەرکی خۆمانە**

**وەکو جامی دەڵێ ، دەم وشك هەڵاتو من سەگێکی گەڕ**
**جگەر تینوم و دەخوازم ، نمێ لە بەحری ئیحسانە**

**بەیەك دو قەترە تێر ئاوی حەیاتی کە وەکو قیتمیر**
**لە کەهڤ خۆتیا ڕێ دە ، سەگی ئەسحابی خۆتانە**

**دەکەم عەرزی نیاز ، ئەرچی لە تۆ نایابە مەخفی ڕاز**
**بە جان و دڵ ، دڵ و جانم ، خودا خواهانە ، خواهانە**

**لە تۆ حوببی خودا بۆ خۆم و بۆ ئەولاد و ئەحبابم**
**کە حوبی ماسیوا دەرکا لە دڵ وەك بت لە بتخانە**

**خودایا هەم لە تۆ حوببی ڕەسوڵ و ئیتیباعی ئەو**
**كە ئیكسیری مسی ماهیەتی مەغشوشی ئینسانە**

**بباریٚ ، یا ڕەبی هەر لەحزە صەد لەك بارشی ڕەحمەت**
**لەسەر ئەو ، هەم لەسەر ئەو جەمعی ئال و صەحب و یارانە**

**هەتا ئاگر گرێنی شۆڕشی تەبع و خورۆشی دڵ**
**كزەو سۆزەی نەسیمی صوبح و ئێوارەی بەهارانە**

**صەبا تا لێوی غونچەی گوڵ دەكا تەعلیمی شەككەرخەند**
**نەسیمی صوبحدەم تا پەرچەمی سونبول دەكا شانە**

**هەتا هەوری بەهاری غەزاكاریی گوڵشەنە ئیشی**
**هەتا بولبول لەسەر گوڵ نەغمەخوان و ناڵە سەنجانە**

**بڵێن ئینس و مەلەك پڕ بەم زەمین و ئاسمانە :**
**(وصلی الله علی) ئەو بەحری نوری عیلم و عیرفانە**
**كە دەركی غەوری ناكا (غیر علم الله سبحانە)**





**لە ڕاستیدا سەلماندنی عاریف بوونی مەولانا مەحوی زۆر گرنگ نیە،چونكێ ئەم پیاوە خۆی عاریف بوە و بە بێ قسە لەسەر كردن،وە سەلماندنی ئەو ماتەرە قسەی زیاتر هەڵدەگرێت، كە دواجار بڕوامان پێ ئەهێنێت كە ئەم شاعیرە عاریفێكی ڕاستەقینە بووە، بەڵام ئەوەی گرنگە ئەوەیە كە تێڕوانینەكانی مەولانا مەحوی بەرامبەر بە دونیا و خودا چیە،سەرەتا با بێینە سەر تێڕوانینەكانی مەولانا مەحوی بەرامبەر دونیا، تێڕوانینی مەحوی بۆ دونیا هێجگار ڕەشبینانە بووە و دونیای بە شوێنی نەهامەتی و بە هیلاكەت بردنی ئینسان زانیوە،هەتا لە شیعرێكی خۆیدا دونیای بە كەلاكە تۆپیو شوبهاندوە و بەشێك لە ئینسانەكانیشی بە سەگ شوبهاندوە كە چۆن شەڕی لەسەر ئەكەن ،بۆیە دەبێت ئەو حەقیقەتە هەست پێ بكەین كە دونیا بینی مەولانا مەحوی تەواو جیاواز بوو وە لەو دونیا بینیەی كە شاعیرانی پێش خۆی هەیانبوو وە،**

پرسیارگەلێکی گرنگ دێتە پێش کە وەڵامدانەوەی ئەم پرسیارگەلە پاکێجێکمان لە بابەتەکە بۆ ڕوندەکاتەوە : هەندێك لەو پرسیارانە ئەمانەن ، ئایا مەولانا مەحوی عاریف بوە یان سۆفی ؟ یان، ئایا مەولانا مەحوی سۆفیەکی عاریف بوە؟ دەکرێت پرسیاری ئەوەش بکەین ،ئایا هەموو سۆفیەك عاریفە؟ ئەم پرسیارانە وڵامدانەوەیان هێندە ئاسان و سانا نیە، چونکێ وەڵامدانەوەی ئەم پرسیارانە پێویستیان بە قوڵ بوونەوەیەکی مەعریفی و عاقڵانە هەیە , تا بتوانین لە وەڵامدانەوەکانمان دا توشی هەڵەو کەم و کورتی مەعریفی نەیەین،جا بۆیە سەرەتا هەندێك بەیتە شعریی ئەم پیاوە مەزنە دەربارەی دونیا دەخنەینە ڕو کە عاریف بوون و سۆفی بوونی ئەم پیاوە دەسەلمێنن و دواتر هەوڵی تێگەیشتن لە و بەیتە شیعرانە دەخەینە گەڕو شیان دەکەینەوە تا بتوانین دونیا بینی ئەم پیاوەمان بۆ ڕون بێتەوە ، لەگەڵ تێگەیشتن لە دونیا بینی ئەم پیاوە چۆنیەتی ژیانیشیمان بۆ ڕوون دەبێتەوە کە چۆن کەسێك بوە ، ئەمەش بۆ ئەوەی وەڵامدانەوەی ئەو پرسیارانە وێڵ و ون نەکەین، سەرەتا با لەو بەیتە شیعرانەوە دەست پێ بکەین کە عاریف بوون و دونیا ناسی ئەم پیاوە نیشان دەدەن، واتا هەم عاریف





بوونەکەی و هەم تێڕوانینیشی بۆ دونیا دەخەینە ڕو ، ئەو دەفەرموێت :

دەزانی جیفەیە دونیا ، دەحەیفە
وەکو سەگ ، ئەم شەڕ و شۆڕە لەسەر لاك

یاخود :

دنیا تیا ترۆیە مەوەستە تیا بڕۆ
کێ مایەوە تیا ، کە نەبووبێ تیا ترۆ

هەروەکو پێشتر وتم تێڕوانینی مەحوی بۆ دونیا لە زیاد لە پنتێك جیاواز بووە ، لە شاعیرانی تری وەکو نالی و سالم و کوردی ،تەنانەت جیاواز بووە لە بابا تاهیری هەمەدانیش ،چونکێ مەحوی دونیای بە شوێنی تۆتۆ و پاکێجێك لە دۆزەخ زانیوە، ئەوەتا دەڵێت :

لە مانمدا نەدیوە حاسڵی غەیری تەوەحوش ،من
خودا پێداو ئەو کەسانەی لەم وحوشستانە زوو ڕۆین

دونیا لەلای مەحوی لە هەندێك سات دا لە جەهەننەم زۆر خراپتر و ناخۆشتر بووە، کە پیێ ی وابووە مرۆڤ ئەگەر بێت و لێرە ڕزگاری بێت ، ئەگەر بچێت بۆ دۆزەخیش هەر قازانجی کردوە :

ئەوەندە تەنگ و ناخۆشە ، لە دونیا
خۆشە دەرچون ، ئەگەر چی بۆ سەقەر چین

ئەمانە ئەو نمونە گەلەن کە هیچێتی دونیامان بۆ ڕوون دەکاتەوە لە لای ئەم عاریفە،وە ئەم پیاوە لە ماوەی تەمەنی فیسیۆلۆجی و عەقڵی و مەعنەویەتی ژیانی خۆیدا هەمیشە پەرەندەی کۆی دونیا بووە و ئیشی لە سەر هیچاندنی دونیا کردوە،دونیایەکەی مەولانا مەحوی زیاتر لە دونیایەکەی ڕابیعەی عەدەویەوە نزیك بووە وەك لە شاعیرانی وەکو نالی و سالم و کوردی و بابا تاهیر،من بڕوام بەوە هەیە تێکستی هەموو شاعیرانی کلاسیك جۆرێك لە ڕەشبینی پێوە دیارە، وە لەگەڵ ئەو ڕەشبینیە بەرامبەر دونیا،گەشبینیەك لە نێو تێکستەکانیان بەدی دەکرێت کە زادەی گەیشتن بە وەڵامی پرسیارگەلێکی گەردونین،بەڵام ناتوانین هیچ کات درك بەوە بکەین کە ئەم شاعیرانە وەکو مەحوی گەورە ئەوەندە باس لە





پوچی دونیا بکەن,بەڵام بەشێکی زۆری ئەم شاعیرە کلاسیکیانە ، کە فورس و کوردو عەرەب بەشی زۆرینەن ، بە جۆرێك لە جۆرەکان ڕەشبین بوونە بەرامبەر بە دونیا و لە هەمان کات دا گەشبین بوونە بەرامبەر بە قودرەتێك کە خولقاندونی و بە عیشقەوە دەیپەرستن و پەنای پۆ دەبەن، بۆ نمونە شێخی سەعدی دەڵێت :

تا عهد تو دربستم عهد همه بشکستم
بعد از تو روا باشد نقض همه پیمان را (٢)

<u>یاخود مەولانای ڕۆمی دەفەرموێت :</u>

مستم ولی از روی او،رقم ولی در جوی او
از قند و از گلزار او،ون گلشکر پروردەام(٣)

ڕوو کردن لە خودا و شەیدا بوون بە خودایەتیەکەی ئەو یەکێك بوە لە مۆڕاڵە هەرە سەرەکیەکانی دونیای عاریفان لە ژیانی عیرفانییان دا ,بۆیە بە بە بڕوای مەولانا مەحوی , دونیا وەکو چۆن بۆ مرۆڤیتێگەیشتو و پێگەیشتوەکان

**هیچە ئاواش بۆ مرۆڤگەلە هیچەکان شتە،اتا  لە هەمان کات دا کاڵایەکە و بۆ بەر بەر مرۆڤی ناکەس و هیچ دوراوە و براوە، ئەگەر مانایەکی تری بدەینە پاڵ ، ئەوا دەڵێین :دونیا بە ئارەزوی ئەو کەسانەیە کە هیچن ، بەڵگەش ئەو بەیتە شیعرانەی خوارەوەن کە خۆی فەرمویەتی  :**

**دونیا بە کامی هیچ کەسانە هەمیشە دەم**
**هیچ ئەڵبەتە بە هیچ دەمێ نا بڕێ لە هیچ**

**دونیا کە هیچە , جوملە دەزانن , کەچی چ کەس**
**مەردانە بۆ خودا نیە دەس هەڵگرێ لە هیچ**

**تا سەر نەبۆتە گۆ ,دە لە دنیا دە تۆ شەقێ**
**هەر ئەم شەقە بەکارە کەوا هەڵدرێ لە ەیچ**

**یاخود :**

**ئەر لە دنیا چاکەیێ سادیڕ بوو،ەفرەی پێ نەخۆی**
**ڕوسپی هەر ڕوڕەشە،ەر بێ سەد ئازایی بکا**





**ئیشکردنی مەحوی بەو جۆرە لە نێو سیاقی دونیا دا ئەمە بۆ خۆی وێنا کردنی ئەو بەشە مێنتواڵیتیەی دونیایە کە بە شێکی زۆری ڕۆشنفکرانی دینی باسیان لێوە کردوە ، لە یەکێك لە وتارەکانی خۆیدا ، د.سروش دەباغ کوڕی بیرمەندی ئێرانی عەبدولکەریم سروش پێ ی وایە لە سەردەمی پێش مۆدێرنە دا ڕۆشنفکرە دینیەکان تێڕوانینی خۆیان بۆ دونیا هەبووە و ویستویانە دونیا ڕزگار بکەن لە دەست بەربەریەت و بە نا ڕاستەوخۆ ویستویان دونیا لە دەست مرۆڤ بستێننەوە و بیدەنەوە بە دەست خودا ، بەڵام ئەمە هەموو ڕۆشنبیرە دینیەکان ناگرێتەوە، واتا نەگشتگیر کردنی بابەتە نا گشتیگیریەکان و لە هەمان کات داجودا کردنەوەی نوخبە دینیەکان، بۆ نمونە دینی ناسنامە و دینی ئسولی و میانڕەو و توندڕە و ... هتد ، ئێمە لێرە باس لە یەك جۆر لە دین ئەکەین ، ئەویش دینی عاریفەکانە ،چونکێ دینی عاریفەکان جودایە لە دینی نێو کۆمەڵگا ، هەربۆیەش دەبینین مەنسور لە دار درا و مەولانا شەمسەدین تەبریزی کێشەی گەورەی بۆ دروست بوو، کە هەر ئەو کێشەیەش بوو بە هۆی ئەوەی بۆ هەتا هەتایە چاوی بە مەولانای ڕومی نەکەوێتەوە ، لەبەر ئەوە لە جەوهەر دا  عاریفەکان**

**ویّناکردنیان بۆ دونیا جیاوازە و مەحویش یەکێکە لەو عاریفانەی کە وێنەیەك بۆ دونیا دەکێشێت  کە بە تەواوی خاڵیە لە دڵخۆش بوون بە دونیا و ئەوەی تێیدایە و لە هەمان کات دا ئیشکردن بۆ دۆزینەوە و تێگەیشتن لە ماناکانی تری دونیا, لەمەوە شتێك کە ئەم پیاوە هیوای پێ خواستبێت یان دڵی پێ خۆش کردبێت و بۆ ماناکانی بگەڕێت ، گەڕانە بە دوای مانا ڕاستە قینەکانی ئەو دیو دونیا کە ئەویش بریتیە لە ژیانی نەمری و جاویدانی،  ئەو دیو دونیا واتا ئەو شوێنەی کە ئینسانەکان مەحکوم دەکات بە گەڕانەوە بۆ نێو ماهیەت و چیەتی و چۆنیەتی خۆیان، واتا گەڕانەوە بۆ تێگەیشتن لە ڕەهەندەکانی تری نێو وجوودی ڕاستەقینە :**

**بەڵکە لەو ڕێیەوە بەرمە عیمرانی بەقا**
**((مەحویا)) غەیری خەراباتی فەنا نیمە مەلاز**

**یاخود :**

**تێگەیو شیوەنیە ئەمڕۆ داسبەی شایی بکا**
**پێگەیو دەرویشە دا سبەی شەهەنشایی بکا**





**یەکێك لە دیاردە هەرە ناوازە و سەیرەکانی دونیای نێو تێکستەکانی مەولانا مەحوی بریتیە گەورە و فراوانەی کە تێیدا شتەکان دێنێتە گۆ، هەڵبەت ئەمەش خۆی لە خۆیدا ئینسیجام کردنە لە گەڵ کۆی ئیشکالیەتە مەعنەوی و مادیەکان ، کە دواجار ئیشکالیەتەکان خۆیان دەربارەی خۆیان قسە دەکەن ، بۆ نمونە کە باسی دونیا دەکات وەکو ئەوە وایە دونیا خۆی گێڕەرەوەی خۆی بێت، تا دونیا خۆی تەرجەمە دەکتە نێو واقیعی ئینسانەکانەوە و لە هەمان کات دا دونیا موفەسیرێکە خۆی تەفسیری نێو واقیعیەتی بوون یان نەبوونی ئینسانەکان دەکات ،ئێوە کە شیعرێکی جەنابیان دەخوێننەوە وا هەست دەکەن لە لە ڕۆژگاری دونیایەك سەرشارە لە تاوان، هەڵبەت دونیاش ڕۆژگارەکانی ئینسان دروست دەکات و ڕۆژگاریش ئیرتیباتێکی تەواوی بە دونیاوە هەیە، وێنا کردنی دونیا بە تاوان و گوناە ، ئەمە خۆی دەلالەت دەکات لە سەر هەبوونی تاوانی ئینسانەکان بەرامبەر بە یەکتری :**

**چیە ئەم هەموو تەتنتەنە و من منت**
**ئەمەندە چیە فەخر و بەخ کردنت**
**بە ڕۆچوونی ئاویٚ دەکی زیندەگی**
**بە دەرچوونی بایەك دەبیٚ مردنت**

**(مەحوی– چوارینە)**

**لەوانە تاوانی دەبڵ میزاجی و دەبڵ مۆڕاڵی کۆی ئینسانەکانی نێو کۆمەڵگا ، گوناهی ئەو مرۆڤانەی کە لە بەرامبەر خودا دەیکەن ، گوناهێك کە مێژویەکی هێجگار دوور و درێژی هەیە ، تا ئەو مێژووە ی دەگەڕێتەوە بۆ کوشتنی مرۆڤێك لە لایەن مرۆڤێکی ترەوە، لەمەوە ئەو دونیا بینیەی مەولانا مەحوی هەیەتی بە هەموو مانایەك شوێنگەیەکی تایبەتی لە دونیای ڕاسیۆنالیزەیشن دا هەیە، ەولانا مەحوی پیرێك لێوان لێو لە غەم خواردن بۆ شکستیەێنانی مرۆڤەکان بەرامبەر تێگەیشتن لە فاکتی دونیا،بۆیە زۆر حەکیمانە لە دوو بەیتی خۆیدا دەفەرموێت :**





**ز بعد مرگ بر سر خاك پاشی تا ابد زین غم**
**كه از رنج و غم دنیای دونت عمر شد بر باد**

**یاخود :**

**دنیا همه هیچ است ولی هیچ تر از وی**
**ماییم كه در باخته ایم این همه با هیچ**

**دونیا هەمیشە لە نێوان خۆشەویستی و ڕقی مرۆڤەکان بەرامبەر بە یەکتریدا لە خولانەوە و ئەمبەر و ئەو بەری بەردەوام دا بووە ، بە مانایەکی دی ژیان بە هەمیشەگی لە نێو پرۆسەی ئەم بەر کردن و ئەو بەر کردن دا بووە لە نێوان ستایش و هیجای مرۆڤەکان دا ، مەحوی گەورەش یەکێك بوە لەو جۆرە عاریفانەی کە تراژیدیایەکی بەربەرەڵاو فراوانی بەرامبەر بە ژیان و دونیا لە نێو تێکست شیعریەکانیدا هەست پیٚ دەکرێت، بەڕێزیان بە بەردەوامی گلەیی و گازاندەی هەبووە بەرامبەر دونیا و (ئەوەی تێشیدایە)، یحنەت و ئاهو فوغانێکی زۆری هەیە لە دەست ڕۆژگارەکانی دونیا و بە ئاشکرا دەیەوێت پێمان بڵێت دونیا هیچە و ئێمەش لە خۆڕایی شوێنی ئەو هیچە کەوتوین ، وە**

یەکێك لە خاڵە هەرە گرنگترینەکانی نێو دونیای تێکستەکانی , ئەویش دیاردە یارو ئاشکراکانی شیعری ئەو دەرخستنی ڕۆحی شاعیرێکی عاریف و خودا ناسە ، وشەی (مەحوی)ش خۆی لە خۆیدا هێما و سیمبول بوە بۆ هەبوونی ئەو ڕۆحیەتی عاریف بوونەی ، ئەم نازناوە هێما بووە بۆ پشت کردن لە دونیا و ڕوو کردن لە خودا ،وە ئیشکردنی مەولانا مەحوی لە پرۆسەی پشت کردن لە دونیا و ڕوو کردن خودا ئەزموونێکی دوور و درێژی جەنابیان بووە و ئەو ەەمیش لەسەر دانانی جلی دونیا ئیشی کردوە و لەسەر لەبەر کردنی جلێکی دی ئیشی کردوە کە بە هیچ شێوەیەك پەیوەندی بە جلی دونیاییەوە نیە و هەمیشەیش دژایەتی دونیای کردوە و پێ ی وابووە کە دونیا ئەو شوێنەیە کە ئیدی ئینسانەکان پێویستە بە زوترین کات لە فێڵەکانی ئاگە دار و هۆشیار بێت و ئەویش بە نموونەی غەزەلێکی ناسك و پڕ مانای کە لێوان لێوە لە مانا و عیبارە بەرامبەر بە ڕەشبینی لە هەمبەر ژیان و دەڵێت :

نەڵی مەردم کە دنیا پشتی لەو ئەو ڕوو لە دنیا بێ
کە پوری زاڵە ، بۆچی پیرە زاڵی پێ ڕەزا نابێ





لە دەروێش و لە شا ئەم فاحیشە ئاخر دەکا حاشا
گەر ئەهلی غیرەتی ، بەر لەو لە خۆیی و ئەهلی حاشا بێ

ئەگەر تاجت لەسەر کا، سەرتی پێوە قوت دەدا ئاخر
موبارەك کەی دەبێ ، ئەو خەلعەتەی خەلعی لە دوا بێ

سبەی،خاکت بەسەر،وەك من دەبێ (تحت السری)بێ جێت
بڵا ئەمڕۆ کە خەوتیت ، مەسنەدت تەختی سورەییا بێ

لەبەر هەر دادەنرێ جل ، چ پیناوی ، چ چیناوی
دەبیتە لوقمە ، لوقمە ، پاقلە یا پاقلاوا بێ

برا فیکری چرا ، کیبریتی فرصەت تا لە دەستایە
شەوی یەڵدا لە پێشە ، ڕۆژی عومرت وەختە ئاوا بێ

بکەین ئاە و فوغان و ئاگرێ بەردەینە خان و مان
خەراباتی مەحەببەت ، حەیفە بێ ئاشوب و غەوغا بێ

لەگەڵ فەریاد و گریە ، حازرە فەریاد ڕەس ((مەحوی))
(لیبکوا) ڕێ دەدا پیری تەریقەت تیفلی ساوا بێ

وە هەروەها ئیشکردن لەسەر تەواو کردنی ئەم پرۆسەیەی جەنابیان بە کۆنکرێتی  ئەپلیکەیت کراوە و شیعرەکانیشی باشترین بەڵگەی زیندوون بۆ پشت ڕاستکردنەوە و سەلماندنی هەبوونی ئەو ڕاستیە ، لەمەوە ئەم عاریفە مۆدێلێکی دی بۆ دونیا داونلۆد ئەکات ،ئەویش داونلۆدکردنی تێگەیشتن لە دونیایەکی جیاوازتر لەم دونیلیەی کە ئێستا هەیە و دواتر جێگیر کردن و تەسبیت کردنی لەسەر ژیانی مرۆڤەکان،وە لە ڕێگەی داونلۆدکردنی ئەو دونیا ڕاستەقینەیەوە مرۆڤی ڕاستەقینە بەرەەم ئەهێنێت،چونکیٚ ڕاستەقینە لە گەڵ نا ڕاست دا یەك ناگرنەوە، هەربۆیە هەمیشە ئەم پیاوە ڕەش بین بووە بەرامبەر بە مرۆڤەکانیش ، ئەی ئەوەتا لەم بەیتە دا دەفەرموێت :

ئەوەندە پڕ فیتنە بوو عالەم کە ئیبلیسێکی وەکو ئیبلیس
نەماوە مەئمەنی غەیری کلێشە و کەڵکەڵەی مەخلوق





واتا دروست کردنی دونیایەك جگە لە بەرهەم هێنانی ئینسانی ڕاستەقینە ،بەرهەمهێنەری جۆرێکی تر لە مرۆڤ نەبێت،وە لە فۆرمێکی ئۆتۆماتیکی دا ئینسانە تەزویرەکانیش بخرێنە پشت ئەو دونیا تازە ڕاستەقینەیەوە، وە وێناکردن و دروستکردنی ئەم  دونیایە یە لەلای مەحوی جۆرێك لە دڵە ڕاوکیٚ ی خستۆتە نێو دڵی خوێنەرەکانیەوە ، لەبەر ئەوەی پەنا بردنە بەر ئەو دونیا ڕاستەقینەیە وا لەم پیاوە گەورەیە ئەکات کە شیعرەکانی گەورەترین پلەی مەعریفی شیعریان هەیە لە تێڕامان لە گەردوون و دواتر وەکو بابەتی جوزئیات تێڕامان لە دونیاش .

### سۆفی بوونی مەولانا مەحوی :

گومان لەوە دا نیە کە مەولانا مەحوی عاریفێکی تەواو بووە،ەویش بە پیٚ ی ئەو دونیا بینیەی کە هەیبووە و لە پێشتر باسمان کرد، بەڵام ئەوەی لێرە دا گرنگە لە سەری بوەستم ئەوەیە کە دەبێت بڵێم هەموو سۆفیەك عاریف نیە ،

هەڵبەت وەکو چۆن هەموو عاریفێك سۆفی نیە ،وە لەسەر ئەوەی کە ئایا مەولانا مەحوی سۆفی بووە یان نا ، دوو تێڕوانین و باوەڕ هەیە لەسەر سۆفی بوون یان نەبوونی مەولانا مەحوی، بڕوای یەکەم یان تیۆری یەکەم لەو ڕووەوەیە کە کە مەولانا مەحوی سۆفی نە بووە ، ئەویش بە پشت بەستن بە چەند بەیتە شیعرێکی جەنابیان کە سەر زەنشتی سۆفیەکانی کردوە و کە دەفەرموێت :

ڕیشێکی پان و توکی بناگوێ درێژ و لول
سۆفی لە دینی لادە بە دیمەن لە جو دەکا

یاخود :

زاهید و سۆفی بە شەڕ هاتن لە سەر تەزویر و شەید
خێری ڕەندانە خودا کا بەر تەڕەف بێ هەر تەڕەف

لەم بەیتە شیعرەی دواییان دا مەولانا مەحوی بە ئاشکرا دابەزیوەتە سەر زاهید و سۆفی ، هەڵبەت بە تەزویرچی چی و





فێڵباز ناویانی هێناوە، کە ئەو پێی وایە ئەو جۆرە زاهید و سۆفیان ئەهلی دونیان و دونیا پەرستن ،واتا بە بڕوای مەولانا مەحوی ئەوان هیچ پەرستن، واتا هیچ نا پەرستن جگە لە هیچی !

ئەو تا ڕادەیەك سەرزەنشتیان دەکات، دەیان کات بە ساختەکار و تەڵەکە باز ، کە پێ ی وایە ( زاهید و سۆفی کەوتنە ململانێوە لە گەڵ یەکتر ، لە سەر چی ؟ لەسەر تەزویر و فێڵبازی ، خودا بکات لەم شەڕەیان دا هەردوکیان تیا بچن و ئێمەش ڕزگارمان بێت لە دەست هەردوو لایان )، بڕوای دووهەم پێ ی وایە لە جەوهەر دا ئەم تێکستانەی کە مەولانا مەحوی دژی سۆفی و زاهیدەکان نوسیویەتی، تەنها بۆ گروپێك و ئێتنیەك نوسویەتی، کە دینیان بەکار هێناوە بۆ گەیشتن بە حەز و ئارەزوەکانیان ،ئەوەتا لەم دوو نیوە بەیتەی خۆیدا دەفەرموێت :

لا لغاوەی واعیز ئەمڕۆ مەوج ئەدا دەم پڕ لە کەف
ڕیشی قیرو سیاه ، کتێبی وەعزەکەی بوو بەر تەرەف

واتا:ئەو کەسانە دەیانەوێت تەنەها ماهیەتی دین بشێوێنن و لە ڕێگای هەڵگرتنی ئەم ناوە وە تەڵەکەبازی بکەن و خەڵکی

پێ هەڵبخەڵەتێنن،وە ئەو تیۆرەی دووهەمیان لەسەر مەولانا مەحوی ڕاستر و دروست ترە کە پێ ی وایە مەولانا مەحوی سۆفیەکی تەواو بووە ، ئەویش بە پشت بەستن بەوەی کە مەحوی گەورە هەموو مەقاماتی تەسەوف بڕیوە لە مەقامەکانی (توبە , الورع , الزهد , الفقر , الصبر , الرجا , التوکل )،بەڵام هەندێك سەرچاوەی تر هەن جگە لەمانە ، ئەمانەش دەخەنە خانەی مەقامەکانەوە ،((الانابە,القناعە,الشکر,التسلیم,المحاسبە,الخوف و الرجا , الصدق ,المراقبە, الاحسان,القرب,الاخلاص,الفنا و,البقا و,التوحید,التجرید,التفرید,التنزیە,العبودیە)),حاڵێش بە گوێرەی جیاوازی سەرچاوەکان ژمارەیان چۆن یەك نیە و هەندێ بە دە زاراوە لە قەڵەمیانداوە،((المراقبە,القرب,المحبە,الخوف,الرجا و,الشوق ,الانس,التمأنینە,المشاهدە,الیقین)),جۆرە تێکەڵاویەك هەیە لە نێوان حاڵ و مەقامەکان دا ، ئەویش لە بابەتەکانی(المراقبە,القرب,الرجا,الخوف))، ئەمە زۆر گرنگ نیە ، بەڵامەکێ وەکو بەرچاو ڕونیەك بۆ ئەوەی لەو ئیشکالیەتە تێبگەین کە هەیە لەسەر ئەوەی کە گوایە مەولانا مەحوی سۆفی نەبووە ، ئێستاش دێینە سەر ئەو حاڵ و





مەقامانەی کە لە شیعری مەحوی گەورە دا بوونیان بە شێوەیەکی ئاشکرا و ڕوون هەبووە .

بۆ نموونە :

(الرجا ) :

بەهانە مەگرە لەو جامانە جامێ
کەرەم کە،ساقیا،بگرە ڕەجامان

(الانس) :

کە وەقتێ ئال و یارانی لە خدمەتیا دەبن وەك ڕۆح
حەیاتە ، نوری چاوە ، ئونسی جانە،مەحزی ئیحسانە

(المحبە):

لەسەر خۆ چونە ، شەیدا بوونە ، قوڕپێوانە سوتانە
هەتا مردن مەحەببەت ئێشی زۆرە ڕێزی لێ دەگرم

**سۆز(جزب) :**

**وەك كارەبا لە كا كەششی جەزبی حوسنی تۆ**
**سەبری بە دزییەوە لە لمی نا توان دزی**

**مەقامەكان (التوبە) :**

**لە ناوا باسی تۆبەی تۆ بوو ئەی ستەمگەر شۆخ**
**بخە ئەم تۆبە پاشی كوشتنی من تۆ بیوو پیرت**

**(وەرع) :**

**وەرعی فاروقی تەماشاكەن ،وتی : ناكا قوبوولْ**
**غیرەتم ژاكاوی ئەو گوڵباغە ، بۆ باغی فەدەك**

**(زوهد) :**





**لەگەڵ ئەم ئیحتیشامە زوهدی دنیایی تەماشاكە**
**كە یەك لەت نانی جۆ بوو قووتی، یا خورما دوسیْ دانە**

**ئەمەم تەنها بۆ ئەوە نوسی وەكو پشت ڕاستكردنەوەیەك بۆ بۆچوونی دووهەم كە بەڵێ مەولانا مەحوی سۆفیش بووە ، ئەی ئەوە نیە دەڵێت :**

**تێگەیوو شیوەنیە ئەمڕۆ دا سبەی شایی بكا**
**پێگەیوو( دەروێشە) دا سبحەی شەهەنشایی بكا**

**وە هەروەها دەتوانم بڵێم چەندین بەیتە شیعری تر هەن كە سەلماندنی سۆفی بوونی مەحوی دەخەنە ڕوو ، ئەویش لە بابەتەكانی : (الفقر،الصبر،التوكل،الرچا،الشكر،ئیحسان،نیستی،البقا و،التوحید،الاخلاص،الصدق .... هتد).بەڵام هەر ئەوەندە نموونەیە بەسن بۆ كەسێكی راسیۆنالیزم كە لەو ماتەرە گشتگیریە تێبگات .**
**هەڵبەت دونیا بینی پەیوەندی و پەیوەستیەكی زۆری هەیە بە دونیا ژیان و دونیایی بوون یا نەبوونەوە ، كاتێك كە**

**دەڵێین مەولانا مەحوی سۆفی بووە ئەمە بۆ خۆی پاڵپشتیەکە بۆ ئەو ڕەشبینیەی کە ئەم پیاوە عاریفە هەیبوە بەرامبەر بە دونیا ، ئەگەر لە نێو کوردیش دا شاعیر و فەیلەسوفێك هەبێت بەو جۆرە ڕەشبین بێت حاڵەتێکی ئاساییە ، چونکێ فەیلەسوفەکانیش بەشێك لە ڕەشبینیان تێدا هەبووە ، بۆ نموونە نیچە و شۆپنهاوەر و زۆرێکی تریش لەو فەیلەسوفانە ڕەشبین بوون بەرامبەر بە دونیاو سیستەم ، لەبەر ئەوە دەتوانین خوێندنەوەی دونیا لە دیدگای سۆفیەکەوە بە کۆنکرێتی جیا بکەینەوە لە کەسێك کە سۆفی نیە، واتا مەولانا مەحوی جیاواز لە کەسانی تر دونیای ناسیوە، ئەمیش یەکەم بە پێوەری ئەوەی کە عاریف بووە ، دووهەم بە پێوەری ئەوەی کە فەیلەسوف بوو، سێ هەم پێوەریش بە هۆی ئەوەی کە ئەهلی تەسەوف بووە و یان (سۆفی) بووە ، حاڵەتی ئەوەی کە ئایا سۆفیەکان و عاریفەکان و فەیلەسوفەکان چەند لەیەك دەچن یاخود چەندە جیاوازن ئەمە مەسەلەیەکی ترە کە دەکەوێتە چوارچێوە ئەنترۆپۆلۆژیا و حاڵەتی ڕاسۆنالیزەشن، واتا پێوەرە هۆشیاریەکان و هۆشمەندی کەسەکان،کە ڕەنگە فەیلەسۆفێك لەوی تر جیاوازە و یلەسوفێکی تر هەبێت لێکچونی لەوی تر زیاتر بێت وەك لە جیاوازی، دەگەڕێمەوە بۆ سەر ئەو خاڵەی**





**کە مەر ج نیە خوێندنەوەکانمان تەنها لەسەر ئاستی فۆرم دا ورد بکەینەوە، چونکێ ئەوەی گرنگە بۆ ئێمە ئەوەیە کە تێبگەین کەسێك پڕۆژەی فەلسەفی هەبووە لە ڕێگەی وروژاندنی پرسیارگەلێگی فەلسەفی گەردونیەوە ، وە کەسێك بناسین کە عاریف لە ڕێگەی خوێندنەوە عیرفانیەکانی بۆ بابەتە گشتگیر و نا گشتگیر گەراکان، وە کەسێك واقیعەن سۆفی بووە بیناسینەوە بە تێکست و هەڵس و کەوت و ئاکارەکانی و دواتر چۆنیەتی ژیانی و تێگەیشتن لە دۆخی ئاکام بەندی و نا ئاکام بەندی ئەو کەسە ، حەقیقەتی مرۆڤەکان لە چرکەساتە تەماوی و نا تەماویەکان دا هەر دەردەکەون ، گرنگە بزانین کە مەحوی گەورە هەرچەندە شیعری هەیە، بەڵام زیاتر فەیلەسوفێك بووە وەك لە شاعیر ، واتا وەزیفەی ئەم پیاوە پێش شاعیر بوونی فەیلەسوف بوون وعاریف بوونیەتی ، بەڵام لە هەمان کات دا سێ پەیامی گرنگی گەیاندە نێو سێ مەکانی جیاواز، ئەویش یەکەم شوێنی ئەدەب، دووهەم شوێنی عیرفان، سێهەم شوێنی فەلسەفە، وە دوونیا بینی مەولانا زیاتر هەر لەم سێ پاکێجەدا بە ڕوونی دەردەکەوێت کە چۆن دونیای لە عەقڵی خۆیدا فۆرمەلە کردوە و دواجار لە ڕێگای شیعرەوە کە وەکو میتۆدێك ئەم ڕێگایەی هەڵبژاردووە تیۆرەی خۆی خستۆتە**

گەڕ بۆ گەیاندن و ئاڕاستەکردن و دیسپلین کردنەوەی دونیا
بۆ ڕۆژگاری خۆی ، واتا تەفسیر کردنەوەی دونیا لە
واقیعێکی گونجاوتر دا ، کە لە ڕاستیدا واقیعی تاڵ و
مێنتواڵ وا لە بەشێك لە ئینسانەکان ئەکات ئیدی
دەستبەردار و وازبەێنن لەو واقیعە لە پاش خوێندنەوە بۆی
و دواتر سەرقاڵ بن بە دروستکردنی واقیعێکی ترەوە کە
تەواو جیاواز بێت لەو واقیعەی پێشو ، بۆ نموونە کە باس
لە (خەڵوەت) دەکەین دەبێت ئەوەمان لە پێش چاو بێت مرۆڤ
بۆ دەچێتە خەڵوەتەوە ؟ یان باشتر بڵێم عاریفەکان و بەشێك
لە شاعیرەکان بۆ دەچوونە خەڵوەتەوە ؟ پێموایە خەڵوەت
ئەوشوێنەیە کە دواجار وێنایەکی تر مرۆڤ دەبەخشێت و
جۆرێکی تر مرۆڤ تەفسیر دەکاتەوە، مرۆڤ کە دەچێتە
خەڵوەتەوە هەست بە ئاسودەییەك دەکات کە ئەو ئاسودەییە
لە نێو واقیع دا وجوودی نیە ، هەربۆیە پیاوە عاریفەکان و
فەیلەسوفەکان تەنیاییان پێ باشتر بووە لە قەرەباڵغی نێو
خەڵك و ئاسوودەگیان لە تەنیاییەوە سەرچاوە پێ گرتووە و
نا ئاسودەگیشیان لە نێو خەڵك دا سەرچاوە پێوەگرتوە،لە
کۆتاییدا دەمەوێت ئەوە بخەمە پێش چاوی خوێنەر کە
مەحوی گەورە سەرتاپا قەولی لە قالب دانی دونیای داوە بۆ
نێو سیاقێکی ڕەشبینانەو،وە ڕەشبینیەکەشی ڕەشبینیەکی





ئەزەلی بووە،واتا بەهۆی خراپی دام و دەزگاو گروپ و
ئیتینەکانەوە ڕەشبین نەبووە ، ڕەشبین بووە لەبەر ئەوەی
دونیا هیچە ، هیچ لەبەر ئەوەی دروست کرا و ەیچ لەبەر
ئەوەی وێران ئەبێت . لە ڕاستیدا کە ئەفەرموێت :

**دونیا هیچ است ولی هیچ تر از وی مایم**

مەبەستی لەوە نیە کە ئینسان هیچە ، نەخێر مەبەستی
لەوەیە کە دونیا هیچە،هەرکاتێکیش ئینسان خۆی
بەستایەوە بە هیچ ، ئەویش ئەبێت بە بەشێك لەو هیچە،
بەڵام ئەگەر بڕیار وابێت دونیا خۆی بە ستاوەتەوە بە
ئینسان ئەوکاتە،ئینسان بەشێك نیە لە هیچ واتا دونیا،ئەو
کاتە هیچ بەشێکە بە ئینسان،واتا دونیا،مەبەستم لەوەیە کە
لە بەشی دووهەمی قسەکانم دا مرۆڤ سەرتاپا هیچ
نیە،بەشێك لە مرۆڤ هیچە ئەویش بریتیە لە دونیا .
ئەنجا با بگەڕێینەوە بۆ تیۆری ئیعتیباری لە دونیاناسیدا کە
ئەم تیۆرەش بە تەواوی و کۆنکرێتی ،کۆنێکتی مەعنەوی و
فەلسەفی هەیە لەگەڵ کۆی تێکستە عیرفانیەکانی مەحوی دا ،
چونکە مەحوی بەڕاستی دەیەوێت ئیتر دینداریێکی خاوەن
ئیعتیبار و کەسێکی موعتەبەر بێت و وجوودی هەبێت لە

شوێنی ئایندا و بتوانێت ئەویش قسەی خۆی هەبێت لە بابەتی هەقانیەت و زانستی دونیاناسی (پراگماتیسم) ، وە لەسەرەتای هەر تێکستێکی ئەم عاریفەوە هەست بەوە دەکرێت کە ئەم کەسە تێڕوانینێکی جیاوازتری هەیە لەوانی تری پێش خۆی و هاوتەمەنەکانی ، کە پێ ی وابووە پوچی بنەڕەتی دونیاو کۆی ژیانە ،سەیرکەن دەبێت بڕوا بەوە بەێنین کە بێ هۆ نیە کەسێکی ئاوا پەیدبووە و گەشەیکردوە لەو بوارە دا کە دونیا ناسی یە، شوناس و حەقیقەتی دونیا ناسی جیاوازی بنەڕەتی هەیە و لە مێژوویشەوە ئەم جیاوازیە درێژ بۆتەوە بۆ ئێستامان ، کاتێک کەسێك دێت و داوایەکی لەسەر کاغەزدا بەناوی وتار یان لێکۆڵینەوە دەربارەی حەقیقەتی دونیا پێشکەش دەکات ، کارێکی باشی کردوە ، لێ ئەمە بڕوای ئەوە نەك حەقیقەت خۆی وا بخوازێت کە ئەم شتە بوترێت و ئەمە بەشێکە لە حەقیقەت ، واتا وتنی حەقیقەت تەواوکەری حەقیقەت خۆی بێت ، نا بە پێچەوانەوە ئەمە هەڵەیە و هەڵەیەکی ئاشکرا و ڕونیشە لە مەڕ حەقیقەت ی دونیا ، چونکە دواجار هەر بەشە و خۆی یو بۆ خۆی بڕیار لەسەر حەقیقەت بوونی شتەکان دەدات ، بە بڕوای من حەقیقەت تا ئەو ئاستەیە کە لە شکۆمەندی حەقیقەت دانەگرێت ، واتا ئەوەی کە دەڵێت ئەمەیە ژیان !





یان ئەمەیە حەقیقەتی ژیان دەکرێت ، ئەمە بۆ خۆی هەڵەیەکی گەورە بێت لەو نێوەندە دا کە نێوی حەقیقەتە لە ژیان و حەقیقەتە لە دونیا ، کەرامەت و حەقارەت دوو شتن کە نابێت بە بێ هیچ پێوەرێکی ئەخلاقیانە بۆ هەر شتێك کە هەیە بەکار بەێنرێت ، چونکی ئەوە پێوەرە مۆرالیەکانن کە سنور بۆ دەستەواژەکان دادەنێن لە مەڕ شتەکان ، ئاخر دوایی دەبێت ڕوومان زەرد بێت لە ئاست مانا بەخشینی هەڵە بە شتەکان و وەکو وەفایی دەڵێت :

خۆشا ڕۆژێ لە عالەم دەر بە دەر بم
لە نێو ئەوزاعی دونیا بێ خەبەر بم

لە بەر ، بێ تاقەتی دێوانە ئاسا
لە غەوواسانی دەریا بێ خەتەر بم

شەو و ڕۆژێ لە چۆڵی هەر بە ناڵە
حەریفی شەو ڕەوی بدی سەحەربم

نەزانێ هیچ کەس ناو و نیشانم
ئەگەر عاقڵ ئەگەر ئاشفتە سەر بم

**له هەر لا با بسوڕێنێ غوبارم**
**لەهەر جێگایێ پێویستە سوپەر بم**

**چرا بێ هەڵکرێ ، جانا له نێو دڵ**
**له ڕوناکی ، دڵی یارم ، خەبەر بم**

**لەبەر چاوی تەڕم ، سۆرانی بڕزێ**
**گەهێ بێ دایك و گاهێ بێ پدەربم**

**خودا خۆم چۆن بسوتێنم به جارێ**
**له دەرد و داخی ئەحواڵم به دەر بم**

**شەوێ هەر تاکو ڕۆژێ هەر بناڵم**
**به گریان دەست و دامانی سەحەر بم**

**چ ڕێگەی چارە نابینم ((وەفایی))**
**مەگەر سەر تا قەدەم غەرقی نەزەر بم**





**کێشەی بوون له فۆرمی دونیا دا :**

**بەڵام ئیدی لێرەوە کێشەیەکی دیش سەر هەڵدەدات ، ئەویش کێشەی بوون خۆیەتی،واتا نەك کێشەی دونیا ، بەڵکو کێشەی تەفسیر نەکرنەوەی بوون له فۆرمی دونیادا ، چونکه بەڕاستی ئەوە هەر کێشە نیە بەتەنها کە له سەرەوە به نموونەوە باسمان لێوە کرد ، له ڕاستیدا و له جەوهەر دا کێشەی سەرەکی پەیوەندیەکانی دونیا و عاریفان زیاتر هۆکارەکەی بوونە ، واتا وجوودیەت existence، لەمەوە ئەگەر بکرێت کەمێك چاو بە وردە کاریەکانی ئەم کێشەیە دا بخشێنینەوە و تێبڕوانین کە ، چ باسە،بەڵام ڕاستیەکەی من پێم باشە له سیاقێکی تایبەت دا باسی ئەم کێشەیە بکەین و لێکدانەوەی بەشێکی شیعرەکانی مەحویشی لەسەر بکەین ، چونکە بەڕاستی بە تێکەڵاوی لێکدانەوە و ڕاڤەکردنی شیعرەکانی مەحوی و دۆزینەوەی ئەو ڕەهەندو لایەنە شاراوانەی تیایدان، کارێکی ئاسان نیە ، چونکە ئەو مەبەست و گوتراوانەی تیایدا پەنهانن ، بە ئاسانی**

خۆیان نادەن بە دەستەوە، ئەمەش خوێنەر توشی لێتێکچون و ئاڵۆزی دەکات و وا هەست دەکات ئەو تێکستانە زۆر نەهیلیزمن و هیچ واتایەکی گرنگ نادەن بە دەستەوە و زۆر ئاڵۆزن، بۆ دەرباز بوون لەم دۆخە و کردنەوەی دەرگایەك بە ڕوی تێکستەکانی مەحوی دا،بۆ ئەوە بتوانین لە جیەانی تێکستەکانی دا قوڵ ببینەوە ، ئێمە لێرە پێویستە کۆمەڵێك بۆچوونی فەلسەفی بەکار بەێنین ، تا لە ڕێگەیانەوە بتوانین زۆرترینی ئەو شیعرانە تێبگەین کە لەم باس و خواسانە دا هەن و گرنگی خۆیشیان هەیە ، ئێمە ئەگەر هاتبین و قسەمان لەسەر ئەوە کردبێت کە مەحوی لە قۆناغێك لە قۆناغەکانی تەمەنیدا ئەگەر سۆفی بوبێت ، ئەوا ئیدی ئەم قۆناغەشی تێپەڕاندوە و بەرەو ناوەوەی خۆی گەڕاوەتەوە و لە ڕێگەی دونیاوە تەفسیری بوون دەکات و بەمەسەلەی بوونی خۆیەوە سەرقاڵ بووە ،وە بۆ ئەوەی لە مەسەلەی بوون تێبگەین لە لای مەحوی ، ئەوا دەبێت بگەڕێینەوە بۆ کۆمەڵێك فەیلەسوف و دواتر لە نێو ئەو فەیلەسوفانە دا بگەڕێینەوە بۆ فەیلەسوفە بوونگەراکان، نموونەش وەکو هایدگەر و شتراوس و چەندانی تر ، هەڵبەت دەبێت زیاتر گرنکە ئەوە بزانین بەشێوەیەکی گشتی بیرکردنەوەمان بەو شتانە ئاشنا بێت کە زیاتر بەرجەستەن،واتا شتانێکی دیار و کۆنکرێتی و دیارن و ئاسان پێیان ئاشنا دەبین و لێیان تێدەگەین،هەڵبەت ئەگەر بێت و





بمانەوێت بە شێوەیەکی گشتی لە بوون تێبگەین ،واتا بوون خۆی چیە،هەڵبەت ئێمە بە شتگەل و قسەگەلێك ڕاهاتوینە کە ئەوە دیوارە و ئەوە دارێکە و و ئەوە کەسێکە، واتا دەزانین وەك شتانێکی بەرجەستە ئەوانە هەن، بەڵام لامان قورسە کە بیر لە بوونی دیوارەکە، دارەکە،کەسەکە بکەینەوە ، یان هەر بوونێکی پەتی ئەگەر بمانەوێت بیری لێبکەینەوە ئەوا لە لامان قورسە و ئاسان نیە بۆمان ، یان بیر لە بوونی گشتی بکەینەوە کە بوون بریتە لە چی؟واتاکاتی بوون و بیرکردنەوە لە ئاستیان بۆخۆی قورسە ، بە بڕوای هایدگەر : بوون ناوێکی هاوبەشە،لە نێوان هەموو شتەکان دا و وە هەروەها خودی ئەو بگۆ و پرسیار کەرەش دەگرێتەوە کە لە بارەی واتای بوونەوە پرسیار دەکات ،جگە لەمە مەوجوودی ئینسانی کە کێشەیەکی بنەڕەتی لەگەڵ وجوود خۆیدا هەیە ، کە لەهەندێك فەیلەسوفان کێشەی وجوود هەیە و لەلای هەندێکی تریان نەخێر کێشەیەك نیە ناوی کێشەی وجوود بێت بە ڵکوو ئەگەر کێشەیەك هەبێت کێشەی ((مەجوود)) ە، واتا هەبوونی کێشەیەك کە ئەوەی کە هەیە ، نەك ئەوەی کە دەبێت ببێت ، وە لەناو هەموو وجوود و مەوجوودەکانیشدا ، بەتەنها مرۆڤ بە مانا ڕاستەقینەکەی ئەم وشەیە بوونی هەیە ، واتا تەنها مرۆڤ کۆمەڵێك ئیمکان لە ناویدا هەن و بەدییان دەهێنێت و لە بوونەوەرەکانی دی و ەهموو ئەو سروشت و دەور و بەرەی تیایدا دەژی جیاوازە ، وە

هەموو ئەو شتانەی دەورو بەری مرۆڤ بە گیان دار و بێ گیانەوە ، بەو جۆرەی کە مرۆڤ بوونی هەیە ، ئەوان نیانە ، ئەگەر بگەڕێینەوە بۆ تێزەکەی سورین کیرکەگۆرد ، دەبێت بڵێین (بەرد هەیە ، بەڵام بوونی نیە ، دار هەیە بەڵام بوونی نیە ، ئەسپ هەیە بەڵام بوونی نیە ، سێگۆشە و چوارگۆشە هەن ، بەڵام بوونیان نیە ) ، لێرەوە ئەوەی کە هەیە و بوونیشی هەیە ، ئەوە مرۆڤە ، لە ڕاستیدا کە دەڵێین ئەو شتانەی تر جگە لە مرۆڤ بوونیان نیە ، مەبەستمان لەوە نیە کە بە ڕەهایی بوونیان نیە ، بەڵکو مەبەستی ئێمە لێرە ئەوە کە ئەو شتانەی کە هەن ، بوونیان وەکو مرۆڤ نیە،واتا پرسیارە زۆرە کە لەسەر مرۆڤە وەك لەسەرە ئەو شتانە ، ڕاستە ئەوانیش هەن ، بەڵام ئەوەی کە مانایەکی قوڵتری لە خۆسدا بەرجەستە کردوە مرۆڤە،مرۆڤ بە مانایەکی قوڵتر و ورد تر لەوان هەیە ، چونکە مرۆڤ دواجار ئەو مەوجوودەیە کە دەوتوانێت بچێتە ناوەوەی خۆیی و تواناى هەیە ناوەوەی خۆی گەشە پێ بدات ، تەنانەت مرۆڤ ئەو توانایەی هەیە کە دەتوانێت لەگەڵ مەوجوودەکانی تردا پەیوەندی ببەستێت و ئاشنایان بێت ، ئێمەش پێمان وایە کە مەوجوودەکانی جگە لە مرۆڤ هەن ، بەڵام ئەوان خاوەنی ئەو ئەو توانا عیقڵی و زیهنیە نین کە بتوانن لەگەڵ خۆیان دا بکەونە پەیوەندیەوە و دەرك بە بوونی خۆیان بکەن ، ئەمە ئەو کێشەیە یە کە لە مێژە تەنانەت سەری هەڵداوە لە نێو دونیای





زانستی فەلسەفە دا، ئەو دونیایەی کە هەندێ جار بەشێك لە مرۆڤەکانیش بە نەبوو ئەژمار دەکات کە لە ڕاستیدا من پێم وایە مرۆڤ نەك هەر مەجوودێکە ، بەڵکو هەست بە بوونی خۆی دەکات و بە هۆشیارییەوە دەزانێ کێ یە و چی یە ؟ کێ دەبێت و چی دەبێت و لە هەر چرکە ساتێك دا بێت دەبێت ئەو حاڵەتە تێپەڕێنێت کە تیایەتی، هەر وەکو وتمان ئێمە کە ئەو پەیوەندیە چەقبەستووە جێگیرەی نێوان بوون و دونیا دەخەینە ڕوو .

مەحوی لەم ڕووەوە جوان پێمان دەڵێت سەبارەت بە بوون و ئەو کێشەی کە نێوی کێشەی دونیایە بە بە تەواوی لەسەر بوونی ساختە ئەپلیکەیتی دەکات و بە بڕوای من لەم غەزەلە دا بە نا ڕاستەوخۆ پێمان دەڵێت کە پێویستە ئیدی مرۆڤ بوونی ڕاستەقینە بێت و بە بێ درۆ بژیت و لە فێڵەکانی بوونی ساختە تێبگات :

لە سایەی دەوری چەرخی سوفلە پەروەر لەك بە لەك دەدوێ

سەگی ئاواتە خوازی ئێسکی وشتر لە شەك دەدوێ

**دەبینم شێری شێر ئەفگەن ، دەڵەك مەوڵی دەكا ، دەبیەم**
**بە كۆڵی كلكەوە ڕێوی ، لەگەڵ كەوڵی دەڵەك دەدوێ**

**دەبنی بایەزیدە ، وەك یەزیدێكی دەبینن خەڵق**
**بە بێ پەردە شەیاتینی ، لە ئەحواڵی مەلەك دەدوێ**

**نە ناوی ڕۆژ و مەه بردن ، نە باسی صەدر و شەه كردن**
**مووەحید هەر دەبێ هەر یەك بناسێ ، هەر لە یەك دەدوێ**

**مونەججیم عومری زاییع بوو لە بەحس و فیكری ئەفلاكا**
**كە پیرێژن هەمیشە ەەر لە ئەحواڵی خەرەك دەدوێ**

**بە تاقە فەخری كیسرا ، هەر خەوەرنەق فەخری نوعمانە**
**دەنی هیممەت وەهایە هەر لەگەڵ كوچك و كەڵەك دەدوێ**

**زەمانەی سوفلە پەروەر وا ڕەواجی سوفلەیی داوە**
**كە دائیم ئەو دەمە سوێرە لەگەڵ نان و نمەك دەدوێ**

**پەكی تێدا ڕەقیب ئەو شۆخە كوشتنمی كە لێ ی پرسی**
**ئیرادەی كاری خێر ئەڵبەتتە شەیتانی لە فەلەك دەدوێ**





**مومەییز چەرخی كەچ ڕەو بێ، نەكەی(مەحوی)كەماڵت خەرج**
**زوبانی تێغی ئەو دەرحەق بە حەرفێ من لە حەك دەدوێ**

**هەڵبەت لە ڕووانگەی فەلسەفەی بوونگەرایی و تێكستەكانی مەحویە باس لەم پەیوەندیە دەكەین كە ئێستا تا ئاستێك بووەتە كێشە ، فەلسەفەی بوونگەراییش لە مرۆۋ خۆیەوە دەست پێ دەكات وەكو مەجوودێك كە خاوەنی كردەوە و هەست و ویژدانە ، نەك تەنها وەك بیركەرەوەیەك ، ئەمجۆرە فەلسەفەیە لە سروشت و ماهیەتی مرۆۋ ناكۆڵێتەوە ، تا لە ئەنجام دا كۆمەڵێك بۆچوون لەسەر مرۆۋ بەدەست بهێنێت ، چونكە بەڕاستی ناتوانین لە سەرەتا دا سروشت و ماهیەتی مرۆۋ دیاری بكەین و لە كۆتایی دا لە بارەیەوە ئەنجامگیری ئەنجام بدەین ، ئەمیش لەبەر ئەوەیە كە مرۆۋ ماهیەتێك و جەوهەرێكی دیاریكراو و نەگۆڕو پێشوەختەی نیە ، هەر بۆیە فەلسەفەی بوونگەرایی لە (بوون) ی مرۆۋ دەكۆڵێتەوە ، وەكو سارتەر لە پەرتوكی (الوجوود والعدم) بوون و نەبوون دا دەڵێت ، بوونی مرۆۋ پێش ماهیەتێتی ،مەبەست لەوەیە**

که مرۆڤ سەرەتا وەکوو بوون دەبێت و مەوجوودە و دواتر بە هۆ و ڕێگای ئەو بوونەوە ماهیەت بەخۆی دەبەخشێت و دیاری دەکات و دەناسرێت ،واتا ڕوو بەڕووی خۆی دەبێتەوە و دەچێتە نێو چیەانی میناتۆر لە فەلسەفە دا بە بێ ئاگایی خۆی، دەچێتە ناو ئەو جیهانەی دەور و بەر ی و ئیمکانەکانی خۆی بەدی دەهێنێت و خۆی دەناسێنێت و بەو شێوەیە ئیدی ئەم مرۆڤە لە ڕووی ماهیەتیشەوە خودی خۆی دیاری دەکات ،ئەمەیە بنەڕەت لە فەلسەفە دا ، وە دەکرێت هەر بەم هۆکارەش بتوانین لەوە تێبگەین کە وازهێنانی مەحوی لە دنیا ، لە مەرگ دۆستیەوە نیە ، بەڵکو لەوەوەیە کە دونیا لە چاو ((بوون)) ی ڕەسەنی خۆیدا هیچ نیە و لە پێناو بە دیهێنانی ئەو بوونەیدا ئامادەیە واز لە دنیا بەێنێت ، ئەو بوونەی کە لە لای ئەم ڕەسەنە، کەواتە دەبێت بڵێین مەحوی ژیان دۆستە و چیانی خۆش دەوێت ، بەڵام ژیانی بە بوونی ڕەسەنی خۆیەوە دەوێت، مەحوی کە دەبینێت دنیا هیچ و بێ وەفایە و هەر ڕۆژە لەسەر بارێکە ، هەر ڕۆژە لەسەر کارو دارێکە ، ڕۆژێك مرۆڤ بەرز دەکاتەوە و ڕۆژێك دەیدات بە زەویدا و تا سەر ئەم نیە ئەم دونیایە ، چونکە نیشانەکانی وا دەرکەوتوون کە دەسپێکی بوونی ئەم دونیایە بەو حاڵەتانە دەست پێ دەکات دڵی مرۆڤ غەمگین





دەکەن،وە بە وازهێنانی مەحوی لە دونیای و شتە دونیایی، دونیاو شتی دونیاییش لە مەحوی دەکشێنەوە و وازی لێدەهێنن و لە دەستی دەردەچن ، لەمەوە ئیدی بۆ هەمیشە کەمەحوی دەکەوێتە حاڵەتی (عەدەم)ە مەوە و پەی بە (یار–بوون) دەبات ، وە بۆ یە مەحوی هەمیشە لە دوای دەرچوون لە عەدەم دەیەوێت هەمیشە وەسفی یار بکات ، بەڵام کێشەی مەحوی لێرە دا ئەوەیە کە دەیەوێت وەك یارێکی بەرجەستە و دیار دەرك بەو یار–بوونە ی بکات و وەسفی بکات وەکو ئاشکرا، لە کاتێك دا ئەو یار–بوونە بەرجەستە و دیار نیە و وەسف ناکرێت ، بۆیە هەمیشە مەحوی لە بەرامبەر هەردوو دەستەواژەی یار–بوون دا سەراسیمە بووە و هەرچیەکی کردوە نەیتوانیوە نەیتوانیوە وەك یارێکی بەرجەستە و دیار و ئاشکرا وەسفی بکات ،وە لە حاڵەت و دۆخی بوونی ڕەسەن دا، مەحوی داوا دەکات کە بکوژرێت، ئەم کوشتنەش دەکاتەوە کوشتنی ئەو لایەنەی مەحوی کە بوونی ساختە و مەوجوود تیایاند ئامەدەگی هەیە ، نەك کوشتنی ئەو مەحویەی کە خاوەنی بونێکی ڕەسەنە ، ئەمیش لە شیعرەکانی دا بە ئاسانی هەست بەوە دەکرێت ، کە مەحوی عاشقی ئەوو بوونەی خۆی دەبێت کە بوونی ڕەسەن و بوونی ساختەیش کوژراوە ، چونکە سەردەمێك و

**قۆناغێك هەم بوونی ڕەسەن و هەم بوونی ساختە بە جیا لە ناو مەحوی دا ئامادەگییان هەبووە ، ئیدی لە دوای ئەو هەستە عاشقانەیە وەکو وتمان ، مەحوی دەکەوێتە نێو دونیای عیشقەوە ، ئەو دونیایەی کە جیاوازە لە کۆی دونیاکانی تر ، ئەو دونیایەی عیشق کە مەحوی تێی دەکەوێت ، تەواو جیاوازە و وەکو ددنیا نیە و تیایدا غەم و خەفەت و ئازار ، مایەی خۆشین و نیشانەی ئەوەن عاشق لە عیشق دا بەردەوامە ، جگە لەمە لە دونیای عیشق دا کەس لەکەس چاکتر و کەس لەکەس زیاتر نیە و هەموو مرۆڤەکان وەکو یەك وان و بە بێ جیاوازی .**

**بۆیە ئیدی بۆ هەتا هەتایە مەحوی لە جیهانی عیشق دا هەست بە نەمری و مانەوە دەکات ، واتا ئەو پێ ی وابووە ئەگەر لە دونیا دا مەملەکەتێکی تایبەتت هەبێت بە ناوی عیشقەوە ، یان لە نێو ئەو دونیا گەورەیەدا دونیایەکی بچوك درووست بکەیت و ناوی لێ بنێیت دونیای عیشق ، ئەوا هەمیشە ئیدی تۆ زیندویت و بە نەمری دەمێنیتەوە ، بەڵام ئەگەر هەر لەم دونیایە بژیت و هاوشان لەگەڵ کۆمەڵە کەسێکی کەم و پوچ دا کە هەمیشە پڕۆژەی کوشتنی عیشقیان پێ یە ، ئەویش بە پێ ی زەمەن وەکو ئەو**





**گروپانەی لێ دێت و دواجار دەبێت بمرن عاشق بوون بۆ ئەو کەسانە ئەستەمە ، چونکە تازە ئەوان بەم دونیا بێ مانایە ڕاهاتوونە.**

**ئەوەندەی ئەهلی دنیان ئەهلی دنیا ، تاقە ڕۆژێ گەر**
**بەقەڕنێ من ئەوەندە ئەهلی خودا بم دەبمە پێغەمبەر**

**بە کەم مەگرە سروشك و ئاه و ناڵەی بێ نەوایانت**
**کە سەیلی بێ ئەمانە ،تیری دڵدۆزە، گولەی وەر وەر**

**چ کەس نابێ بەکەس دارم، نیە لەو بەردەرە یارم**
**خودایا تۆ بکەی چارم، کەسێکم بێ کەس و بێ دەر**

**چڵ و چۆکەر مەدە دەورم ،خودا حافیز نەسیحەت گەر**
**لە شەکوەی عیشق و لۆمەی عەقڵ ئەمن هەم لاڵم و هەم کەڕ**

**زوبان و گوێ گلە و پەندی نەڵی دەبیەن ،نەپێ دەبیەن**
**عەبەس دێن و دەچن ،بەم جۆشە غەمماز و مەلامەت گەر**

**لە ئیعجازی مەحەببەت چار فەصڵم جوملە بۆ جەمعە:**
**سروشکم سورە ، ڕەنگم زەردە، لێوم وشکە چاوم تەڕ**

**سیا پۆشن لە داغی خەتت و خاڵ و لێو و ڕو و زوڵفت**
**وەنەوشە و میسکی چین و ئاوی خزر و لالەو و عەنبەر**

**جگەر کون کە ،خوێنی گریە بەردە ، سینە هەڵدڕە**
**نیگاهیٚ کە ، ببینە کاری تیر و نەشتەر و خەنجەر**

**کە سەیری دەفتەری سەرگەشتەگان و خاکساران و**
**سیا بەختانی کردن ،دی هەموو،((مەحوی)) بو سەر دەفتەر**

**بۆیە من بڕوا دەکەم لەو شیعرەی سەرەوەشی دا بە جوانی ئاماژەی داوە بەو جۆرە لە بوونی ساختە و ڕاستەقینە، وە دەکرێت ئێمە لەو شیعرەی مەحوی گەورەوە بتوانین دوو جۆر لە دونیاش لە یەکتر جیا بکەینەوە، ئەویش یەکەم دونیای ڕاستەقینە ، دووهەم دونیای ساختە ، یان دەتوانین دوو جۆر لە ئینسان کلاسیفیکەیشن بکەین، ئەویش**





**ئینسانی ڕاستەقینە و ئینسانی ساختە ، بۆ هەریەکێك لە ئێمە گرنکە ئەو دەستەواژانە لە یەکتر دابڕین و نەهێڵین دەستەواژە دژەکان تێکەڵ ببنەوە بەیەکدی، ئەوان کە خۆیان دژن، ئێمە بۆچی تێکەڵاویان بکەینەوە، بەڵام مرۆڤی ئێمە بە داخەوە ، کە دەڵێم بە داخەوە، لە ڕاستیدا زۆر زۆر بە داخم،بۆ ئەوە بەداخم کە بوون و دونیای ئێمە ساختەیە و بەشێکی زۆری مرۆڤەکانمان مرۆڤی ڕاستەقینە نین و مرۆڤی ساختەن، ئەوە دەمەوێت بیڵێم ئەوەیە کە پێوستە مرۆڤ بە خۆیدا بچێتەوە، ئەویش بۆ ئەوەی دواجار بتوانێت بە دونیا دا بچێتەوە، ئەگەر مرۆڤ نەتوانێت بەخۆیدا بچێتەوە ئەوا ناشتوانێت بە دونیادا بچێتەوە، ئەگەر مرۆڤ نەیەوێت لە خۆی تێبگات، ئەوا ناشیەوێت لە دونیا تێبگات ، ئەگەر مرۆڤ نەزانێت مرۆڤ چیە؟ ئەوا بە دڵنیاییەوە نایشزانێت کە دونیا چیە، بۆیە ئەوە گرنە بۆ ژیانی مرۆڤەکان ئەوەیە کە پێویستە لە خۆیان تێبگەن، تێگەیشتنێکی تەحیقی نەك تەقلیدی، لە ڕاستیدا مرۆڤی ئەم ڕۆژهەڵاتە زۆر سەیرن بەڕێزانم، سەیرن بەو مانایەی کە هەمیشە دەیانەوێت ببنە قسەکەر و بگۆ ، قسەکردن دەربارەی بچوکترین شت تا گەورەترین کێشەی فیکر ی فەلسەفی و ...هتد، بەڵام لەهەمان کات دا مرۆڤەکانی ڕۆژهەڵات بچوکترین زانیاریان نیە**

تەنانەت بەرامبەر بە خۆشیان، ئەمەیە ئەو کێشەیەی کە
مرۆڤ تێیدەکەوێت ، کێشەی وازانین بە ناسینی شتەکان و نە
ناسینی خود، لە جیهانی ڕەوان شوناسیشدا ئەم کێشەیە
هەر هەیە ، وە بیریارانی میتۆدیش ئەم کێشە سەرەکیانەیان
باس کردوە ، وەکو : چان دلین، پۆلەنیسکی و ویتنی و
زۆری دی، ئەو نمونەی کە سەبارەت بە بیریارانی میتۆدم
هێنایەوە بێ مەبەست نیە، چونکێ مەحویش کەسێك بووە
کە باسی لە دونیای میتۆدگەرایی کردوە و بۆ ئەوەش کە
دەڵێت :

من لەیەك دا یەك دەبینم ، چل لە دوو دا ، دەه لە سێ
مەنهەجی عیشقی حەقیقی (نوون))ە ، پەنجای جێ بەجێ

لەم شیعرە دا مەحوی وشەی مەنهەجی بەکار هێناوە و ناوی
ئەو مەنهەجەشی دیاری کردوە ، ئەوە تەنها بۆ ئەوە بوو کە
دڵنیا بین لەوەی فەرهەنگی بناغەی مەحوی فەرهەنگی ناسین
و فەرهەنگی جیاکردنەوەی تێرم (زاراوەکان) و
بەکارهێنانیانە لە شوێنی خۆیان دا ، وە زیاتر بۆ ئەوەش
بوو کە بەڵی مەحوی لە میتۆد دا ئیشی کردوە ، ئەوەی
ڕاستی بێت ئێمە کە ڕۆژهەڵاتیمان پێ دەڵێن هیچ دەربارەی





میتۆد نازانین و شارەزایش نین، دەکرێت خەڵك هەبن تاك ،
تاك ، کە ئیش لە دونیای میتۆدگەراییدا بکەن ، بەڵام
ڕاستیەکەی ئەمە پێوەر نیە، بۆ تێگەیشتن لە میتۆد، وە
هەروەها لە بابەتی ڕەوان شوناسیش دا هەر وایە و بە هەمان
شتە ، چونکە ئەوەی کە دەکرێت بڵێن لەسەر ئەم دۆخەی کە
ئێستا دروست بووە لەم ناوچەیە دا ، خۆ لە خۆوە نیە، لە
ئینجیل دا شتێك هەیە ، پێم وابێ لە کتێبی مارك,marc، کە
دەڵێت (تعرف الاشجار بأثمارها) ، دیارە هەموومان ئێرە
دەبینین و ئاگەداریشین لەوەی کە ژیانی زۆربەمان ساختەیە
، کەواتە دونیای زۆربەمان ساختەیە ، ئیدی دیارە کە
زۆربەی مرۆڤەکانی ئێرە مرۆڤی ساختەن، مرۆڤی ساختە
مەبەستم لە چیە ؟
لە ڕاستیدا من مەبەستم لە مرۆڤی ساختە هەموو ئەو
مرۆڤانەیە کە تائێستا لە خۆیان نەپرسیوە بوون چیە ؟ لە
خۆیان نەپرسیوە دونیا چیە و من چیم ؟ بگرە ناشیانەوێت
ئەو پرسیارە لە خۆیان بکەن ، ئەگەر ویستێك هەبێت و
ئەگەر حەزێك هەبێت بۆ پرسیار کردن ، هەڵبەت پرسارەکان
دەکرێن چ درەنگ و چ زوو ، بەڵام کە پاڵنەر نەبوو ، کە حەز
و ویست نەبوو ئیدی ئەوە کێشەکەیە کە تۆ نەتوانیت و
نەتەوێت و نەزانیت بپرسیت دەرابەر و بەرامبەری

**شتگەلەکان ، ئەم کێشانە هەن ، بەڵامەکیٚ کەسایەتی وەکو مەحویش هەبووە کە ویستویەتی لەو کیشانە خۆی ڕزگار بکات ، واتا مەحوی ئەگەر وەکو مرۆڤێك ئەژماری بکەین، ئەو توانای ئەوەی نەماوە چیدی ماسك و دەمامەك ببەستێت و هەر درۆ لەگەڵ خۆیدا بکات ، کەوتۆتە شوێن پرسیارەکان و کەوتۆتە شوێن وەڵامەکانیان ، هەربۆیە ئەو بڕوای بە دونیایەك هەیە دووربێت لە درۆ و ملی یەکتر شکاندن و بێڕێزی کردن بەوی دی و ژێرپیٚ خستنی ئەوی دی ، ویستویەتی دوای ڕێز و عەشق و نەمری و ڕاسگۆیی بکەوێت و دواشی کەوت و من شاهێدم لەسەر ئەوەی کە پێشی گەیشت و نەمر مایەوە ، نەمر نەك بەومانایەی کە خۆی مردوە و شیعرەکانی ماوەتەوە ، نەخێر، نەمر بەو مانایەی بە ڕاستگۆیی ژیاو وە بەڕاستگۆیی مرد وبە ڕێزەوە مرد و عاشق بوو مرد ،مرۆڤەکان کە بە جوانی ئەمرن ، نامرن ، ئەوان تەنها ڕۆحیان دەردەچیٚ، لیٚ وەکو خۆیان زۆر ئاسودەن چونکە لە یاریەکە تێگەیشتبوون کە چۆن کۆتایی پیٚ دێت ، ئەو یاریەی کە دەبێت دواجار هەموو ئینسانەکان ببینن ، هەموو ئەو مرۆڤانەی کە ناشیانەوێت ببینن هەر دەبێت ببینن ، بەڵام ئەو مرۆڤانەی کە دەیانەوێت ببینن، یایریەکەیان لەلا غەریب و نامۆ نیە، چونکە خۆیان هەستیان**





**دەکرد کە یاریەك هەیە و کۆتاییەتی، دەبێت لەم چەشنە بێت،بۆیە زۆر ئاساییە لە لایان ئەگەر شتێکی واش لەو چەشنە یاریانە بێنە پێش ، چونکە ئەوان بڕیاریان داوە ، بڕیاریان داوە کە بۆ هەمیشە ڕاستگۆ بن و بۆ هەمیشە بەرەو مەملەکەتی عیشق بڕۆن و تا هەمیشەیش بوونەورێك بن کە بتوانن پرسیار بکەن .**

**تا ئەو ئاستە لە بوون تێگەیشتین وەکو فەلسەفە ، وە ئەوەی ماوەتەوە ئەوە کە بوون چ پەیوەندیەکی لەگەڵ مردن هەیە ، دەبێت بزانین کۆنێکتی مردن بتەوە لەگەڵ بوون خۆی ، فەیلەسوفە بونگەراکان بایەخێکی زۆر بە مردن دەدەن و زۆر لیٚ ی دەدوێن ، بەڵام ئەو ڕوانگەیەی کە تا ڕادەیەکی باش لە لای من پەسەندە ، بڕواو تیورە و تێزی هایدگەرە لە مەڕ مردن ، لەسەرەوە تێگەیشتین لە بوونی ڕەسەن و بوونی ساختە ، هەڵبەت لە لای مارتن هایدگەری فەیلەسوف مردنیش بە نسبەت هەر یەك لە بوونی ڕەسەن و ساختەوە جیاوازی بنەڕەتی هەیە ، لە بوونی ڕەسەن دا مردن یەکێکە لە تواناو ئیمکانەکانی بوون و پێویستە ئەو بوونە هەردەم پابەندی بێت ،لە کتێبی ڕەخنەی عەقڵی تەئویلی (نقد العقل التأویلی) ، فەتحی مسکینی دەڵێت :لەگەڵ مردن دا (دازاین) لە تایبەتی ترین توانای خۆیدا چاو دەبڕێتە خۆی ، وە بە**

بڕوای ئەو مردن واتا (ئەو—ئیتر—ناتوانێت—لێرە—بێت) ، واتا مردن توانای نەمانی گشت تواناو ئیماکانیەتێکە لەکەسەکە داو لە مردندا هیچ پەیوەندیەك لەگەڵ دەرەوە دا نامێنێت و تایبەتە بە کەسەکە خۆیی و ڕەسەنترین توانای دازایینە ،چونکە ئەگەر مرۆۊ لە بوونی ڕۆژانەیدا یاخود لە بوونی ساختە دا بتوانێت لە شێوەی بوونەکانی تر دا دەربکەوێت و تواناو ئیمکانەتیەکانی بێنێتە ناو ئەم و بتوانێت تەحقیقیان بکات ، ئەوا لە مردن دا ناتوانێت ئەمە بکات ، چونکە مردنی تەنها بە خۆیی تایبەتە و وە تەنها خۆیشی دەمرێت نەك ئەو چالاکیانە ، جا چ چالاکی ڕەسەن یاخو چالاکی ساختە ، ئەو ناتوانێت لە جیاتی کەسی دی بمرێت ، وە کەسیش ناتوانێت لە جیاتی ئەو بمرێت ، ئەمە پەیوەندیەکی گشتگیر و پێکەوە بەستراوەیە، وە ئەم مردنە لە ئینسانەکان دا هەر لەسەرەتای بوونی یەوە وەك توانایەك هەیە و کەسەکە چاوەڕوانی ئەوە بووە، یاخود هەستی کردووە بەوە کە ڕۆژێك دێت دەبێت بمرێت و توانی ئەم مردنە دەبێت بێتە دی ، بۆیە ئینسانەکان ئەوەندە ترسیان لە مردن نیە و لیّ ی ڕاناکەن و هەر وەکو توانایەك لە تواناکانی خۆی تەماشایان دەکات .





پیری نوفزی کردە بەدەن بەسیە تەنبەڵی
دەرچۆ لە خانویّ کە خەلەل گەییە تەنبەڵی

قەی کردنی سوراحی گەر تێبگەی دەڵیّ
دڵ تێکەڵ هاتنە لە گەڵ ئەم خەڵکە تێکەڵی

وا دڵ بە داغم ئەز لە ڕەقیب ئەر سەری بڕن
بۆ ئەکلی لەحمی ئەو سەگە من دەبمە حەنبەلی

تەرسا بە دینی ئەو یەدی بەیزایە بونە جوی
بۆ کوشتنم کە دەستی دەرێنا لە باخەڵی

دنیا بە تەوسەوە دەمی مەرگی وتی کە (ژو ال قرنین ) ی دی زەلیلە ، لە کن خۆت ئەتۆ کەڵی

زاهید چیە ، هەیە گەیەڵی ڕیش و توکە سەر ئاگر نەبیّ ، چبیّ سەری دەرکا لە جەنگەڵی

((مەحوی)) قەصا قصێکی خۆشی وت بە چاری ڕوس :
دوێنیّ گەماڵە گەورەکە ، ئەمڕۆ یەکیّ دەڵی

واتا ئەوانەی کە لە مردن دەترسێن ئەوانەن کە ئیدی ناتوانن لە دونیا تێبگەن و لە مانای ژیانی دونیا تێبگەن ، دەکرێت کەسانێك هەبن لە مردن بترسێن و لە ژیانیش تێگەیستبن ، بەڵام ئەم ترسانە لە خودی پرۆسیسی مردنەکە نیە ، بەڵکو جێهێشتنی ئەو ژیانەش نیە کە جێ ی دەهێڵێت بۆ هەتا هەتایە ، ترسی ئەم مرۆڤە لە مردن ترسێکی ئەبەدیە تا ئەو شوێنەی کە پرۆسەکە تەواو دەبێت ، واتا ترسێك هەیە پەیوەندی بە دونیاو پشتی دونیاوە نیە ، بگرە ئەم ترسە ترسێکی ئەزەلی و ئەبەدیە کە لە نێو سینگ و دڵ و دەرونی ئینسانەکاندا هەیە ، جا هەندێ سات ئاشکرایە و هەندێ جاریش ئەم ترسە پەنهان و نادیارە و وەدەر ناکەوێت ، مەحویش بەو پێ یەی یەکێك بووە لە سۆفیەکانی تەریقەتی نەقشەبەندی و شێخ بەهائودین نەقشبەندی ڕابەری ڕۆحی ئەو بووە ، وە مەحوی وەکو باباتاهیر و مەلای جەزیری ی و شێخ نورەددینی بریفکانی لە زانستی سۆفیگەریدا باڵ دەست بوەو وەکو ئەوان بەرەو لایەنەکانی سۆفیگەری و ئاستی تێگەیشتنی فەلسەفی هەنگاوینـاوە ، بەڵام ئەوەی کە مەحوی لەم سێ کەسە جودا دەکاتەوە لە ڕووی دونیا بینی و تێگەیشتن لە وجوودیەت و عەدەمیەت ئەوەیە کە حەزرەتی





مەحوی بە ئاشکرا هەست دەکرێت بەوەی کە شەریعەتی کردۆتە ڕێگایەك بۆ ڕۆیشتن و هەنگاو نان بەرەو حەقیقەت ، واتا پێ ی وایە پەیڕەو کردنی شەریعەت مرۆڤ دەگەیەنێتە خواناسین ، وە شتێکم خوێندەوە لە ڕۆمانی براکوژی نیکۆس دا کە دەڵێت کەسێك خودا خۆشی بوێت ، زوو دەیباتەوە و ڕزگاری دەکات لە دەست ئەم دونیا پڕ لە پوچیە ، هەڵبەت بۆ ئەوەی زیاتر لە تێزەی مەحوی تێبگەین دەربارەی دونیا ، دەبێت لەوە ئاگەدار بین کە مەحوی ئوستاد بووە لە (فەلسەفەی دین ) ، چونکە بە ڕاستی کۆمەڵێك دەستەواژەی دینی-فەلسەفی تێکەڵ بە دونیای سۆفیگەری بەکار دەهێنێت بە تەواوی دەبێت بڕیار بدەیت لە سەر ئەوە : بەڵی مەحوی فەیلەسوف بووە لە مەجالی دین و هەروەها فەلسەفەی وجوودیەت دا ، بۆ ئەوەشی کە گوایە ئەو ڕێگەی شەریعەت بە چاك زانیوە وەکو تەریقەت بۆ گەیشتن بە حەقیقەت ، پێموابێت هەر ئەم شیعرەی زۆرباشە بۆ ئەوەی وەکو نموونەیەك بیهێنمەوە بۆ پشتگیری کردن لەو بۆچوونەم و دەڵێت :

دەرچو لە حەددی غایە عوروجی دەجاجیلە
یا ڕەبی تۆ بکەی کە بکا عیسەیەك نزول

زالّم ! سبەی بە ژەڕڕە حیسابت لەگەڵ دەکەن
ئەمڕۆش ، ئەتۆ مەبوورە ، حیسابت بکە بە پول

ڕێگەی ، هودا تەریقەتی عیشقە ، دە ((مەحویا))
وەرن و پیا بڕۆن و (و صلوا علی الرسول)

هەر ئەم تەریقە بوو بە هەموو صەحبی گرتیان
ڕۆیین پیا ، هەتا گەینە مەرتەبەی وصول

**لێرە دا مەرتەبەی وسوڵ کەیینە بە خودا و ناسینی خودایە ، لە لای مەحوی ((حەقیقەت)) ی دونیا ناسی ، ناسینی خودایە ، وە هەروەها لە شوێنێکیشدا شەریعەت دەکات بە خۆرێکی ڕوناك ڕۆشنکردنەوەی ڕێگەی موسوڵمانان :**

**خورشیدە موعجیزەی شەرع ، زوڵوماتە سەفسەتەی پوچ**
**ئیسلامییان هەموو دین ، یۆنانیان هەموو دوون**





**ئەمە ئەو جۆرە تێڕوانینەی مەحوییە دەربارەی دونیا و حەقیقەتی دونیا ، پاش ئەوە کە مەحوی حەزرەت، بە باشی لە فەلسەفەی زانست و زانستی لاهوت تێگەیشتوە ، وە شارەزایەکی باشیش بووە لە دونیای سۆفیگەری و خۆی لە کەسایەتی حەللاج و جونەید داوە ، ئەو شیعرەی کە دەڵێت : ((با حەقیشی بێ لە بۆ مەنسور (أنا الحق) حەق نیە )) ، لێرە تەنانەت حەلاج ی ڕیبەری بەشێکی گەورەی نێو دونیای تەسەوف سەر زەنشت دەکات ، ئەویش لەبەر ئەوەی شێتیە کە حەلاج بڵێت من حەق م ، وە لایەنگری دەکات لەبەر ئەوەی حەللاج لایەنگری لەوە دەکات ، کە گەیشتۆتە پلەیەکی ڕۆحانی وەها کە هەست بە بوونی خۆی نەکات و وا هەست پێ دەکات لە بوونی ڕەها دا فەنا بووە و نەماوە و تواوەتەوە ، کە سەرزەنشتی دەکات لەبەر ئەو پلەیە نیە کە بەدەستی هێناوە لە ڕۆحانیەت و حەقانیەت، بەڵکو لەبەر ئەوە لۆمەی دەکات کە چونکە ئە یەکبوونەی (وحدە الوجود)، کە حەلاج وتویەتی ڕاستەقینە نیە، بەڵام حەلاج خۆی وا هەست دەکات کە ئەو بوونە ڕاستەقینەیە ، ئەویش لەبەر ئەوە ئەگەر بێت و دوو شت بوونە یەك ، ئەوا هەردوکیان سیفەتی خۆیان گومدەکەن و سیفتێکی دیکە وەردەگرن، وە ڕەنگە سیفەتی یەکتر وەرگرن ، ئەوەی کە**

یەکێکیان سیفەتی ئەوی دی بۆ خۆی دادەنێت ، وەك ئەوەی حەللاج کردی ، وە بۆ خودا ناکرێت و ناشیّ کە گۆڕانی بەسەر دابێت و سیفەتی مرۆڤێك وەربگرێت ! هەربۆیە مەحوی پیّ ی دەڵێت : شێتیە مەجنوون ئەگەر بیّ نازی لەیلایی بکا، واتا مەجنون شێت بووە دیارە کە دەڵیّ من لەیلام! واتا حەللاج شێتە ئەگەر بڵی من خودام !!

مەحوی حەزرەت دەیەوێت ئەوە ڕەت بکاتەوە کە تێزێك پیّ ی وایە شتەکانی دی ڕەت بکرێتەوە ، من بڕوام بەوە هەیە کە مەحوی هەمیشە ڕەتکردنەوەی ڕەتکردۆتەوە ، بەڵام بەڵی پەیوەستیش بووە بە دین و قیەم و پرەنسیپی ئەخلاقە دینەکەی خۆیەوە کە دینی ئیسلامی پیرۆزە ، هەڵبەت لە نێو ئەم بازنەیەدا کە بازنەی شەریعەت و ئەحکامی دینی یە ، مەحوی ئیشی کردوە لە بازنەیەکی فراوانتر لەو بازنەیەی خۆی ، دواجار مەحوی ئاشنا بووە بە زۆربەی دید و دینەکانی تر ، کە باس لە عیسەوی و موسەوی و ئاتەش پەرست و بزوی و ..هتد ، دەکات کە بەڕوونی هەست پیّ دەکرێت لە نێو تێکستە شیعریەکانی دا ، وە هەروەها شارەزایەکی باشیش بووە لە دونیای دەرەوە ، ئەو بەتەنها دونیابینی نەبووە لە ڕووی دونیای لۆکاڵیەوە ، بەڵکو ئەو لەو کەسانە بووە کە ئاشنان بە کلتوری دەرەوە و پێیان





دەوترێت مەڵتی کەڵچەریزم، واتا کەسانی فرە کلتور ، مەحوی حەزرەتیش یەکێکە لەوانی شوێنکەوتەی پەیامبەری ئیسلامە ((دروودی خوای لەسەر)) و بەڵام لە هەمان کات دا ئەم پەیوەستەگیەی بەم دینەوە نەبۆتە هۆی دابڕانی لە دونیای دەرەوە و تەنها و تەنها کەسێکی داخراو بێت ، من کە چوومە تەکیەکەی و سەر گۆڕەکەی ، کتێبخانەکەی ئەوم بینی ، کتێبخانەکەی مامۆستا مەحوی لە زۆربەی کتێبخانەی ڕۆشنبیرەکانی ئێستامان پڕ کتێبتر بوو ، من هەر زۆر شۆك بوو ، وە لە نێوان ئەو کتێبانە دا نەهج ولبلاغە و فەلسەفە و ئینسایکلۆپیدیا هەبوو ، وە هەروەها بەشێکی تر کە بینیمن کتێب بوون دەر بەرابەری زانستی شەرعی و فیقهی ، وەکۆمەڵێك دیوانیش هەبوون لەوانە مەولانای ڕۆمی و حافز و سەعدی و حەللاج و عەتتار نەیشاپور و هەندیّ شتی تر ، کە دەکرێت ناویان بنێین شتە دانسقە و دەگمەن و گران بەهاکان لە ڕووی مەعریفەوە ، وە هەتا لە شیعرەکانیدا کە باسی هەندیّ شوێن دەکات ، تا ئێستاش بەشێکی زۆر لە ئێمەی نەوەی تەکنەلۆجیاو جیهانگیری نازانین ئەو شوێنانە چین و لە کوێی دونیا دان ، ئەگەر بەڕاستی خوێنەر و شوێنکەوتەیەکی باشی زانست نەبین ، بۆ نموونە (زەنگ و خەتتا و دەکەن و صەبا و زۆر شوێنی تر ) کە ئێمە تا ئێستا

نەمانتوانیوە   ئاشنای ئەو شوێنانە بین ، واتا مەحوی کەسێکی ، یان خواناسێك بووە دەشێت بڵێین خواناسێکی دونیا ناس ، واتا خواناسێکی سیستەم ناس و شوێنەوار ناس ، چونکە حەزرەتی مەحوی بە تەوای تێگەیشتوە لەوەی کە بەڵی بینین و ناسینی دونیا لەیەك ڕووەوە نابێت و پێویستە لە چەند ڕویەکەوە دونیای خۆمان بناسین و مانا قوڵ و فەلسەفیەکەی لێك بدەینەوە و بیکەینەی سوژەی ژیانی ڕۆژانەمان ، بەڵام ئەو لەگەڵ ئەم تێڕوانین و ئەو میناتۆرەی لە تێڕوانین، بڕواشی بە مەسەلەیکی گرنگ هەیە،ئەویش مەسەلەی شەریعەتە ، هەڵبەت مەولانای ڕۆمیش هەر بڕوای بەو مەسەلەیە هەبووە، حافز و حەللاج و شێخی سەعدی و تەنانەت خەیامیش بڕوای بە مەسەلەی شەریعەت هەبووە ڕەنگیشی داوەتەوە لە کۆی شیعرەکانی ، وە ئەم پەیوەست بوونەی بە دینەوە زیاتر هاندەر بووە بۆ تێگەیشتن لە مەسەلە  جەوهەریەکانی یان و هەر دینیش بووە بە هۆی ئەوەی کە بتوانێت خۆی لە بوونی ساختە دەرباز بکات و بۆ هەتا هەتایە بوونێکی ڕاستگۆیانە و ڕاستەقینانە بژێت و دونیا بگوزەرێنێت ، کە ئەوەش کەم نیە بۆ مرۆڤ کە بتوانێت ڕاستەقینە بژێت و ڕاستەقینە بمرێت ، ڕەسەن بێت لە هەڵسوکەوت و گوفتار و لەگەڵ ئەوەش دا بیر





لە کۆمەڵێك کرداری تری ڕەسەن بکات و هێشتا وا بزانێت کە ڕەسەن نیە ، ئەمەش خاڵێکی دی دەسەلمێنێت کە مەحوی هەمیش لە شەڕی وەرگرتنەوەی ڕەسەنایەتی دا بووە و ویستویەتی بوونی ساختەیی لە نێو دونیا لە خۆی دا بماڵێت ، ئەم بەشە لە پەیوەندی بوون لە فۆرمی دونیا دا بە قەصیدەیەکی مەحوی کۆتایی پێ دێنین و دواتر دەچینە سەر ((ئیشکالیەتی ئینسان لە نێو دونیا و ئینسیجام نەکردنی ئینسانی عاقڵ لە نێو دونیا )) :

لە ناکەس کاریا خاکم بەسەر ڕۆیی بە با عومرم
خودا تۆ بمژێنە تا لەبەر قاپی کەسێ دەمرم

بە زایع چو ، لە (ما لا یعنی ) یا وەقتم هەموو
دەبێ وەقتێ لە (بوالوقت) ێ بخوازم تا تیا بمرم

ئەجەل دەورم دەدا ، حازربە وادەی دەور و تەسلیمە
منی غەفڵەت زەدە ، هێشتا خەریکی مەسئەلەی دەورم

خەیاڵی پوچی دنیا ، وا دەماغ و دڵمی پیچاوە
قیامەت ، هەر مەگەر ڕۆژی قیامەت بێتەوە فکرم

**لە پێ کەوتوم و نەفسم بۆ هەوا دەشنێ وەکو منداڵ**
**لەبەر پیری سەرم خۆی ناگرێت و ، تازە پێ دەگرم**

**چیە سوچو گوناهی ، بۆچی دەیکاتە جەزا خانە ؟**
**لەقەبر هەڵکەن ، هەتا ڕۆژی جەزا دەعوا چیە قەبرم**

**سبەینێ (یحشر المرء) ە ، براگەل فرسەتە ئەمڕۆ**
**تەبەڕرا بن لە من ، با کەس نەبێ حەشری لە گەڵ حەشرم**

**لە من نازانم ئیتر نەفسی بەد خوو چی دەوێ ((مەحوی))**
**کە بەدکردار و بەد ڕەفتار و بەد ئەفکار و بەد تەورم**

**مەگەر بەر مەوجی ڕەحمەتم خا ، وەسفی سەتتاری**
**وەگەر نا ، زەحمەتە با بوونەوەم ، نا مومکینە سەترم**





## ئیشکالیەتی ئینسان لە نێو دونیا و ئینسیجام نەکردنی ئینسانی ڕاستەقینە  لە نێو دونیا:

**تێگەیشتن لە کۆهەست و کۆ نەستی مرۆڤەکان و دەربڕینی میتۆدی میناتۆرانە لە دەربڕینی تێرمەکان دا ، ئەمە بۆ خۆی هەروا سوك و سادە نیە ، وە چ جای تێگەیشتن لە ئیشکالیەتی ئینسان لە نێو دونیا و ئیشکالیەت لە نێو بەد و میناتۆرەکان دا ، وە بە ئاسان وەرگرتنی دۆخی ئینسیجام نەکردنی ئینسانی ڕەسەن لەگەڵ دونیای ساختە دا ئەمە بۆ خۆی پاکێجێکە لە ئەنتی ڕاسۆنالیزەیشۆن ، وە بەقەدەر ئەوەی ئیشکالیەت هەیە ، ئەڵبەت ئەنتی ئیشکالبەتیش هەیە ، وە ئینسیجام هەیە ، ئەڵبەت ئەنتیەکەشی هەیە ، کە دواجار ئەگەر بێت و بتوانین لە چەند پەیجێك دا ئەو تێزەیە شیکارانە مامەڵەی لەگەڵ دەکەین و دەیخەینەڕوو ئیشکالیەت لە کوێ یەو ئینسیجام لە کوێ ، کێ ئیشکالیەتی لەگەڵ دونیای ساختە هەیە و کێ ئینسیجامی لەگەڵ دەکات ، سەرئەنجام و بۆ وڵامدانەوەی ئەو پرسانە گرنگە ئێمە جارێکی دی بگەڕێینەوە سەر چەمکی ((پوچی و**

**پوکی و بیٚ بایەخی دونیا)) لە لای مەحوی حەزرەت و لە ڕیٚگای ئەم چەمکی ((هیچیەت)) ە بۆ دونیا لە لای مەحوی وەڵامی بەشیٚك لەو پرسیارە گشتگیر گەرایانە دەدەینەوە ، هەڵبەت مەحوی هەستی بەوە کردوە کە (دونیا ) ئەگەر دایك بیٚت ، دایکیٚکی بیٚ خراپی مرۆڤە و ئەگەر باوك بیٚت باویٚکی خراپە و ئەگەر دونیاش هاوڕیٚ ی مرۆڤ بیٚت ، ئەوا بە دڵنیاییەوە هاوڕیٚ یەکی بیٚوەفای مرۆڤە ، چونکە بە هەموو پیٚوەرەکان دونیا بوونی مرۆڤ لە لە ڕەسەنی خۆی دووردەخاتەوە و بەرەو خۆی کە دونیایەوە ڕاپیٚچی دەکات ، واتا ڕاپیٚچی نیٚو زیندانی خۆی دەکات ، کە دونیا بۆ مرۆڤ زیندانە لە لای مەحوی حەزرەت ، مەحوی پیٚشی وایە کە ئەو بوونەی لە ڕیٚگەی دونیاوە بەدەستی دەهیٚنیٚت ، بوونیٚکە کە بە دونیاوە بەستراوە و مان و نەمانی ئەو بوونە بە تەواوی لە دەست دنیا دایە ، واتا هەرکات دنیا ویستی ئەو بوونە بەو کەسە وەربگریٚتەوە و ئەو بوونەی لیٚ بسەنیٚتەوە ، ئەوا ئیدی ئەو بوونە لە دەست ئینسان نامیٚنیٚت و چیدی کۆتایی پیٚ دیٚت ، وە مەحوی بەو کەسانە دەڵیٚت ئەو کەسانەی کە لیٚکەوتوون و وا دەزانن تاجیان لەسەر ناوە ، کەوتوون و وا هەست دەکەن بە پیٚوەن ، کەوتنیٚك لە لای مەحوی مەبەست لەوەیە کە ئەم کەسە لە بوونی ڕاستەقینەی خۆی دابڕاوە و**





**ئیتر بوونی بەستراوە بەو شتەی کە ناوی دنیایە ، وە ئەوەی کە تیٚشیایەتی، وە بە بڕوای مەحوی دونیا هیچ کات وەفاو چاکەی بۆ کەس نیە و چونکە هەموو ساتیٚك دەبیٚت ئامادە بیت کە ئەو بوونەی داویە پیٚت لیٚتی وەرگریٚتەوە ،وە بە بڕوای مەحوی ئیشکالەکە ئەوەیە و ئینسیجام نەکردنەکە هەر ئەوەیە ئیدی، مەحوی کە لەو کەسانەیە ئیشکالیەتی لەگەڵ دونیا دا هەیە، ئەو پیٚ ی وایە و وا هەست دەکات ئەگەر دنیا بەرەو ڕووی کەسیٚك هات و بایەخی پیٚدا و وای لیٚکرد زۆرترین سەروەت و سامان و گەورەترین پلەی باڵای مەعریفی و یان پلەی باڵای دەسەڵاتی پیٚدا ، وە تەنانەت ئەگەر دنیا تاجیشی لەسەر کات ، واتا تاجی پاشایەتی ، ئەوا ئەم ڕوو تیٚکردن و بایەخدانەی دونیا بەو کەسەو مەزن نرخاندنی کاتیە و وە هەر ئەو دونیایەی کە تاجی پاشایەتی کردوەتە سەر ، هەر ئەو دونیایە نەك هەر تاجەکەی لیٚ وەردەگریٚتەوە دەسەنیٚتەوە و دەسەڵاتی ناهیٚڵیٚت ، بەڵکو لە ناویشی دەدات و سەری بە فەتارەت و خەسارەت دەدات ، وە ئەمە وای لە مەحوی کردوە کە تەنانەت دڵی بە خەڵاتی دونیاش خۆش نەبیٚت ، چونکە لە پشت پیٚدانی ئەم خەڵاتەوە ((خەلعیٚك) و ملشکاندن و نا موبارەکیەك هەیە و دەیەویٚت لە ڕیٚگەیەوە مامەڵەیەکی نا شەریفانە لەگەڵ ئەو**

**مرۆڤە بکات و دواجار لەوەتەری شعور و ئیمان و عەقڵ ی بدات و ناویشی بزڕێنێت ، ئەمە ئەو دوو نیوە بەیتەیەتی بۆ زیاتر بەرچاو ڕوونی و تێگەیشتن لەم تیوریزەیەی مەحوی بۆ دونیا :**

**ئەگەر تاجت لە سەر کا سەرتی پێوە قووت دەدا ئاخر**
**موبارەك کەی دەبیٚ ، ئەو خەلعەتی خەلعی لە دوا بیٚ**

**مەحوی باسی ئەوەمان بۆ دەکات ، کە زەمانە و دونیا مرۆڤ دەکەنە مەسخەرە و گاڵتەجاڕی خۆیان ، وە لەمەشدا جیاوازی لە نێوان هیچ جۆرە مرۆڤێك نیە ، ئیتر ئەو مرۆڤە گەدا یان پاشا ، هەژار وە یان وەزیر بێت ، وە لێرەدا دەگەڕێمەوە سەر ئەو تیورەی کە لە دوو نیوە بەیتەکەی سەرەوە قسەمان لەسەر کرد ، دیارە مرۆڤ کردنە مەسخەرەش لە لایەن دونیاوە بەوە دەبێت ، بەو ڕێگەی سەرەوە کە باسمان لێوە کرد ، بەوەی ئەگەر مرۆڤەکە هەژار یان گەدا بێت ، ئەوا زەمانە و دونیا دەیکەن بە شاه و وەزیر ، واتا دونیا بەرزی دەکاتەوە ، وە ئەم بەرزکردنەوەیە ش بە**





**تەواوی وا لە مرۆڤ دەکات کە بە خۆیەوە خەریك و سەرقاڵ بێت و تیایدا ڕۆ بچێت و لەو دا هەست بە بوونی خۆی بکات و سەرقاڵی بەدیەێنانی ئەم ((بوون)) ە بێت ، وە لەبەر ئەوە بەدیهێنانی ئەو بوونە ، بوونێکی ساختەیە و نا ڕاستە، وە لە خودی کەسەکەو لە نێو قوڵایی مەعنەویاتی کەسەکەوە سەرچاوەی نەگرتوە و لە لایەن دونیاوە پیٚ ی دراوە ، ئیدی ئەو کەسە وەکو مەوجودێك لە مەوجودەکانی دونیای لێدێت و لە ژێر دەسەڵاتی دونیایش دا دەبێت، وە هەرکاتیٚ دونیا ئارەزوی بوو ئیدی وەری دەسوڕێنێت و سەری پێوە قووت دەدات، بۆیە پێویستە و دەبێت خۆی لە شەقی دونیا بپارێزێت و هەمیشەیش ئیشکالی هەبێت لە گەڵ ئەو دونیا مادیە ساختەیەدا ، لە ڕاستیدا ئەوانەی کە ئیشکالیان لەگەڵ دونیا دا نیە ، ئەو کەسانەن وەکو مەحوی باسیان دەکات و نموونەشی لەسەریان هێناوەتەوە کە وەکو داشی دونیا ئاوان و هەر ڕۆژەو لەسەر خانەیەکن ، بەڵام نموونەی ئەو کەسانەی کە مە ئیشکالیان لەگەڵ ئەم جۆرە لە دونیا هەیە ، ئەو کەسانەن کە وەکو مەحوی حەزرەتن ، وەکو بەدوای ژیانی ڕەسەن و بوونی ڕەسەن و دونیای ڕەسەن دا وێڵن ، نەك ببنە بەرداشی دونیا و بە دونیا تەفرە بخۆن .**

بۆیە مەحوی پیێ ی وایە ئەگەر دونیا لەبەرامبەر مرۆڤ دا چاکەیەکی لیێ وەشایەوە و کردی بە خاوەن شتێکی مەعنەوی یان مادی ، دەبێت ئەو کەسە زۆر ئاگەداری خۆی بێت ، لی خۆی دانەبڕێت و لە خشتە نەچێت و ڕووبکاتە بەخششەکانی دونیا ، چونکە دونیا ئەوەندەی تەفەر بە مرۆڤ داوە و مرۆڤی بەرز کردۆتەوە و دوایی نزمی کردۆتەوە و لە ناوی بردوە ، دونیا لە لەلای مەحوی بە هیچ شێوەیەك متمانەی نیە و وەکو ((ڕوو ڕەشێك )) وایە ، چونکە ئەو پیێ ی وایە ئەو دونیایە تەزویر و ساختەیە دەیەوێت لە لی مرۆڤەگان خۆی وا نیشان بدات کە ڕوو سپی یەو ڕاستەقینەیە

گەر لە دنیا چاکەییێ صادر بوو تەفرەی پیێ نەخۆی
ڕوو سپی هەر ڕوو ڕەشە گەر بیێ صەد ئازایی بکا

ڕوو ڕەشیش ئەگەر سەدان چاکەو ئازایی بنوێنێت و بیەوێت بەم شتانە لە لی مەحوی خۆی خۆشەویست بکات و ببێتە ڕوو سپی ، لەلای مەحوی هەر ڕوو ڕەشەو چاکە و ئازاییەکانی سودێکیان نیە بۆ ئەوە ئەو شتانە دەنوێنێنێت تا بە هۆیانەوە مەحوی لە خشتە ببات و لە بوونی ڕەسەن و





ڕاستەقینەی خۆی جودایبکاتەوە بەرەو خۆی بیبات کە (دونیا) یە،وە هەرکات بەرەو ئەو چوو، لە دوای ئەوەی کە ماوەیەك دەبێتە جێگای بایەخ لە لای دونیاو بەرز دەبێتەوە ، ئیدی دوای ئەو ماوەیە ئەویش بەدەردی پاشاو دەسەڵاتدارەکانی پیش ئەمی دەبات و پشتی دەشکێنێت و دەیدات بە زەویداو دەیکاتە گاڵتەجاڕی خۆی ، کێشەکە هەر ئەمەیە لە لای مەحوی حەزرەت، کێشەی هەبوونی ساختە لە لای دونیا، واتا لە لای مەحوی دوو جۆر لە بوون هەیە لە لای دونیا ، ئەویش یەکەم بوونی ساختە و دووهەم بوونی ڕاستەقینە ، بە بڕوای مەحوی ئەو بوونەی کە ساختەیە ئە بوونەیە لە دونیادا کە گوزارش لە دونیایەکی ماددی و بەرجەستە دەکات، وە ئەو دونیایەیە کە مەحوی لە شیعرەکانی دا بە مایەی تەفرە خواردنی ئینسانەکانی دادەنێت، بەڵام جۆری دووهەم لە بوون کە هەبوونی دونیای ڕەسەنە، یان هەبوونی دونیا ڕاستەقینە، ئەمجۆرە لە بوون بریتیە لە دونیایەك کە جیاواز لەو دونیایەی پێشو ، ئەم بوونە دونیا بیرتیە لە بوونێکی مەعنەوی کە ئینسانی مەعنەوی پێویستە بە شوێنیدا بگەڕێت، وە ئینسانێکی مادی بەوە دەبێتە مەعنەوی کە ڕۆحی ئازاد بکات بە قەولی مەولانای بەلخی .

لە شوێنێکدا من ئەم شیعرەم نوسیوە و بەڵام حەزدەکەم جارێکی دی بۆ ئەم دوو نیوە بەیتە شیعرە بگەڕێمەوە و زیاتر قسەی لەسەر بکەین :

**دنیا همه هیچ است ، ولی هیچ تر از وی**
**ماییم ، که در باخته ایم این همه با هیچ**

هەڵبەت لێرە دا ماناگەلێکی دی پەنهانن ، ئەوانەش بریتین لەوەی کە مەحوی پێی وایە ، دونیا هیچە ، بەڵام لەو هیچتر ئێمەین ، کە ئەم هەمووەمان دۆڕاندوە و لە دەستمان داوە ، ئەویش لەبەر ئەوەی لەگەڵ دونیادا خۆمان کردوە بەیەك ، یاخود لەو هیچتر کە ئێمەین ، مەبەستی لەوەوە دێت چونکە ئێمە لەسەر هیچ شەڕدەکەین و یەکتر دەکوژین ، مەبەستی ئەوەیە کە دونیا هیچە ، بەڵام لە دونیا هیچ و پوچ تر ئەو جۆرە کەسانە دەگرێتەوە کە لەسەری شەڕ دەکەن و یەکتری لە ناو دەبەن ، لە ڕاستیدا هەر ئەم دونیا هیچەی کە باسمان کرد لە لای ئەو مرۆڤانەی کە بوونی ساختە مەوجوودن ، دونیا زۆرشتە و بڕوایان وا نیە کە دونیا هیچ بێت ، بۆ یە





مەحوی بەو کەسانەش دەڵێت هیچ ، کە دونیایان بە شت گرتووە ، واتا مەحوی ئیهانە و سەرزەنشتی ئەو کەسانە دەکات کە بوونیان بوونێکی ساختەیە ، مەحوی پێ ی وایە،مرۆڤ و بوونی مرۆڤ لە دونیا بە بەها و پایەدارکردن نابێت لە پێناو دونیادا لە ناو ببردرێن و لەسەر هیچ شەڕبکەن لە یەکتر بکوژن !
چونکە بە ڕاستی دونیا لە لای مەحوی ئەوەندە بێ بەهایە کە تەنانەت لە شوێنێکدا دونیا لە لە لای مەحوی نرخی یەك دەنکە مووروە کەرانەیەکی هەیە ! کە دەڵێت :

**میسالی وایە بەحرێ گەوهەری دابێ بەخەرموهرێك**
**لە بۆ دونیا ئەوی عومری عەزیزی کردوە زاییع**

لەم شیعرە دا مەحوی تەمەنی مرۆڤی بە دەریایەك لەگەوهەر چواندوە و ئەو تەمەنە زۆر ڕێز لێ دەگرێت و بە ئەزیزی دادەنێت ، ئەمەش دیسان ئەوە دەگەیەنێت ،تەمەن و بوونی ڕەسەن و ژیان لەلای مەحوی زۆر بە بایەخ و گرانبەهان و هیچ شتێکی ئەم دونیاو و تەنانەت هەموو دونیاش پێ ی ناگەن و تەمەنی مۆڤێك ناهێنن ، بەڵام کام مرۆڤ؟

**ئەو پیێ ی وایە نابێت مرۆڤ هەموو تەمەنی خۆی لە پێناوی دونیا دا بەسەر ببات ، چونکە هەموو دونیا تەمەنەکەی ئەو ناهێنێت ، بە فیڕۆدانی تەمەن و ژیانت لەبەرامبەر دونیا و بۆ دونیا ، وەکو ئەوە وایە دەریایەك گەوهەر بگۆڕیتەوە بە (یەك دانە لە مووروەکەرانەیەك) !**

**بەم پیێ یە بەگشتی دونیا لە لای مەحوی هیچە ، کە دونیا خۆی هیچ بێت ، ئەو شتانەی کە دونیا بە مرۆڤی دەبەخشێت ئەوا بە دڵنیاییەوە لە دونیا خۆی هیچترن ، بۆیە بە هیچ شێوەیەك نابێ مرۆڤ بە دەسکەوتنی شتی دونیایی ، تەنانەت بە دەسکەوتنی هەموو دونیاش خۆی منەت باری دونیا بکات :**

**بۆ پارە حەیفە خۆ دەکەییە پولی نا ڕەواج**
**بۆ پارویێکی نان ئەسەفە ڕوو دەکەی بە ساج**

**<u>یان :</u>**

**بەخششی دنیا مەخۆ ، یەعنی بە نانێکی جۆ**
**خۆ مەخەرە بەر منەت،پیرە ژنی نانەوا**





**لە لای مەحوی دونیا وەکو پیرەژنێکی نانەوا وایە ، وە بەخششەکەشی هەروەکو نانێکە و زیاتر نیە ، وە مەحوی حەزرەت ، بڕوای بەوە هەبووە کە بایەخ بە بوونی ڕاستەقینە و مەعنەوی خۆی بدات ، ئەوا بە یەکجاری ڕەنگە لەو دونیا مادیە ساختەیە دوور بکەوێتەوە بۆ هەتا هەتایە و ئیدی هیچ پەیوەندیەکی بە دونیاوە نەمێنێت .**

**وە هەست دەکات ، ئیێ مادام دونیا هیچە، دە ئیتر خۆشی و شادی و ڕابواردنەکانیشی هەروەکو خۆی هیچن ، کاتی و ڕاگوزەرن و هیچ کات ئەم شتانە ڕاستەقینەیی نین و تەنها مرۆڤەکان مەست و بیێ خەبەر دەکەن لە خۆیان، وە وایان لیێ دەکەن کە بوونە ڕاستەقنەکەی خۆیان بیر بچێتەوە ، وە مەحوی پیێ ی وایە کە نابێت مرۆڤ ئەو تەمەنەی خۆی لە پێناو خۆشی و شادیە هیچەکانی دونیا دا سەرف بکات و دەبێت لە فێڵی ڕابورادن و لەهولەعبی دونیا ئاگەدار بێت و بزانێت ئەو تەمەنەی خۆی چۆن تەواو دەکات و وە لە پێناو چ شتێك دا تەواوی دەکات :**

**چیە ؟ خوسران ئەمەندە مەستی لەهو لەعبی دنیا بوون**
**برا ! عومری گیرامی بەس لە ڕیێ ی ئەم بادە بەر بادە**

لە ڕاستیدا من بڕوام بەو قسانە هەیە کە پێویستە بۆ ژیان
میهرەبان بیت و غەم خواردن باش نیە و ... کۆمەڵێك شتی
لەو بابەتە، من پێك وایە لە دوای دەرکەوتنی خۆری
حەقیقەت ئیدی میهرەبانی باشترین قارەمان نیە ، kindness
is a don't herosim ، چونکە بەڕاستی ئەوەی کە ئیدی
دەبێت باشترین قارەمان بێت دەبێت ئیدی حەقیقەت بێت ،
the truth is a better heroism , ئەمە و تێگەیشتن لەم
هاوکێشە فەلسەفیە گرنگترە لە هەوو شتێکی دی ، بۆیە
پێویستە ئێمە سەرەتا لەوە تێبگەین کە دونیا چیە ، بەڵی تا
ئەندازەیەك لەوە تێگەیشتین ، وە دەبێت لەوەش تێبگەین کە
پێوستە مرۆڤ چۆن بێت بۆ دونیا ، بەڵێ لەوەش تێگەیشتین،
وە ئەوەی کە ماوەتەوە و قسەی زیاتر هەڵدەگرێت ،
ئەوەیەکە ئایا مرۆڤ بۆچی ئینسیجام لە گەڵ بوونی خۆی
دەکات لە ئێستا دا ؟ یان پرسیارەکە بە شێوەیەکی دی ،
ئایا بۆ زۆرینەی مرۆڤەکانی ئێستا توانیویانە لەگەڵ بوونی
خۆیان ئینسیجام بکەن بە بێ هیچ ئیشکالێك ؟ ئایا ئەم
ئینسیجامە ئەوە دەگەیەنێت کە مرۆڤەکانی ئێمە هەموو
مرۆڤی ڕاستەقینەن ؟ ئایا ئەوەیە بەختەوەری ؟ دەکرێت
بڵێین بەختەوەری لەم دۆخەدا وەکو پەلکە زێڕینەوە وایە لە





ناکاو دێت و بەر لەوەی تامی بکەیت ئیدی کۆتایی پێ دێت
؟ ئینسیجام کردن لە گەڵ دونیا ئەمە دەشێت ئەو
بەختەوەریە بێت کە مرۆڤەکان هەیانە ، یان ..... کۆمەڵێك
شتی تر کە پێویستە لەسەری بوەستین ؟
من پێم وایە ئەو جۆرە بیرکردنەوە و تێڕوانینە لە بەرامبەر
بەختەوەری یان هۆشمەندی کە ببەستڕێتەوە بە بابەتی
ئینسیجامکردن لەگەڵ دونیا دا ، ئەم بڕوایە پێم وابێت
هەڵەیە، ئەگەر تێزەی دونیا پەرستیش فۆرمەلەبکەین ئەوا
دیسان دەچینەوە سەر ئەو ڕێگایەو تیورەیەی کە لەسەروە
بۆ دونیامان کرد ، لە ڕاستیدا ئێستا بە نسبەت ئێمە
کێشەیەك نیە بە ناوی کێشەی تێنەگەیشتن لە بابەتە
ساختەیی و ڕەسەنیەکان ، چونکێ بڕوام وایە تا ئەو
شوێنەی کە کۆنێکتی ئەم دوو کایەمان کرد لە ڕێگەی
مەعریفەناسی شاعیرو عاریف و فەیلەسوفەوە ، ئیدی باش
دەبێت ئەگەر لەسەر ئەو مەسەلەیە ، بوەستین، چونکە تا
ئاستێك وابزانم گەیشتوە ، بەڵام هەبوونی بابەتێکی وەکو
(عەدەم) ئیدی ئەو خەیاڵاتانەمان دەگۆڕیت بەرامبەر بە
دەست بەردار بوون لەم هاوکێشە فەلسەفیە ، بۆیە دەبێت
جارێکی دی بگەڕێمەوە بۆ ئەو چەمکە و بە جۆرێکی بتوانین
تر پێناسێکی مەعریفیش بۆ چەمکی (عەدەم) بکەین ، ئەگەر

به سادەیی بپرسین عەدەم چیه ؟ لە ڕاستیدا پرسیارەکان وتنیان زۆر ئاسانە و هەموو مرۆڤێك دەتوانێت پرسیار بکات ، بەڵام ئەوەی لە ئێستا دا کێشەیە وەڵامەکانن ، جاران و سەرەتای سەرهەڵدانی فەلسەفە پرسیارەکان هەموو کەسێك نەیدەتوانی بیانکات ، بەڵام لە ئێستا هەموو کەس دەتوانێت پرسیار بکات، بەڵام وەڵامەکان دەبێ تا چ ئاستێك قایلکەر بن ، ئەوەی کە هەیە و ئیشی لەسەر دەکرێت لە ئێستا دا وەڵامەکانن ، وە داڕشتنی پرسیا سەبارەت بە عەدەم ، هەموومان دەخاتە ئەو حاڵەتەوە کە دەرك بەوە بکەین ، لەوانەیە وەڵامدانەوەی لە توانا دا بێت، وە ڕەنگە بڕوامان وا بێت بە پێچەوانەوە ، واتا وەڵام دانەوەی ئەستەم بێت ، مرۆڤ ناتوانێت لەوە دڵنیا بێت ، چونکە (عەدەم) بۆخۆی بابەتێکی ئاشکرا و ڕوون و دیار نیە ، تا بتوانرێت قسە لە سەر وەڵامدانەوەی ڕەهایی ئەریٚ یی یان نەریٚ یی بکەین ، لەو پرسیارەی کە ئایا عەدەم چیه ، د.موحەمەد ئەمین عەبدوڵا جوان ئەم پرسیارە تەوزیف دەکات و دەڵێت : لە پرسیاری ئایا عەدەم چیه ؟ شتێکی نا ئاسایی دەردەکەوێت ، چونکە (عەدەم) وەکو شتێك تەرح دەکرێت کە بەم جۆر یان ئەو جۆرەیە و مەوجودێکە ، لە کاتێکدا (عەدەم) لە ڕیشەوە لەگەڵ ئەمەدا یەك ناگرێتەوە و لیٚ ی جودایە ، چونکە





پرسیار کردن لەوەی کە (عەدەم) چیه و چۆنە ، پرسیار لە بارەوە کراوەکە کە (عەدەمە) دەکات بە دژەکەی کە بریتیە لە (وجوود) ، بە پیٚ ی بڕوای هایدەگەریش بیرکردنەوە ، کە لە بناغەدا هەمیشە بیرکردنەوەیە لە شتێکی دیاریکراو ، بیرکردنەوە دەبێت لە (عەدەم) و بە پێچەوانەی ماهیەت و جەوهەری خۆیەوە کار دەکات ، بە پیٚ ی لۆژیك ، بە بڕوای هایدگەر مادەم ناتوانین (عەدەم) بکەینە بابەتێك ، کەواتە ناشبێت ئەم پرسیارە بکەین ، بە دەربڕینێکی تر ماهیەتی بیرکردنەوە کە بریتیە لەوەی پێویستە شتێکی دیاریکراو یاخود بابەتێك هەبێت ، کە ببێتە مایەی تێڕامان و و وامان لێبکات بەمەبەستی دەرك پێکردنی بیری لێبکەینەوە ، لێرەدا کە ڕووبەڕوی (عەدەم) دەبیتەوە ، کە ئەویش بابەتێکی دیاریکراو نیە تا بتوانین دەرکی بکەین و بیری لێبکەینەوە ، بە پیٚ ی تیورەکەی مارتن هایدگەر : بۆیە پێویستە وەکو هۆکارێك پەنا بەرینە بەر تێگەیشتن و پرۆسەی بیرکردنەوەش بکەینە ڕێگایەك بۆ دەرککردن و ئاشکراکردنی عەدەم ، وە بە هۆی تێگەیشتنەوە دەتوانین بگەینە دیاریکردنێکی گشتی (عەدەم) وبتوانین وەکو کێشەیەك بیخەینە ڕوو ، واتا هیچ کات ئێمە ناتوانین وەکو (مەوجوودێك) بیر لە عەدەم بکەینەوە و لێیتێبگەین و بزانین

**چیە ، بەڵام دەتوانین لە ڕێگەی مەجوودەوە بەرەو عەدەم بچین و  هەوڵی دەرککردنی بدەین، وە بە پێچەوانەشەوە دەتوانین لە ڕێگەی تێگەیشتن لە کۆی وجوود خۆی تێبگەین و لەم ڕێگەیەشەوە دەکرێت بتوانین لەو تێگەیشتنە تێبگەین کە پێمان دەگات دەربارەی ئینسیجام نەکردنی مرۆڤ لەگەڵ بوون،وەکو چۆن مرۆڤە ڕەسەنەکان ناتوانن ئینسیجام لەگەڵ بوونی ساختە دا بکەن ، پێم وایە ئاواش مرۆڤە ساختەکان، ناتوانن لەگەڵ بوونی ڕسەن و ڕاستەقینە دا هەڵبکات ، واتا ئەو جیاوازیەی لە نێوان مرۆڤی ڕەسەن و بوونی ساختە دا هەیە، هەمان ئەو جیاوازیەش هەیە لە نێوان مرۆڤی ساختە و بوونی ڕەسەن دا ، وە گشتیگیر کردنی ئەم تێڕوانینەم تا ڕادەیەك باش دەبێت ، ئەویش لەبەرئەوەی کە ئەم پەیوەندیە لە بنەڕەتەوە پەیوەندی دوو ئیتنی یە و تا ئەندازەیەکی باش جۆری پەیوەندیەکە گشتگیرگەرانەیە و ناگشتگیر نیە ، لەسەرەتاوە کە پرسی ئەوەمان خستە ڕوو کە بۆچی هەندێجار لە نێو کۆمەڵگاکان دا بەشێکی زۆرینەی کۆمەڵگا ئینسیجامیان لەگەڵ بوون دا کردوە ، من پێم وایە ئەو بوونە ساختەیە و ئەو کەسانەش کەسی ڕەسەن نین ، بۆ ئەوەش قسەیەکی ئیدوارد سەعید هەیە ، تا ئاستێکی باش بەکارەێنانی ئەو تێرمەی من پشت ڕاستتر دەکاتەوە ، ئیدوار**





**سەعید دەڵێت : (هەموو هەمیشە لە هەڵە دایە )، واتا ئەوانەی کەزۆرینەن دەشێت لە هەڵە دا بن، ئەوە کەمینەی گروپ و کەسەکانی نێو کۆمەڵگان کە دەشێت حەقیقەتیان لە لا هەبێت و خاوەنی ڕاستی و ڕەسەنی بن و ئەنتی درۆ و ساختەیی بن، واتا بوونی درۆ و ساختە لە لای کەسە کەمینەکانی کۆمەڵگا هەمیشە قبووڵ نەکراو بووە و لە فەزای ئەواندا ئەم جۆر لە بوون پەسەند نەکراوە ، وە نموونەیش زۆرە ، وەکو مەولانای ڕۆمی و بایەزیدی بوستامی و حەللاج و (مەحوی) و بریفکانی و ... هتد ،**

**ئەم باسەمان تەواو بوو ، وە هیوادارم بوبێتە هۆی ئەوەی کە کەمێك توانیبێتمان سەرنجتان ڕابکێشین بۆ ئەوەی بتوانین هەموو بیر بکەینەوە لەو کۆنسێپتە جیا جیایانە، بەڵام من پێم وا جوانتر بوو کە باسەکە بە دوو غەزەلی پڕ مانای حەزرەتی وەفایی و شیعرێکی دوور و درێژ و ناسك و جوانی مامۆستا مەولەوی تاوەگۆزی کۆتایی بە باسەکە بهێنین ، چونکە پەیوەندیەکی جەوهەری هەیە دەربارەی ئەو مەبەستانەی کە لە بابەتی دونیا و بوون و، دونیای ڕەسەن و ساختە و ، مرۆڤی ڕەسەن و ساختە و ڕەسەن، بوونی ڕەسەن و ساختە ، وە هەروەها ئەو کێشانەی کە باسمان کردن کە هەیە لە نێو ئەو بازنە و کایانە دا ، مەولەوی دەڵێت:**

## غەزەلەکەی مەولەوی :

**باعیس وجوود جە ماە تا ماهی**
**دەلیل ئیسبات سونع ئیلاهی**

**((چیاو)) بینابیم ، نوور چەمانم**
**سەرمایەی حەیات دین و ئیمانم**

**من وێم مەزانۆ بیٚ ئەمریم کەردەن**
**ئیتاعەی فەرمان عەبدیم نەبەردەن**

**عومرم سەراپا غەرق غەفڵەتەن**
**زاد ئاخرم بار ، خەجڵەتەن**

**بەڵام مشیۆ تۆ وە فەزڵەکەی وێت**
**کردەی من نەبۆ بەهانە پەرێت**





**ئیغماز کەی جە گرد نابەکاری من**
**جە ڕوو سیاەی و بەدکرداری من**

**پەی من کافیەن ئەی گرد ئینفیعال**
**بۆ بە ڕەحم وێت ، بکەرەم پاماڵ**

**مەدیە وە تۆمار کردەی ویەردەم**
**بدیە وە زەردی ڕووخسار ئاوەردەم**

**هەرچەند شایستەی عەفووت نەداروون**
**ڕووی شەرمندەگی وە دەرگات ماروون**

**جە بەحر کەرەم بیٚ بەشم مەکەر**
**شەڕ نەفسانی جە ڕاگەم لابەر**

**تا بە فەزڵ وێت بوانیمەوە**
**جە دەس هەوای نەفس بسانیمەوە**

**بەڵکم جەی ئاخر پەی وێم فکریٚ کەم**

**تەدارەك پەی چەند تەزبێح زکریٚ کەم**

**دواتر مەولەوی دێت و کۆمەڵێك گوتاری ئینسانی تێکەڵ بەو گفتوگۆیە دەکات لە گەڵ خوادا و تا ئاستێك بۆنی ئەو دونیا ڕەسەنەی لیٚ دێت کە مەحوی تیایدا بوونی ڕەسەن ژیاوە و دەڵێت :**

**بەڵام بە شەرتە چەنیم قبووڵ کەی**

**بەهانەی ئەسبابە عەفوم وسووڵ کەی**

**نەفس بەد کردار ، بیٚ دین بەد بەخت**

**شوم سەر گەردان خەیاڵات سەر سەخت**

**پەی چیش عادەتت جە ویرت شیەن**

**یادت پەی مەحبوب حەقیقی نیەن**





**موتن ئەسڵیت نە خاتر لوان**

**مێخ مۆبەتت نە ڕوی خاك کوان**

**دییم گرفتار ئارەزووی خامی**

**یەکسانەن پەرێت نێکی و بەدنامی**

**گا خەریك دەر هەوای مەجازی**

**گا مەشغووڵ کەسب کیبر و نیازی**

**گا غەرق هەوای وەسڵ نازاری**

**گا حیرت زەدەی ڕوخسار یاری**

**هیچ هۆشت نیەن حەق خەبەر دارەن**

**فەردا ڕۆی حیسا میزان کارەن**

دواتر دێت و ڕووی دەمی خۆی دەکاتە کۆ هەستی مرۆڤەکان
و بە شێوازی پلورالیزمی مرۆڤ گەرایی پەیامی خۆی
ئاراستەی هەمووان دەکات :

فکریٚ کەرەوە ، وادەی لواتەن
وەخت شێویای شەوق و سەوداتەن

باوەرە وە دەس زادیٚ پەی سەفەر
وێت نەو سەفەر دا بیٚ تۆشە مەکەر

وە دەرگای حەق بەر ڕووی پەشیمانی
عوزر ئاوەری کەر ، کردەی نادانی

بەڵ لیباس عەفو بکەرۆت خەڵات
جە وەخت مەردەن ، بدە ڕۆت نەجات

وە نسیوت بۆ سەرمایەی ئیمان
نەوی وە ڕێش خەند ، سوخریەی شەیتان

وە ڕۆی مەحەشەر دا بگێڵی دڵشاد
جە قەید عیسیان دڵت بۆ ئازاد





غەزەلەکەی حەزرەتی وەفایی پلەیەك بەرزتر دەبێت و زیاتر
و بە توانا تر ، مانا فەلسەفیەکەی بوون و دونیا و مرۆڤ
دەخاتە ڕوو ، کە ئەم غەزەلەی یەکێکە لەو غەزەلانەی کە
بەڕاستی خۆی لە جیٚ دڵی ئینسان دەکاتەوە ، ئەویش لەبەر
ئەوەی شێوە نوسین و ناوەڕۆکی غەزەلەکە ڕەهەندگەل و
مەغزای زۆر تەماوی جیٚ دەهێڵێت لە نێو فیکر و ئەندێشەی
هەڵبەت ئەم غەزەلە کەی دەیخوێنیتەوە وا دەزانی و هەست
دەکەیت کە بۆ یار وترابێت بەڵام ئەم غەزەلە فۆرمیە لە
ستراکتۆر دا یەکپارچە بریتیە لە غەم هەڵڕشتن بەرامبەر بە
بوون و داواکاریە لە بوونی ڕاستەقینە و ئاواتخواستنە بۆ
گەیشتن بە دونیای ڕەسەن کە ببێت بە بەشێك لە مرۆڤ دا :

حەریقی ئاوری دوریم، داغداری زوڵفی جانانە
ئەگەر بایێ لە لای قیبلەم نەییٚ حاڵم پەریشانە

تەسیمی صوبحدەم قوربانی تۆزی ڕێگاتم
غەریبم، بیٚ کەسم، ڕۆح و دڵم سووتاوی هیجرانە

**ئەمن وا لێرەکە و ڕۆحم لە خاکی پاکی بەتحا دا**
**حەیاتم بێنەوە ، ڕابرە ، بەو باغ و گوڵستانە**

**ئەگەر دەریایی ئاور بێ ، ئەگەر تۆفانی خوێن هەستێ**
**بە سۆز و گریەیی زارم ، بڵێ بەو ماهە تابانە**

**بە غەمزەی چاوەکەی مەستت هەموو جێ ی نەشتەرە جەرگم**
**بە موژکانی سیاهت قەلبم سەراسەر جێگە پەیکانە**

**بە تاری زوڵف و گوڵنناری، جەماڵی تۆ بە ڕۆژ و شەو**
**سەرم دەربەندی سەودایە، دڵم سەرگەرمی سووتانە**

**دڵم سەوداسەر و جانم (پر از) غەوغایە نازانم**
**نە داغی تاری زوڵفانە ، نە دەردی وردە خاڵانە**

**نە خاڵت ڕوحمی پێم دادێ ، نە حەڵقەی دائیرەی زوڵفت**
**عەجەب ماوم! دەڵێ ی دەوری فەرەنگی کافرستانە**





**بەشەوقی ڕووت حەڵقەی زوڵفەکەت دێ ئاه و ناڵەی دڵ**
**لە سوبحی کازیبەی شەو دا چریکەی مورغی خۆشخوانە**

**شەهیدی تیغی ئەبرۆتم بە جەزبەی خاڵەکەی چاوت**
**مەقامم قەوسەینە لە سایەی پیری مەیخانە**

**هەموو عالەم بە دیدارێکی تۆ ، قوربانی ئەبرۆتن**
**مەگەر تاقی ئەبرۆت ، قوربان ، هیلالی عیدی قوربانە**

**عیبادەت خانە بەرهەم بوو بە نەشئەی قیبلەکەی ئەبرۆت**
**لە سایەی چاوەکانت ماڵی کەعبەش بۆتە مەیخانە**

**بە ناز ڕووی کردە میحرابی برۆ ،موژگانی دەیفەرموو :**
**کە تۆ لوتفت هەبێ ، قوربان ، خەراباتیش موسوڵمانە**

**((وەفایی)) دەردی بێ دەرمانە ، بەو چاوانە نازانم**
**هیلاکی تۆیە ؟ یا نەخەستەجانی دەستی پیریانە ؟**

**سەرچاوەکان :**

(١) دیوانی مەحوی /مەلا عەبولکەریم موددەریس١٣٨٥/
چاپ سێیەم/انتشارات کردستان

(٢) غزلیات سعدی /تهیه و تنظیم .سایت فرهنگی
اجتماعی ,
خبر تربت جام ,ل ٣٥
Torbatjam.com

(٣ ) کلیان دیوان شمس/مؤسسەو انتشارات نگاه
/تەران ,١٣٧٨/ ص٥٣١





(*) عرفان و میراث روشنفکری دینی/سروش دباغ
/www.drsoroush.com/اۆر ١٣٨٩

(٤) فرەنگ لغات و اصتلاحات و تعبیرات عرفانی.د.سید
جعفر سجادی
,کتابخانە /طهوری,تهران/چاپ دوم ،١٣٥٤/ە.ش

(٥) سۆفیگەری/لە شیعری ئاینی و لە شیعرە کوردیەکانی
مەحویدا/
د.ئیبراهیم ئەحمەد شوان/چاپی یەکەم،هەولێر/٢٠٠١

(٦) عبدالکریم سروش/سایت
سروش/www.drsoroush.com

(٧)بوون لە شیعری مەحویدا/د.محمد ئەمین
عیبدوڵا/وردۆلۆجی /٢٠٠٨

()نداء الحقیقة/ مارتن هایدجر/ت.أ.د. عبدالغفار المکاوي،دار
الشرقیات
للنشر والتوزیع/القاهرة/٢٠٠٢/ص ١١٧-١١٦

(٨) موسوعە علوم فلسەفە /مجلد الپانی ،هیجل /ص ٢٦٢

(٩)سورین کیرکجارد/مۆسس الوجودیە المسیحیە / دار
المعرفە الجامعیە /د.علی عبدالمعگی
/سنە ١٩٨٥/ص١١٤

(١٠)الوجود و العدم/جان بول سارتر/عبدالرحمن بدوی/دار الأدب-بیروت/ط/١
سنه/ ١٩٦٦/ص :٧٠٤
(١١)کۆچ/ژمارە ١٤/ چاوپێکەوتن لەگەڵ د.ئیبراهیم ئەحمەد شوان/٢٠١١
(١٢) happiness is like the rainbow it comes suddenly , and before you can enjoy it – it disappears .
(١٣)کتابات أساسیه / الجزو الثاني / مارتن ڤیدجر(ما المینافیزیکا) ، تألیف/اسماعیل المصدق ، المجلس الاعلی للثقافة / طبعة ١ / س ٢٠٠٣ /ص٢٠
(١٤)دیوانی مەولوی/ عەبدولکریم موددەرریس /١٣٧٨ /کتابخانه ملی ایران/چپ تکراری
(١٥)دیوانی وەفایی /عەبولکەریم موددەرریس /چاپی تازە /١٣٩٠





# عیشق وەکو بکەرێك بۆ وێنا کردنی دونیا

**ئەگەر شەوقی جەماڵی تۆ نەبێ من مەست و حەیرانم**
**لەبەرچی بۆتە بولبول گوڵ ، چرا بۆچ بۆتە پەروانە**
**لە شەوقی تۆیە سەرمەستە ، بە زەوقی تۆیە پا بەستە**
**ئەگەر عاریف لە کەعبەیدا ، ئەگەر کافر لە بوتخانە**
**(حەزرەتی وەفایی)**

عیشق پلەی باڵای موحیبەتە ، ئەساسەن عیشق وەکو وجوود و ئیمکانیاتی ساتەوەختی پەیدابوونی لەو چرکەساتەدا دەبێت بە مومکین ،کە لەوانەیە پەیدا بوون یان

**دروستبوونی هیچ وجوودێکی دی لەو ساتە دا ئەگەری بە مومکین بوونی تێدا نەبێت ، واتا کە ئیشق دێت لە زەمەن و زۆن ناپرسێت ، عیشق کاری لەو دیو کات و شوێنەوەیە ، عیشق هەمیشە لە بۆشاییەکی نەزانراو و نەبینراو و هەستپێنەکراوە وە دەبێت بە بەشێك لە بوون، وە بۆ دەرکەوتنی ئەو جۆرە لەبوونی عیشقە بۆشایی پێویستە ، ئەو بۆشاییەی کە ئینسانەکان هەمیشە سەرقاڵی لێ هەڵهاتنین، ئەو بۆشاییە گشتگیرە ئینسانییەی کە دواجار ویستخوازیەکەی بۆ ماهیەتی عیشق دەگەڕێتەوە ،لە ڕاستیدا دووالیزمێکی پەیوەستبوی بەیەکی گرنگ هەیە لە نێوان عیشق و مرۆڤەکان دا، وە دواتر لە نێوان مرۆڤ و خودا ، واتا پەیوەندی نێوان عابید و مەعبود لە ڕێگەی عیشقەوە ، ئێوە نەی یان هەر ئامێرێکی میوزیکی ببینن بەڵام بەبێ ئەوەی کە پێشتر گوێ بیستی بوبن و کەمێك تێبڕوانن ، لە هیچ دۆخێکدا ناتوانن تێڕوانینتان بۆ ئەو دەنگە هەبێت کە ئەو ئامێرە میوزیکیە هەیەتی ،چونکە گوێ بیستی نەبوونە پێشتر، وە ئەوەی کە دەنگی نەی بۆ ئێوە دەگوازێتەوە ڕۆحە، وە ئەو ڕۆحەش مرۆڤە ، واتا مرۆڤی نەی ژەن، نەی بە بێ نەی ژەن ئامێرێکی تەواو بێ دەنگە ، کاتێك کە نەی بێ دەنگە شتێك نیە بە نێوی نەیەوە،چونکە ئەوەی کە نەی**





**دەکات بە ئامێرێکی میوزیکی دەنگە پڕ لە میوزیکیەکەیەتی، ئەو دەنگە پڕ لە میوزیکیەش لە هەناوی مرۆڤەوەیە ، هەروەها عیشقیش بە هەمان شێوەیە، مرۆڤێك پێش عاشق بوون چۆنەو دوای عاشق بوون چۆنە ، ئێوە هاوڕێیانی خۆتان ببینن و بزانن ئەوانەی کە عاشق نین چەنێك جیاوازن لەو هاوڕێیانەتان کە عاشقن، بەمەرجێك ئەو عیشقەی کە مرۆڤ دەگۆڕێت و دەیکات بەکەسێکی دی، واتا دەرکردنی مرۆڤەکە لە قاڵبی دەورانی مرۆڤگەلە تەقلیدیەکان و گەیشتنی مرۆڤەکە بە نەێنیە گەورەکانی عاشقی بوونی ئینسانەوە هەر وەکو مەولانا مەحوی دەفەرموێت :**

**دۆزەخ لە عیشق خاڵی یو جەننەت لە دەرد و داخ**
**عاشق لە حەشریشا نیەتی جێ دڵێ فەراغ**

**گەر عازیمی زیارەتی کەعبەی مەجەببەتی**
**ڕێ : چاکی دڵ : عەلامەتی ڕێ ، داغ و شوێنی داغ**

**عیشق ئاگرێکە بەر بووە هەر کەس دەبێ بە کەس**
**گەر ڕۆژە ڕەش وەکو شەوە بێ ، بوو بە شەو چراغ**

**<u>دواتر دەڵێت :</u>**

**دەستی حەنا نیگار و، مژە و چاوی سورمە دار**
**بۆ غەیر خان و خانمەفەندی نیە موساغ**

**هەر کۆششە بە کارە، ئەگەر چوبیە فەناش**
**دڵ بوو بە گەرد و عالەمی دامەن دەکا سۆراغ**

**هەر ئاهی عیشقە دەمی پێ بێتە پێکەنین**
**ئەم غونچە بەو نەسیمەیە ، بپشکوێ دەماغ**

**جۆبارە لالە زارە ، هەتا چاوی بڕ دەکا**
**((مەحوی)) بەهەشتی بۆ چیە ، چبکا لە ئاو و باغ**

**عیشق ئاگرە بەڵام بەبێ ئەوەی مرۆڤ بسوتێنێت ، وەکو مەولانا مەحوی فەرموی ئاگرێکە مرۆڤ دەکات بەکەس و کەسایەتیەکی جوانتری پێ دەبەخشێت، وە هەروەها**





**لایەنێکی تری عیشق و مرۆڤ ئەوەیە کە مرۆڤیش بکەرە لە مانا بە بەخشین بە عیشق، هەروەکو چۆن عیشق مانایەکی دی بە مرۆڤ دەبەخشێت، لە ڕاستیدا گرنگ نیە مانابەخشینی عیشق بە مرۆڤ خراپە یان چاك ، چونکە بەهەمان شێوە ئەوە مرۆڤە کە دەخوازێت مانایەك لە و دوو کونسێپتە لە خۆیدا بەرجەستە بکات ، دواجار کۆنسێپتی خراپە یان چاکە دوو کونسێپتن کە گروپەکان و تاکەکان ناویان دەنێن ،واتا ئەوەی کە من پێم خراپە مەرج نیە هەموو دونیا پێ ی خراپ بێت وە هەروەها پێچەوانەکەشی ڕاستە ،مەولانا مەحوی پێی وایە عیشق ڕزگار کەری مرۆڤەکانە لە دەست دونیای دەرەوەی مرۆڤەکانی تر، هەروەکو دەفەرموێت :**

**لە قاپی عیشقە دا وەك شاهە بەندە**
**لەسەر خوانە چ مەتبوع و چ تابیع**

**<u>یان</u>**

**دڵ لە ئیدراکی حەقیقەت بێ بەشە ،بێ داغی عیشق**
**مەحویا ، دانا دەبێت بەم چاوە دانایی بکا**

**یان**

**دەزانم بادیەی عیشقە خەتەرناك**

**کەچی هەر چووم ، ئەگەر مام و ئەگەر چووم**

گرنگە بۆ هەریەکێك لە ئێمە لە مانا قوڵە ئەدەبیەکەی عیشق تێبگەین ، عیشق هەموو ساتیّ هەیەو لە ناوماندایە ، ئەوە عیشقە دەیەوێت دونیایەك وێنا بکات بە بیّ مادیەت ، دونیایەك لێوانلێو لە مەعنەویەت ، مەعنەویەتێك کە وای پێویستە کۆی مرۆڤەکان ئالودە بە موحیبەت بکات ، هەر لەبەر ئەمەشە کە پێمان وایە عیشق پلەی باڵای موحیبەتە ، وە پێویستە ئەوە دەربخەین کە عیشق پێوەرێکیشە لە ماناکانی مرۆڤ بوون ، یاخود یەکێکە لەو پێوەرانەی کە مرۆڤێك لە نا مرۆڤێك جیا دەکاتەوە ،موحیبەت دۆستی و دڵداری کردن لەگەڵ موحیبەت دا مرۆڤی عاشق دروست دەکات، ڕەنگە بەشێك لە ئێمە عیشق وا تێگەیشتبین کە کۆی کردەی عیشق بریتیە لە خۆشەویستی کچێك یان کۆکردنەوەی هەموو عیشق لە نێوان عابید و مەعبود دا، ئەگەر بە پیّ ی ئەو تێڕوانینە بێت، ئەوا دەبێت ئێمە دەسبەرداری ڕەهەندەکانی تر بین بۆ خوێندنەوەی مانا





شاردراوەکانی عیشق خۆی ، لە ڕاستیدا عیشق واتا نەدۆڕاندنی شتە جوانەکانی دونیا، وە شتە جوانەکانی ئەودیو دونیا حەزرەتی وەفایی لە بارەی ئەو مانا تێکەڵاوانەی عیشق و کۆنێکتی هەردوو جۆرەکەی عیشق دا لە پێنج خشتەکیەك دا دەیخاتە ڕوو کە من لێرە هەموییم نوسیوەتەوە، چونکە هەمووی ئیرتیباتێکی مەعنەوی پێکەوە هەیە و دەڵێن گوایە بەچەند مانگێك پێش وەفاتی وتوویەتی و تێیدا دەڵێت :

**تاییێکی ڕیشەیی دڵ بە نوکی غەمزە دا**
**دەستێکی بۆ سەما برد و ڕووبەندی ماهی لادا**
**نافەی گوڵی بەدەرکەوت عەتری بەدەم سەبا دا**
**باریك و لووس وناسك وەك زوڵفی خاوی بادا**
**وەك شاخی گوڵ بەلادا ، شیرین تەشی دەڕێسیّ**

**نووکی تەشی بە گەردووش چەرخێکی قوتبی پێوە**
**مەجەڕڕە بوو بە داوی کە چەرخی کەوت نێوە**
**وەك زوەرە دەستی کێشا کە بەندی قەوسی زێوە**
**ئەستێرە ماەی داگرت سابت گەڕا بە پێوە**
**عەرەق بە ڕوو بە ڕێوە ، شیرین تەشی دەڕێسیّ**

**لە بانی عارەقی ڕشت لە پێکەنینی زاری**
**بەخەندە غونچە گوڵ بوو گوڵاوی لێ دەباری**
**وتم : بفەرمووە سەر دوو چاوی من بە یاری**
**بە چاوی من ببینن تەلیسمی سیحرکاری**
**  کە سەروی جۆیباری ، شیرین تەشی دەڕێسێ**

**کە دەستی برد و هێنا بە دڵبەری بە تا دا**
**هێنایە چەرخ و گێڕای بە ڕانی سافیدا دا**
**عەیان بوو پەنجەیی ڕۆژ ، بە خەتتی ئیستیوا دا**
**بە سوبحی سادق ئەنگوت زەنەب لە نێو سەما دا**
**  حیرەت لە ماسیوا دا ، شیرین تەشی دەڕێسێ**

**کە کەوتە چەرخ و گەردش تەشی بە دەیتی ڕەنگین**
**هەودای لە لێو و دەمدا خورشیدی سینەی نەسرین**
**سەمای بە زوو زەنب دا (کف الخچیب) ی شیرین**
**گرتی خەتتی مەداران شەفەق بە عیقدی پەروین**
**  سیحرێکە بۆ دڵ و دین ، شیرین تەشی دەڕێسێ**





**دوو زوڵفی چین بە چین کرد ، کە نافەیی خەتایە**
**دوو مەمکی خستە سەر لۆق ، هەناری دڵ گوشایە**
**بەخەندە چەرخێکی دا ، کە شەوق و نەشئە وایە**
**بە نوکتە پێ ی نیشان دام سەما لەسەر هەوایە**
**  هەموو ئیشارە وایە ، شیرین تەشی دەڕێسێ**

**بە عیشوە زوڵفی لادا ، لە سەر عیزار و زاری**
**دوگمەی کراسی ترازا ، بزووت هەوای بەهاری**
**کە شەو بەیانی بەردا گوڵ و وەنەوشە باری**
**سەڵای بە عاشقان دا ، باغی گوڵ و هەناری**
**  دونیایەک ئینتیزاری ، شیرین تەشی دەڕێسێ**

**کە زوڵفی کەوتە سەر ڕوو هەموو خەتای بە چین دا**
**خەرامی تاووسانەی بەسەرروی نازەنین دا**
**سفیدەیی بەیانی بە باغی یاسەمین دا**
**فەنایی پڕ بەقا بوو دەمی لە پێکەنین دا**
**  سەد ئافەتی لە دین دا ، شیرین تەشی دەڕێسێ**

**سمی غەزاڵەیی چین لە نافەدا عەیانە**

**دەڵەی لە نیوەشەو دا سفیدەیی بەیانە**

**قەدی گوڵ و دەمی گوڵ ئەمەی کە قووتی جانە**

**لە باغی یاسەمیندا شکۆفەیی گوڵانە**

**بەهاری بێ خەزانە ، شیرین تەشی دەڕێسێ**

**لەم شیعرەی وەفاییەوە دەکرێت بڵێین عیشق بریتییە لە کۆمەڵێك پرانسیپ و بەهای بەرز کە مرۆڤ شێوەکان دەگۆڕێت بۆ مرۆڤ ماهیەت و مرۆڤ ناوەڕۆکە کان ، بەڵام کۆی بڕواو و بۆچونەکانی منیش ئەوەیە کە عاشق بوونی ئاسۆیی بە مەعشوق ی هاو مانا لە جەستەو عاشبوونی ستونی نێوان عابید و مەعبوود بەشێکە لە مانا فراوانەکەی عیشق ، کە دەکرێت زیاتر لەسەری بدوێین ، سەرەتای خاڵی بونبەستی عاشقبوونی نێر بە مێ یەك لە مرۆڤ یان مێ بە نێرێك لە مرۆڤ ئەمە جۆرێکە لە عیشقی حەقیقی ، وە دەکرێت دواتر لە سەر عیشقی مەجازیش قسە بکەین کە لە لای عاریفان دەگات بە بونبەست لە گەڵ خودا ، ئێمە کە دەڵێین عیشقی حەقیقی مەبەستمان لەم دەستەواژیە (( حەقیقەتی عیشقە ))، حەقیقەتی عیشق واتا ڕاستەقینەیی لە**





**عیشق دا ، ڕونتر بڵێم حەقیقەتی عیشق مانایەکە سەرتاپا دژ بە عیشقی تەزویرە ، لە ڕاستیدا شتێك نیە بە ناوی عیشقی تەزویرەوە ، بەڵام بەکارەێنانی ئەم چەمکە بۆ حاڵی بونە لەو حاڵەتانەی کە لە عیشق ناچن ، یان بگرە لەو حاڵەتانەی تەنانەت لە موحیبەتیش ناچن ، چونکە عیشقی حەقیقی سەرەتا بە نێو جومگە ئازارە ئینسانیەکان دا گوزەر دەکات و دواجار تێپەڕبوونی ئەم عیشقە حەقیقیە بە نێو ئەو ئازارە ئینسانیانە دا بۆ گەیشتنە بە هێمنی و ئارامگرتنێکی جاویدانی .**

**مەولەی لە یەکێك لە شاکارە هەرە جوانەکانی لەم بارەیەوە پێمان دەڵێت :**

**هام دەردان ئێشێ ، هام دەردان ئێشێ**

**پێمەوەن ئێشێ ، چ تەرزە ئێشێ**

**ئێشێ پێچ چوون ئێش وە ماران ڕێشێ**

**ئێشێ پڕ نێشێ ، ڕیشەی گیان کێشێ**

**چ ڕێشێ ، ئەسەر مەودای خەدەنگێ**

**ڕەهای شەست تیر ، شەنگێ ، قەشەنگێ**

**ڕەعنا غەزاڵێ ، باڵا شمشاڵێ**
**ساحێب کەماڵێ ، گەرد دڵ ماڵێ**

**لەیل ئاسا نازێ ، شیرین جەماڵێ**
**مەجنون نیازێ ، فەرهاد ئەحواڵێ**

**پەروانە سازش ، شەم سا سۆزشێ**
**گوڵ ئەندام نازش ، بەهرام شۆڕشێ**

**خورشید ئەتوارێ ، نیلوفەر زەوقێ**
**عەزرا عوزارێ ، وامیقی شەوقێ**

**پەری پەیکەرێ ، پای دڵ پەی کەرێ**
**خەم دەر ، خەم بەرێ ، دڵ دەر دڵ بەرێ**

**عەرەق چین نە تۆی سورمە دا غەرقێ**
**وە فەرق فەرقێ ، با زەوق و بەرقێ**





**سەر وە دەسماڵێ ، گەردن پڕ خاڵێ**
**دەس بازنە لاڵێ ، پاوە خڕخاڵێ**

**پیشانی ماهێ ، ئاەوو نیگاهێ**
**گیسو سیاهێ ، دڵ مەنزڵگاهێ**

**دواجار مەولەوی دێت و هەر ئەم غەزەلە تەواو دەکات و پەڵام ئیدی بە کۆنکرێتی لە فۆرم و ستارکچەرێکی دی دێ و زیاتر و قوڵتر ڕازی دڵی خۆی دەردەبڕێت :**

**ڕوخساری زوڵف ، سوبح و ڕەواحێ**
**دیدەو و نیگا ، پییاڵە و ڕاحێ**

**ئەبرۆ  موژگانێ ، تیر و کەوانێ**
**سەد پەری نیشان ، پەرێ نیشانێ**

**نەشئە دەر دەمیٚ ، بەزم ئارای جەمیٚ**
**عەنبەر پەرچەمیٚ ، پەرچەم وەخەمیٚ**

**شەکەر زوبانیٚ ، غونچە دەءانیٚ**
**لوولوو ددانیٚ ، لەب لەعلٚ کانیٚ**

**پەنجە خامەیٚ ، دڵان نامەیٚ**
**رەقەم رەویەی سەر ، عەشق عەلامەیٚ**

**تینەت نەزیفیٚ ، زینەت زەریفیٚ**
**خەڵقی لەتیفیٚ ، خوڵقی شەریفیٚ**

**میەری بەهاریٚ ، قەەری خەریفیٚ**
**بەشیر ڕەدیفیٚ ، نەزیر حەریفیٚ**

**شاهین کرداریٚ ، تەڕلان تەواریٚ**
**ژەرەژ ڕەفتاریٚ ، تووتی گوفتاریٚ**





**شابازیٚ ، شازیٚ ، شاهان مومتازیٚ**
**شاهیدی شۆریٚ ، شۆڕو شەڕسازیٚ**

**پەنەانی گەنجیٚ ، عەیانی ڕەنجیٚ**
**سەد عیشوە سەنجیٚ ، پڕ لارە و لەنجیٚ**

**ئاشنا بۆییٚ ، بێگانە خۆییٚ**
**بەهانە جۆییٚ ، بەها نە جۆییٚ**

**نزیکی ڕادییٚ ، نووری سەفاییٚ**
**دەیجوری وەحشیٚ ، دووری جەفاییٚ**

**سەروی تەزەرویٚ ، گوڵی بولبوڵیٚ**
**خوتەن وەتەنیٚ ، لە سایەی سڵیٚ**

**شیرینیٚ ، تەڵخیٚ ، خوشکیٚ پڕ نمیٚ**
**غوڕڕەییٚ ، سەڵخیٚ سروریٚ ، خەمیٚ**

**حۆری سروشتێ ، قەسری بەهەشتێ**

**زوڵف و زەنناریێ ، دەیری کەنشتێ**

**خەیاڵ پەشێویٚ ، عاقڵان شێویٚ**

**شێوە باگرد چێو ، پاك جە گرد چێویٚ**

**پاکێجی کۆتاییدا زۆر بە جوانی ئازار تەوزیف دەکات لە نێو دونیای عاشقەکان و تەنانەن عاشقە باوەکانیش تا ڕادەیەك ئەو ئازارەیان هەیە بەڵام بە پێوەرەیە نا کە عاشقە ڕاستەقینەکان هەیانە :**

**هەر ئێشیٚ ، جە نێش تیر ئەو کەسەن**

**نە جای نەشئەی نۆش (نشأتین) وەسەن**

**سەردا وە هەم دا، تان و پۆی جەرگم**

**نمانا مەحشەر، غەرغەرەی مەرگم**

**باز دێم وەی زامەت، وەی ئەندامەوە**

**بەڵ بەیان وە شۆن، باز بێزامەوە**





**ئازار هەمیشە لە عیشقی حەقیقی ئینسانەکان دا هەستپێکراوە، مرۆڤە ڕاستەقینەکان کە عاشق دەبن ئیدی لە ساتەوەختی عاشقبونیانەوە دەبێت بونەوەرێك بن ئازار بچێژن و وە دەبێت وەفا دار بن بەرامبەر بە هەڵگرتنی ئەو بەها گەورەیەی کە ناوی عیشقە ، ئەوەی گرنگە و دەبێت بیزانین ئەوەیە کە ئەمجۆرە لە ئازاری عیشق جیاوازە لە جۆرێکی تر لە ئازار ، چونکە ئازاری عیشق ئازارێکی مەعنەویە و ئازارێکی مادی یان بەرجەستەیی نیە ، وە لە نێو ئازارە مەعنەویەکانیشدا ئازاری عیشق جیاوازە لە جۆرەکانی تر لە ئێش و ئازاری مەعنەوی ، چونکە ئەوەی کە سەرەنج ڕاکێشەرە لە ئێش و ئازاری عیشق ئەوەیە کە ئەم جۆرە لە ئازارە چێژ بەخشە ، واتا عیشق ئازار بەخشە بە ئینسان بەڵام لە هەمان کات دا چێژ بەخشیشە ، هەریەکێك لە ئێمە بگریت توشی سەر ئێشە هاتوە ، وە هەمیشەش ویستومانە بە زووترین کات چارەسەری خۆمان بکەین ، بۆیە پەنامان بردۆتە بەر پزیشکی پسپۆر لەو بوارە ، چونکێ بەردەوامبونی ئەم ئازارە بەرجەستەییە تاکۆتایی ناتوانین**

**خۆڕاگر بین لە ئاستیدا، بەڵام ئەم ئەم ئازارە بەرجەستەییە پێوەر نیە بۆ ئازارێکی مەعنەوی وەکو عیشق ، چونکە عیشق بە ئازارەوە عیشقە ، هەروەکو مەولانای ڕۆمی دەفەرموێت :**

**صبر مرا اینه بیماریست**
**اینه عاشق غمخواریست**

**عیشق ئەو ئازارەیە ، کە دەکرێت بە عیشق خۆی بوترێت ئازار ، چونکە عیشق وێنەی ئازارمان بۆ دەکێشێت بە سەر ڕوی مرۆڤە عاشقەکانەوە ،نیچە لە شوێنێکدا گوتبوی : چارەسەری عیشق تەنها عیشقی بەرامبەرە ،بۆیە دەکرێت ئێمەش بڵێین  چارسەری عیشق وەکو چارەسەری سەر ئێشە ناکرێت کە لەسەروتر باسمانکرد، لەبەر ئەوەی ئەگە دکتۆرێك هەبێت بە نێوە دکتۆری نەخۆشیەکانی مێشك ، بەڵامەکیٚ دکتۆرێك شك نابەین بە نێوی دکتۆری چارەسەیەکانی عیشق ، وەهەروەها دکتۆر پسپۆری هەیە بە ناوی ، دکتۆری پسپۆری نەخۆشیەکانی دڵ ، بەڵام تەعبیری ئەم دکتۆرە بۆ چارەسەر کردن ، تەنها تایبەتە بۆ چارەسەریە مادیەکان ، یان چارەسەرە جەستەییەکان ،**





**ئەویش بە سەرنجدان لە هات و چۆی خوێن و هەروەها چۆنیەتی پێوانی ڕاژەی لێدانی دڵ لە خولەکێکدا ،بەڵام ئەم دکتۆرە ناتوانێت دیوی شاراوەی پشت ئەم نەخۆشیە ڕوون بکاتەوە و زیاتر لە بابەتە ڕۆحیەکان تێبفکرێت و بتوانێت ئیش لەسەر ڕەهەندەکانی تری ناوەوەی دڵ بکات ، وە هەروەها پسپۆری نەخۆشیە دەرونیەکانیش بەهەمان شێوەن ، چونکە ناتوانن تا قوڵایی ئۆرگانە ڕۆحیەکان ڕۆبچن ، ئەمەش وامان لێدەکات کە گومان بکەین لەوەی کە عیشق زیاتر لە شوناسێك و مەبەستێکی هەیە، زیاتر لە پەیامێکی هەڵگرتوە بۆ مرۆڤایەتی ، بۆیە دەکرێت ئێمەش زیاتر لە خوێندنەوەیەك بۆ ئەم بابەتە بکەین، وەیان دەکرێت خوێندنەوەیەکی باڵای بۆ بکەین ، واتا خوێندنەوەیەك کە دواجار هەم دووربین لە بابەتە گشتگیریەکان و هەم خۆشمان بە دوور بگرین لە بابەتە جوزئیەکان ،بەڵام گرنگە لەوەش تێبگەین کە ئازاری عیشق هەمیشەگی نیە ، چونکە وەکو وتمان ئازار چەشتنی عیشق بۆ گەیشتنە بە ئاسودەگی و قەرار گرتن، مەولانا مەحوی دەربارەی ئەم ئازارەی عیشقە دەفەرموێت : وەختی شایی و شادیە چونکە غەم زۆری هێناوە و گەیشتۆتە ئەوپەڕی ، هەرشتێکیش گەیشتە ڕادەی ئەوپەڕی ئەوا نیشانەی تەواو بونیەتی و دەبیٚ چاوەڕوانی**

**تەواو بوونی بکریَ و وە ئەمەی مەولانا مەحوی ئەیلێت شتێکی تەواو زانستیانەو ڕاستە :**

**تەڕەب کەن شوکر زۆری هێناوە غەم**

**( توقع زوالا اذا قیل تم )**

**عیشق دەبێت حیسابی دووپشکە یان هەر جانەوەرێکی خاوەن چزوی بۆ بکەین ، سەرەتا دەبێت چزوەکەی دەربهێنین و بابەتەکە ڕام بکەین تا کۆتایی داوەکەو دۆزینەوەی سەرە داوەکە، هەڵبەتە بۆ تێگەیشتن لە عیشقی حەقیقی نێوان ئینسانەکان جگە لە زانستی مەعریفەت ناسی،زانستی ڕۆح ناسی پێویستە، ئێوە ببینن کاتێك کوڕێك عاشق بە کچێك ئەبێت ئەکەوێتە چ دۆخێکەوە ، ئەزانن هەموو دونیا بسوتێت گرنگ نیە بۆ ئەو ، هەموو دونیاش ببێت بە بەهەشتێکی چاوەڕوان نەکراو بۆ ئەو هەر گرنگ نیە،سەعدی گەورە جوان ئەفەرموێت :**





**اگر عداوت و جنگست در میان عرب**

**میان لیلی و مجنون محبتست و صفاست**

**ئەمە وا دەکات کە ئێمە لە مانایەك زیاتر بۆ عیشق بگەڕێین ، ئێوە ببینن کەسی عاشق دین نازانێت، مەسیحی بوون یان ئیسلام بوون یان یەهودی بوون ... هتد ، ناناسێت ، ئەوەی بۆ ئەو گرنگە مەعشوقەکەیەتی ، ئەم مانایە بۆ عاشقێکی حەقیقی ئینسانی تەواو ڕاستە ، کە مرۆڤێك بە مەعشوقەکەی ناگات ئیدی مەیخانەکان دەبن بە ماڵی هەیشەیی ئەو ئینسانە ، واتا عیشق ، عیشقەو هیچیتر ، تەنها تەعبیر لە خۆی دەکات ، سەبارەت بەم تێڕوانینەش ، ئەبو سەعید ئەبولخیر دەڵێت :**

**عاشق به یقین دان که مسلمان نبود**

**در مذهب عشق کفر و ایمان نبود**

**در عشق دل و عقل و تن و جان نبود**

**هر کس که چنین باشد نادان نبود**

وە دەکرێت ئەوەش بڵێین، کاتێك کە عیشق، عیشقەو هیچی
تر، کەواتە مرۆڤی عاشقیش، مرۆڤی عاشقەو هیچی تر،
چونکە مانای یەکەم سەرچاوەی مانای دووهەمە، ئەوە
عیشقە کە مرۆڤ دەکات بە ، مرۆڤێکی عاشق وە ئەگەرنا
مرۆڤ بە بێ وشەی عیشق تەنها مرۆڤەو هیچی تر .
بەشی دووهەمی ئەم بابەتی عیشقە تایبەتە بە عیشقی
مەجازی ، ئەم عیشقە زیاتر لە لای شاعیرە عاریفەکان دا
هەست پێ دەکرێت ، بۆ نمونە شاعیرانە وەکو ، مەولانا
رومی ، مەولانا مەحوی ، حافز و شێخی سعدی و خەیام و
بابا تاهیر و .... هتد .
عیشقی مەجازی واتا دۆزینەوەی خود و تێکەڵ کردنی خود
لەگەڵ خودا دا ، بە تێکەڵکردنی ئەو خودەش لە گەڵ خودا،
مەجاز دروست دەبێت ، خۆی لە ڕاستیدا ئەسڵی ئەم وشەیە
واتا ڕاڕەو یان ڕێگە ، بەڵام لە فەرهەنگی سۆفیزم دا
بەمەبەستی بە شتگەل چواندن بەکار دێت ، بۆ نمونە
مەولانا مەحوی لە پاڵ بەیتە شیعرێکی موعەمما دا
وێنەیەکی تەواو لە عیشقی مەجازی دەخانە ڕوو کە
ئەفەرموێت :





**کە دولبەر لێوی لەعل و مەهی ڕوخساری هوەیدا بێ**
**دەبێت سەرگەشتە بێت بولبول،مەسیحا ڕەنگی سەودا بێ**

ئەم بەیتە شیعرە موعەممایە ، بەڵام ئاخۆ دەبێت بۆچی
وترابێت ، ئەڵبەتە ئەم بەیتە شیعرەی مەولانا مەحوی بۆ
خودا وتراوە و بەپێ ی لێکدانەوە موعەممایەکەشی ناوی
(الله) ی دەرکردوە ، ئەویش بە :
(لێو ) واتە قەراغ ، قەراغی (لەعل) یش هەردوو (لام = م )
ەکەیەتی ، مەهی ڕوخساریش بریتیە لە (ە) کەشێوە وەکو
مانگ خرە ، وە بوبولیش کە سەری لێ بشێوێت پێ ی
دەوترێت (هوزار ) بەڵام بە ڕێنوسە فارسیەکەی ( هزار ) ە
،هزاریش واتە (الف ) بە عەرەبی ، کە ئەلف لە زمانی
عەرەبی دا لە شێوەی ( أ ) دا دەنوسرێت ، مەسیحاش کە
ڕەنگی سەودایی بگرێ ئەوا زەرد هەڵدەگەڕێ ، زەردیش
نیشانەی لاوازیە ، لاوازیش واتە باریك ، باریکیش باڵای لە
شێوەی ( أ ) ە ، وا بەم جۆرە تیپی ( ئەلف ) دووجار و تیپی
لام دووجار و تیپی هێمان جارێك دەسگیر بوو ، ئەم
تیپانەش تێکڕا وشەی ( الله ) یان لێ پێك دێت .ئەم بەیتە
شیعرە موعەممایە و لە هەمان کاتدا مەجازیە هێمایە بۆ

**عیشقێکی حەقیقی بەڵام لە فۆرمێکی مەجازیدا ، لە ڕاستیدا بە دەربڕینی  شیعری شاعیرە عاریفەکان دەوترێت عیشقی مەجازی ، مەبەست لە مەجاز لە فۆرمی شیعرەکە دا یە نەك لە ناوەڕۆك دا،وە لەم شیعرە کە دوو بەیتی ترمان وە دەست کەوتووە و پارچەکانی تری دیار نین و نە دۆزراونەتەوە ،بەڵام لە بەیتی شەشەم و حەوتەم  دا ناوی  ئیمامی عەلی لە بەیتی شەشەم و ناوی یارەکەشی دەهێنێت لە بەیتی حەوتەم دا ، وەکو وتم ، تەنا سێ بەیتی نوسخەکەی ماوە ، ئەویش بە پشتڕاستکرنەوەی مامۆستا ی موددەریس،بەهەمان شێوە ئەو دوو بەیتەی تریش شێوەی موعەمما یە،دەڵێت:**

**ئەوا گوڵ وەختی ڕۆینییە ، دەبێ شیوەن بکا بولبول**
**ئەمە سەر مەشقە ، هەر عەیشێ سەرەنجامی دەبێ وابێ**

**نەوەك بشکێ بەدەم بێگانەوە ، ((مەحوی)) صەد ئامانت**
**کە ناوی ئاشنا هەر گەوهەری دورجی مەعەمما بێ**





**هەڵبەت ئەوە لێکدانەوەی بەیتی شەشەمیەتی کە موعەممایە کە بەناوی عەلیەوەیە و بەمجۆرەیە :**

**ئەوا گوڵ وەختی ڕۆینییە ، دەبێ شیوەن بکا بولبول**
**ئەمە سەرمەشقە ، هەر عەیشێ ، سەرەنجامی دەبێ وابێ**

**واتە : ڕۆیشتنی گوڵ دوایی هاتنیەتی ، (دوایی هاتنیشی) وەرگرتنی دوا پیتیەتی کە (لام =ل ) ە کەیەتی ، ئەمەیش کە سەرەنجامی هەموو (عەیش = عیش ) ێکیش هەروایە ، ئەوەتە کە هەموو عەیشێك خۆ کۆتایی و دوایی دێت ، کۆتاییەکەشی کە (شین=ش) ە کەیەتی نامێنێ و (عەین=ع) و (یێ = ی) وشەی (علی) مان پێکەێناوە ، لە ڕاستیدا ئافەرین بۆ مامۆستا موددەریس بۆ ڕوونکردنەوەی ئەم بەیتە موعەممایە بۆ ئێمە و هەروەها خوێنەری ئازیزیش .**

**لە بەیتی حەوتەم و کۆتایی دا عیشقێك دەردەکەوێت کە مەحوی هەیبوە بۆ یار ، واتا یاری ەاو ڕەگەز و مرۆۋ کە ناوی گەوهەر بووە :**

**نەوەك بشکێ بە دەم بێگانەوە ، ((مەحوی)) صەد ئامانت**
**کە ناوی ئاشنا هەر گەوهەری دورجی موعەمما بێ**

واتە : (یار) بە حیسابی حروفی ئەبجەد دەكاتە (٢١١) ، (گەوهەر) یش بە شێوەی فارسی ئامێزی نوسینی جاران واتە (گوهر) كە دەكاتە (٢٣١) ، ئەگەر ناوی (گەوهەر) دەركەویٚ و بكەوێتە دەمی بێگانەوە ، یەكەمجار دانی پیا دەنێین (گاف = گ ) ەكەی دەشكیٚ و ( هر ) ەكەی دەمێنێتەوە ، كە ئەویش (یار) ە ، یاریش بە حیسابی حوروفی ئەبجەد دەكاتە ، (٢١١) و ، وا دەردەكویٚ كە یاری مەحوی ((گەوهەر)) ی ناو بووە .

هەر لەبەر ئەوەشە كە پیٚ ی دەوترێت عیشقی مەجازی لەبەر ئەوەی مەجازیە لە فۆرم دا ، بەڵام دەربڕینی عیشقەكە لە ناوەڕۆك دا تەواو عیشقێكی حەقیقی یە ،ئازار چەشتن بەهۆی عیشقەوە لە لای شاعیرە عاریفەكان هەمیشە بوونی هەبوە، بەهەمان شێوە ئەم ئازار چەشتنە بۆ نەهێشتنی ئازار بوە ، واتە لە لای عاریفانیش عیشق ئازارێكە كە ئازار لا ئەبات، ئەوەتا مەحوی گەورە ئەفەرموێت :

**سوتانی بە بیٚ دەنگیە ئادابی مەحەببەت**
**وەك بولبول ئەم ئەفغانە بە پەروانە حەرامە**

---





**من پادشاهی عیشقم و ، هەر داغی جونونم**
**تاجی سەرە ، باقی لە دیٚوانە حەرامە**

لە دوو نیوە بەیتی كۆتاییدا مەولانا مەحوی دەیەوێت پێمان بڵێت ئەگەر كەسێك بە بێدەنگی گڕی گرت و سوتا، ئەوا دەبێتە جێنشینی مەملەكەتی موحیبەت ، هەركەسێكیش جێنشینی مەملەكەتی موحیبەت بێت ئەوا بە دڵنیاییەوە پادشای عیشقە ، وە كەسێكیش پادشای عیشق بوو وەكو فەرهاد و مەجنون تاجی شێتی لەسەر ناوە، بە بڕوای مەولانا مەحوی ئەگەر كەسێك بە هۆی عیشقەوە تاجی شێتی لەسەر بنێت ئەوا ئەو كەسە پادشای مەملەكەتی عیشقە ، حەزرەتی وەفایی جوانی وتووە :

شەو لە خەودا بووم دڵ چرا بوو جان چراغ
ئەی لەبەر عەیشی شەوی دی جان چرا جانان چراغ

گەه فریشتە ، گەه پەری ، گەه حۆری عین گاهیٚ مەلەك
گەه قەمەر ، گەه موشتەری ، گەه ڕۆژ گەهیٚ ڕەخشان چراغ

**ڕەنگ بە ڕەنگ زوڵفی درەوشان دەم بە دەم ڕووی خۆی نواند**
**چل چرا یا شەو چرا بوو ، یا بە سەد ڕەنگان چراغ**

**ڕووی لە تاتا زوڵفی دەرخست هاتە سەر ڕوی مەرحەمەت**
**نەبەهار بوو ، شەو بەهار بوو ، واکە داییسان چراغ**

**ڕوو لە حەڵقەی تاری زوڵفان دەم لە فرقەی پێکەنین**
**وەك لە كن كانی حەیاتیٚ ، شەو هەزار تابان چراغ**

**ڕەونەقی حەوت ئاسمان و زینەتی ڕوویی زەمین**
**هەروەکو بۆ شانشین و مەنزڵی شاهان چراغ**

**تابی سونبول ، تابشی گوڵ ، نیم نیگاهی چاو خومار**
**نەشئە بەخشا ، جان فزا ، وەك شەو لە مەیخانان چراغ**

**عەكسی ڕووی ئارایشی زوڵف و خەت و خاڵان دەدا**
**وەك گوڵشەن گوڵ چرا بیٚ ، سونبول و ڕەیحان چراغ**





**شەوقی دامیٚ ڕووی دەمن كرد ، دیم شەوم لیٚ بۆتە ڕۆژ**
**من دەسوتام،من عەجەب مام!من چرابووم یان چراغ ؟!**

**دڵ لە لاییٚ ، تەن لە لاییٚ ، وەك نەیستان ئاوری گرت**
**مەسجید و دەبر و كڵێسا ماوە پڕ تابان چراغ**

**دار و بەرد وەك من دەسوتا ، دەر نەما ئەیوان نەما**
**زاهیر و باتین چرا بوو ، دەر چرا ئەیوان چراغ**

**زوڵفی تۆ و ڕوخساری تۆیە ؟ یا شەوم ڕۆژی ویساڵ**
**ڕوویی تۆ و باڵایی تۆیە ؟ یا لە سەروستا چراغ**

**من ئەوا مەست و نەزان بووم ، بۆ لە داغی باغی ڕووت:**
**گوڵ وەكوو بولبول دەسوتا تەرزی پەروانان چراغ**

**ناگەهان دڵبەر نەهان بوو، بوو بە ڕۆژی ڕەستەخێز**
**كەف زەنان مەیخوارە ، وێران مەیكەدە ، گریان چراغ**

**شەعشەعەی خورشید نیهان بوو ، لالْ و کەڕ بوو نیلۆفەر**
**مات و خامۆش ما ((وەفایی)) وەك سەحەرگاهان چراغ**

## عیشق لە لای مەحوی :

**بۆ ئەوەی بزانین بە مانا قولْ  و ئەدەبیەکەی عیشق بریتیە لە چی و عیشق چیە و مانا و ڕەهەندە جیاوازەکانی چین ، وە بە تایبەت دەکرێت بڵێین کە عیشق لە ژیانی کەسەکان دا چۆن ڕەنگی داوەتەوە . وا پێویست دەکات کە بگەڕێینەوە بۆ تیورەکانی ئەفلاتوونی ئەسینایی لە بارەی عیشقەوە ،وە بۆ ئەویش کە بتوانین لە ڕێگەی ئەو تێکستانەی ئەفلاتوون لە بارەی عیشقەوە بچینە سەر عیشق لەلای مەحوی و عیشق لە نێو شیعرەکانی مەحوی حەزرەت دا ، ئەگەر بگەڕێینەوە بۆ سەر بیرو بۆچونەکانی ئەفلاتوون دەربارەی عیشق ، ئەفلاتوون پیێ ی وایە هیچ شتێك لە دونیا دا لە عیشق پیرۆز تر و جوانتر و بە سود و خێرو بەرەکەت تر نیە بۆ مرۆڤ و ئەوە عیشقە کە تەنها و بە بێ خەوش سود و قازانج بە مرۆڤ دەبەخشێت ، هەڵبەت ئەوەش لەو کاتەدا ئەو تیورەی**





**دەخاتە سەر کاغەز ، کاتێك کە ئەو عاشقە ، هەڵبەت دەبێت مەعشوقێکی شایستە بە کەسایەتی خۆی بدۆزێتەوە ، چونکی ئەگەر کەسێك نەبێت عاشقی کێ بێت ، وە ئەگەر کەسێك نەبێت عاشقی و مەعشوقی بکات ، ئیدی عیشق لەو نێوەندە دا هیچ مانایەکی نیە ، ئەوە مرۆڤەکانن کە مانا و شێوە بە عیشق دەبەخشن ، واتا مانا و شێوەی مەعنەوی ، وە سودەکەشی هەر لەمە دایە ، عیشق وا لە مرۆڤ دەکات کە هەمیشە سەربەرز و شکۆدار بژیت ، وا لە مرۆڤ دەکات کە ئیتر دوێنێ جێ بەێڵێت و بۆ ئەمڕۆ و سبەینێ یەکی ڕاستگۆیانە مل بنێت ، مرۆڤ لە ڕێگەی عیشقەوە پایەداری و ژیانێکی پڕ هەستکردن بە بەرپرسیارێتی دەژیت ،بە بڕوای ئەفلاتوون کەسی عاشق هەمیشە سەربەستە لە گوفتار وە ڕەفتاری دا ، ئەگەر کەسێك عاشق بێت و زۆر بە زیادەڕەوییەوە دوای ئەو مەعشوقەی خۆی بکەوێت ، ئەمە نەك هەر لۆمە ناکرێت ، بگرە شایانی پیاهەڵدان و ستاییش کردنێتی ، بەڵام جگە لە عیشق ئەم زیادە ڕەویە بە کارێکی باش دانانێت ، واتا بۆ نموونە کۆکردنەوەی پارە و پول و زیادەڕەوی ، یان زیادەڕەوی لە پلەیی دەسەڵاتداریدا ، واتا لەلای ئەفلاتون ئەگەر مرۆڤ عاشقی شتی باڵا و پلە بەرز و گەورە بێت ، کارێکی پەسەندە و ئەوە دەهێێت مرۆڤ لە پێناو**

به دەست هێنانی ئەو ئامانجە دا ، کە ئامانجێکی باڵایە ، هەژاری و دەردی سەری و پاڕانەوە و ملکەچی پێ قبوڵ بێت، وە بە بڕوای ئەم فەیلەسوفە ئەم جۆرە شتانە لە پێناو ئامانجێکی باڵادا هیچ کات بە شورەیی دانانرێن ، بەڵام هەر ئەم قبوڵ کردن و ملکەچیە ، لە پێناو ماڵ و سامان و پلە و پارە و شتی دونیایی ، شەرمەزاری و ڕیسوایی بۆ کەسەکە مسۆگەر دەکات و بۆیە نابێت مرۆڤ ئەو کارە بکات کە شەرمەزاریە بۆ مانەوەی .

عیشق لە لای فەیلەسوفی یونانی ئەفلاتون بریتیە لە خۆشەویستی شتێك ، وەك چۆن كە دەوترێت كە ئەو دایك-ە، واتا دایکی کەسێکە ،ئەو کوڕە - واتا کوڕی کەسێکە ، وە بەم پێ یە کە وترا عیشق ، واتا عیشق یان خۆشەویستی شتێك ، یەکێك لە فەیلەسوفەکان کە ناویم بیرنەماوە زۆر جوان دەڵێت (عیشق ، عیشقەو هیچی تر ) ، عیشق خوازیارە بە شتێك و دەیەوێت بە دەستی بهێنێت ، هەر ئەمەیە ئیتر ، کەواتە خۆشەویستی و عیشق ، بەرامبەر بە شتێکی دیاریکراوە و کەسەکە ئەو شتەی نیە ، بۆیە کە پێوستی پێ یەتی و دەیەوێت ئەو شتە بەدەست بهێنێت ، هەر بۆیە کە عاشقی بووە ئیتر .





لە لای ئەفلاتوون عیش خۆی واتا جوانی ، وە پەیوەستە بە جوانیشەوە، ئەو کە دەڵێت (عیشق واتا جوانی، نەك ناشرینی)) ئەمە بۆ خۆی گوزارشە لەوە ، جگە لەوەی کە بە بڕوای ئەفلاتون شتێك چاك بێت و کەسێك چاکەکار بێت ، ئیدی ئەوە بۆخۆی جوانیشە، ئەفلاتوون بەشێك لەوەی کە من بڕوام پێی نیە و تا ئەندازەیەك ئەو کە بڕوای پێ نیە ، ئەو خۆی لەو ئەنجامگیریە نە پاراستوە ، ئێ باشە ئەگەر عیشق مادەم جوان نیە، وە ئەوەی کە چاك بوو جوانە ، کەوتە عیشق چاکیش نیە، کەواتە دەشێت عیشق خراپ و ناشیرینیش بێت !

ئاخر من لەبەر ئەوە شکم هەیە ، چونکە مرۆڤەکان دەشێت هەموو جوان نەبن و هەموو چاك نەبن ، بەڵام زۆربەیان عاشق دەبن ، کە عیشق جوانە ، ئەی چۆن ناشیرینێك لە خۆی بەرجەستەی دەکات ؟!

دواجار دەبێت بپرسین ئایا عیشقیش بەشێك نیە لەو ناشیرینیەی کە مرۆڤێکی خراپەکار و ناشیرین لە ناو خۆیدا هەڵیدەگرێت ؟

هەڵبەت لێرەدا و لە ڕوانگەی ئەم سیفەتانەوە عیشق وەکو مرۆڤێك تەماشا کراوە کە لە دۆخی ناوەندیگیریدایە ، هەروەك ئەوەی د.موحوممەد ئەمین بڕوای پێ یەتی ، ئەو

ناوەندگیریەش بریتیە لەو بوارەی کە دەکوێتە نێوان عیشقەکە خۆیی و ئەوشتەی کەدەیەوێت بە دەستی بەێنێت ، واتا عیشق مەسافەی نێوان دوو شتە ، ئەو لە خودی عیشقەکەوە دەست پێ دەکات، تا ئەو شتەی کە عاشقی بوە و دەیەوێت بە دەست بەێنێت ، بەم پێ یە بێت عیشق بریتییە لە قۆناغی پێش بەدەستهێنانی ئەو شتەی کە عیشق عاشقی بووە، وە ئەگەر بمانەوێت بە نموونەیەکی واقیعی و ڕیالەتی ئەم مەسەلەیە زیاتر ڕوون بکەینەوە ، ئەوا بە پشت بەستن بە تیورەکانی د.موحەمەد امین ، خۆشەویستی کوڕێك بەرامبەر بە کچێك بە نموونە دەهێنینەوە ، کوڕێك کاتێك دەگاتە تەمەنی لاوێتی ، ئامادەیی ئەوەی تێدایە ئەگەر کچێك ببینێت و هەست بکات ئەو کچە (جوان و بە ڕەوشت و ........ هتد ) ە ، ئەوا عاشقی دەبێت ، واتا لە بەرامبەر ئەو کچە دا دەکەوێتە دۆخی عیشقەوە ، لێرە دا ئەو کوڕە بۆیە لە دۆخی عیشق دایە ، چونکە هێشتا ئەو کچەی بۆ نەبووە و نەبووە بە هاوسەری ، وەکو فرۆید پێ ی وایە کە عیشق ئاگرێکی کلپە دار و مەزنە ، بەڵام ئاگرە گەورەیە بە یەك دلۆپ ئاو دەکوژێتەوە !!

بەڵام تا ئەم کچە و کوڕە لە یەکەوە دوور بن ، حاڵەتی عیشق هەر هەیە ، بەڵام ئیدی ئەگەر کچەکە ڕازی بوو بەوەی کە





ببێتە هاوسەری کوڕەکە ، ئیدی کوڕەکە گەیشت بە ئامانج و بە دەستیهێنا ، ئەوە ئیدی دۆخی ئەو کوڕە لە بەرامبەر ئەم کچەدا لە حاڵەتی عیشقدا نامێنێت ، چونکە ئەوەی ویستی بە دەستی هێنا، لەبەر ئەوەی بە پێ ی تیورەکانی ئەفلاتوون (عیشق حاڵەتی پیش بەدەستهێنانی بابەتەکەیە)، لێرەش دا حاڵەتی عیشق لە لای ئەو کوڕە ئەو کاتەیە کە هێشتا بە کچەکە نەگەیشتووە و نەبۆتە هاوسەری ، کە پێ ی گەیشت ، ئەوا کوڕەکە لە حاڵەتی عیشق دا نامێنێت .

## وە ئەگەر بێین و باس لە عیشق بکەین لە لای مەحوی :

ئەوەی کە پێویست بوو لە سەر عیشق لە لای ئەفلاتوون باسکرا و گەیشتینە ئەو ئەنجامەی کە عیشق بریتییە لە ناوەندگیریەك لە نێوان خودی عیشقەکە و ئەو شتەی کە عاشقی بووە و بە دەستی بهێنێت ، ئەم ناوەندگیریەش لە لای مەحوی بەهەمانشێوەیە و ناوەندگیرشی عیشق لە لای مەحویش هەست پێ دەکرێت ، بەڵامەکێ ئەوەی لای

مەحوی هەیە ، جیاوەزە لەوەی کە لە لای ئەفڵاتوون هەیە ، لە لای ئەفڵاتوون لە عیشق دا دوو لایەن هەیە ، خودی عیشقەکە و ئەو شتەی کە عیشقەکە عاشقی بووە، بەڵام لە لای مەحوی حەزرەت کە ئەوەندەی لە کۆی شیعرەکانی هەستی پێ دەکرێت، بریتییە لە سێ لایەن کە لە شیعرەکانی دا هەست پێ دەکرێت ، ئەوانیش بریتین لە (( عاشق کە مەحوویە ، عیشق ، مەعشوق کە بوونی خۆیەتی )) ، واتا ڕاستە لای مەحویش لە دۆخی ناوەندگیریە دا یە ، بەڵام ئەم ناوەندگیریە لە لای مەحوی لە نێوان عیشق و مەعشوق دا نیە ، بەڵکو لە نێوان عاشق–مەحوی ، و مەعشوق دایە ، کە دەکاتە ئەوەی کە مەحوی عاشقی بووە ، مەحوی تا عاشقێکی ڕاستەقینە نەبێت و لەبەرامبەریدا نەکەوێتە حاڵەتی عیشقەوە نەتوانێت پێ ی بگات ، وە بە بڕوای مەحوی مرۆڤ چەنێك سەرقاڵی دونیا بێت ئەوا زیاتر لە نووری عیشق بێ بەش دەبێت ، عیشق لە لای مەحوی وەکو زنجیرێك وایە ، وە ئەو زنجیرەش هێندە پیرۆزە ، زنجیرێك نیە بە ئاسانی بکرێتە پێ ی هەموو کەسێك و ئەو کەسە بەم زنجیرە ببەسترێتەوە پابەندی ئەم عیشقە بێت، وە کو خۆی دەڵێت :





**لە پێ حەرامە زڕڕەی سیلسیلەی موقەددەسی عیشق**
**ببێ بەشێر و مەگەر هەڵگری لە دنیا بێت**

ئەم زنجیرە لە لای مەحوی دەکرێتە پێ ی کەسێك کە ئازاییەکەی بە قەد ئازایی شێرێك بێت و ئەم ئازاییە وا لەو کەسە بکات ئیدی واز لە دنیا بهێنێت ، لێرە دا هەڵبەت ئەوە دەردەکەوێت کە خۆی وازهێنان و دەستبەرداری دنیا کارێکی ئاسان نیە و کارێکی قورس و پڕ مەترسیە، بۆیەشە مەحوی لێردا دەڵێت ئەوەی کە دەیەوێت واز لە دونیا بێنێت و زنجیری عیشق بکاتە پێ ی، دەبێت بە قەد شێرێك ئازا بێت ئەنجا دەتوانێت ئەو کارە بکات ، وە ئەو پرسیارە گرنگە کە ئاراستەی بکەین ، کە بۆچی دەست هەڵگرتن و وازهێنان لە دونیا کارێکی ئەستەم و قورسە ؟!

بێگومان مرۆڤ هەر لە چرکەساتی لە دایك بوونیەوە کە ئاشنای خەڵك دەبێت و کەسایەتی بۆخۆی پەیدا دەکات و دەتوانێت ناوبانگی چاکەی مەعنەوی و چاکی مادی بە دەست بهێنێت ، لە ڕاستیدا ئەمەش بۆ خۆی هۆکارێکە و جۆرە غروریەك لە ئینسان درووست دەکات و دەبێتە هۆکاری ئەوەی کە دونیای لە لا خۆشەویست بێت و

نەتوانێت وا بە ئاسانی دەستبەرداری بکات ، مەحوی لە دوو
نیوە بەیتی هاو مانای ئەوەی سەرەوە دا پێمان دەڵێت :

شێرێکی پیٚ لە سیلسیلە دایە  ئەسیری عیشق
مەردی ، بزانە زینەتی مەردانە تەوق و ڕەوق

پێموایە هەرکەسێك درکی بە هەبوونی ڕاستەقینەی خۆی
کرد و کەوتە عیشقی ئەو بوونە ڕەسەنەی خۆیەوە ،
بە هەموو شێوەیەك ئامادەگی ئەوەی تێدایە کە ببێت بە
ئەسیری ئەم عیشقە کە ئەم عیشقەش یەکسانە بە پابەند
بوون بەم عیشقەوە و وازهێنان و پشت کردن لە دونیا ،
چوونکە لەم عیشقەوە بە بوونێك دەگات کە بوونی
ڕاستەقینەیە و دەبێتە کەسێکی پێگەیشتوو ، ئەم کەوتنە
حاڵی عیشقەیش وەك ئەوە وایە کە لە لایەن عیشقەوە
زنجیری کرابێتە پیٚ و بەسترابێتەوە ، وە بە بڕوای مەحوی
حەزرەت هەرکەسێك زنجیری عیشقی لە پیٚ کرا وەکو شێر
ئازایە و نەك هەر ناشیرین نیە ، بەڵکو (( زینە )) و جوانیە ،
وە مەحوی شانازیشی پێوە دەکات ، چونکە توانیویەتی لە
پێناو ئەو عیشقە جاویدانیە دا دەستبەرداری ماڵ و سامان
و دونیا و کۆمەڵگا بێت ، بە بڕوای مەحوی ئەمەش کارێکی





قورسە و هەموو کەس ناتوانێت ئەم کارە بە ئەنجامی خۆی
بگەیەنێت ، بەڵام بە بڕوای مەحوی ئەم کە ئەوکارەی کردوە
، لە پێناو عیشقی ئەوبوونە ڕاستەقینەیەی ئەنجامی داوە ،
وە قورسی ئەم کارە وا دەکات ئیدی عیشقیش بۆ خۆی
کارێکی قورس و گران بێت و هەموو کەس نەتوانێت عاشق
بێت،مەحوی کە عیشق بە کارێکی قورس و پڕ مەترسی دا
دەنێت،لەبەر ئەوەیە کە دەبێت کەسی عاشق ئامادەگی
ئەوەی هەبێت جگە لە (مەعشوق بوون) دەستبەرداری و
وازهێنانی خۆی بڕیار دابێت لە دونیا ، مەحوی لە شوێنیکە
دا تەنانەت عیشق بە بیابانی پڕ لە مەترسی ناودەبات و
دەڵێت :

دەزانم ، بادیەی عیشقە  خەتەر ناك
کەچی هەر چوم ، ئەگەر مام و ئەگەر چوم

مەحوی لەم دوو نیوە بەیتە ئەو ڕاستیەی بۆ دەرکەوتووە کە
عیشق بیابانە ، نەك هەر بیابانە ، بەڵکو بیابانێکی پڕ
مەترسیە، بە بڕوای د.محمد أمین ، عیشق بیابانی پڕ
مەترسیە لە دوو ڕوە وە ، ئەویش یەکەم : لەوانەیە بەرگەی
دابڕان و وازهێنان لە کۆمەڵگە و دونیا و دەرووبەر نەگریت و

لەو تەنایییەی بیابانی عیشق دا ئیرادەی لاواز بێت و هێز و توانای دونیا و کۆمەڵگە و دەور و بەر ئەوەندە زۆر بێت ، جارێکی دی ئەم کەسە بەرە و خۆیان ڕاکێشنەوە ، بەمە لەو ئازادیەی کە لەوێ بەدەستی هێناوە ، جارێکی دی لە دەستی بچێت و ببێتەوە بە دیل و کۆیلەی ژیانێکی بێ مانا و دوور لە عیش بژیت کە ئەمە وەکو مردنی ڕحانیەتی ئەو ئینسانەیە، وە دووهەم ڕوو ، ئەوەیە کە ئەگەر بە تەواوی لەو عیشقە دا ڕۆبچێت و لە سەری بەردەوام بێت ، لەوانەیە بە هۆی دابڕانی لە دونیا و نزیک بوونەوەی لەو دونیا مەعنەویەوە ، لە ڕووی جەستەییەوە بفەوتێت و لە ناو بچێت ، کە بە ڕاستی ئەمەشیان هەر جۆرێکە لە مردن ، بەڵام سەرەڕای ئەو مەترسیانەی کە لە ڕێگەیدان و سەرەڕای ئەوەی نازانێت سەردەکەوێت یان نا، سڵ ناکاتەوە ڕێگەی عیشق دەگرێتە بەر، وە ئەمەش مانای وایە وەکو شێر دەستی لە دونیا هەڵگرتووە ، لە ڕاستیدا هێنانەوەی نموونەی شێر لە لای مەحوی وەکو ڕەهەندێکی مەجازی و میتافۆریە زیاتر ، کە شێر بە هێزە و نەترسە و ئازایە و .... هتد ، بۆیە مەحوی هەست دەکات گرتنە بەری ئەو ڕێگەیە و تیاچوون لەو ڕێگەیە دا باشترە لەوەی ئەو ڕێگەیە نەگرێتە





بەر و ژیانێکی دوور لە عیشق بژی ، کە ئەمە بۆ خۆی لە خۆی دا مردنە .

وە ئەم قوربانیدانەش خۆی پێویستە لە عیشق دا ، ئەساسەن عیشق بە بێ قوربانی دان هەر زۆر بێ مانایە ، مەحوی هەست دەکات عیشق مانایەکی دی بە ژیان دەبەشێت کە مانایەکی زێدە جوانە ، وە کەسەکەش دەکاتە نەمر ، بەڵام ئەگەر بێت و کەسێك عاشق نەبێت ، ئەوا ئەو کەسە لە ژیانێکی بێ مانا دا دەژی و بگرە مان و نەمانی وەکو یەك وایە ، وە مەحوی بۆ ئەوەی توشی ئەو گرفتە ئاڵۆزە نەبێت ، کە گرفتی خۆ تەسلیم کردنە بە دونیا ، دێت و ئامادەیی خۆی دەردەبڕێت کە سەری خۆی بکاتە قوربانی ئەو عیشقە و دەڵێت :

تا نەبووری تۆ لەسەر ، ڕێ ناخەیە مەیدانی عیشق
سەر لە پێشی پێ دەبێ لەم ڕێ یە دانێ ی (أولا)

بە بڕوای مەحوی حەزرەت ، مەیدانی عیشق ئەو مەیدانەیە کە هەموو کەس ناتوانێت بە سانایی بچێتە نێویەوە ، ئەوانەی کە دەتوانن بچنە نێو ئەو مەیدانەوە تەنها عاشقەکانن ، وە ئەو عاشقانەن کە ئامادەن لە پێناو عیشق

دا لەسەری خۆیان ببورن و بیکەن بە قوربانی ئەو عیشقە ، چونکە ڕێگای چوون بەرەو عیشق ئەو ڕێگایەیە ، کە دەبێت عاشق ئامادەیی دەربڕێت سەری خی بکاتە قوربانی بەرپێ ی یارەکەی ، هەڵبەت سەرخستە بەرپێ لە دونیای عیشق دا مرۆڤە عاشقەکانی پێ تاقی دەکرێنەوە ، تا دەرکەوێت بۆ یار ئایا شایانی مەیدانی عیشە یاخود نا ؟

چونکە ئەگەر مرۆڤ ئامادەیی ئەوەی نەبێت کە سەری خۆی بخاتە بەردەم پێ ی یار بۆ پەڕاندن ، ئەوا ئیدی جورئەت و ئازایەتی ئەوەیشی تیا نابێت لە پیناو عیشقی ڕاستەقینەی خۆیدا و گەیشتن بەو بوونەی دەست لەسەروەت و سامان و دەسەڵات و دونیا و بوونی ساختە هەڵگرێت ، بەڵام هەر کە ئامادەگی دەربڕی بۆ ئەوەی سەری بکاتە قوربانی ، قوربانی بۆچی ؟ هەڵبەت قوربانی لە پێناو عیشق دا ، ئەوا زۆر بە ئاسانی دەتوانێت دەستبەرداری لە بوونێکی بەد و درۆ بکات و پشت لە دونیا بکات و بکەوێتە نێو مەیدانی عیشقەوە و عاشقی بوونی ڕاستەقینەیی خۆی ببێت و هەوڵی بەدیەێنانی بدات ، وە مرۆڤیش بەم قوربانیدانە دەبێتە کەسێکی داناش و لە دونیا و ژیان و مەرگیش تێدەگات :





لەبەر دەرگاهی عیشقا یەکسەرە هەرکەس سەری دانا
ئەگەر پەتیارەك بوو ، بوو لە صەد عەللامە دانا تر

لەم بەیتە دا مەحوی مەبەستی لەوەیە هەر کەس ئامادە بێت لەبەر دەرگای عیشقا سەری خۆی دابنێت ، واتا ئەگەر بێت و سەری خۆی ببەخشێ و بیکاتە قوربانی بۆ عیشق ، ئەوا ئەگەر ئەو کەسە کەسێکی زۆر نەزان و گەمژە بێت و هەمیشەیش لە دونیای درۆ و پوچ دا بووبێت و تیایدا نوقم بووبێت ، هەر کە سەری خۆی بە عیشق بەخشی ئیدی ئەو کەسە زانایە ، وە دەتوانێت دەرك بە عالەمی عیشق و بوونی ڕاستەقینەی خۆی بکات ، وە ئیدی بی بایەخی پوچی و پوکی دونیای بۆ دەردەکەوێت هیچ کات ئامادەنیە بگەڕێتەوە بۆ ئەو دونیا بێ تامە ، چونکە ئەگەر بگەڕێتەوە بۆ دونیا جارێکی دی ئەو بوونە ڕاستەقینەیەی خۆی لە دەست دەدات ، لەبەر ئەوە ناگەڕێتەوە چونکە بەهۆی ئەم عیشقەوە ، هەم دەبێتە کەسێکی نەمر و هەم دەشبێتە کەسێکی دانا و زانا ، بۆیە دەبێت عاشق تەنانەت ئامادەیی تێدبێ کە وەك مەجنوون بەردباران بکرێت و وەك حەللاج لە دار بدرێت .

**دڵ چووە وادی مەحەببەت ، هەرچ دی هەر کوشتە ، یا**
**نیوە کوژراوە ، لەسەر لێو ئاه و ناڵەی (وا أسف)**

دڵی مەحوی چۆتە دۆڵی خۆشەویستی و لەوێ عاشقە ڕاستەقینەکانی بینیوە ، کە یان بە تەواوی گوژراون و لە خەم هەڵکێشراون ، یان نیوە کوژراون و داغی ئەوە دەخۆن کە بە تەواوی نەکوژراون ، ئێوە ببینن ئەوەیە عاشق ، دەبێت عاشق بەو چەشنە بێت ، وەکو خۆی دەڵێت عاشق کە دی بێزارە یاری دەبێ بێ بڕۆ بڕوا ، لێرە قسەکردن لەسەر مەسەلەی ڕاستگۆییە ، من پێم وایە ئەگەر بیابانی عیشق چەنێك ترسناك بێت بەڵام ئیتر ئومێد هەر هەیە و بە تەنها نامێنیتەوە ، ڕاستە سەرەتا دەبێت فرمێسکی غەم بڕێژێت بۆ مەعشوق و وەسڵ ، بەڵام دواتر دەرگاری میهرەبانی دۆست دەکرێتەوە و نووری دۆست بە هەموو شوێنێکی تاریکی دا بڵاو دەبێتەوە و دەبێتە هەزوبان بۆ گریان و تا هەمیشە بوون هەر لەگەڵ دۆست .

شەو هەمیشە خاموش نیە ، ڕەنگە لە یەکێك و لە چەندین چەندین شەو بە تەنهایی بگریت ، بەڵام تۆ بڵێ ی ئەم گریانە تەواو نەبێت و دواجار وەکو ئەحمەد بەرزنجی بڵێین (تەمەن ڕۆیی!!) ،بەڵێ تەمەن ڕۆیی و ئێمەش هەر بەدچارەین ، نا





میهرەبانی نیە تا سەر ، دڵنیای عاشقنان دەکەم ، ئەوانەی کە ئاواتی بوونێکی ڕاستەقینە دەکەن و دەیانەوێت لە بوونی ساختە وە دوور بن ، ڕۆژی پرشنگدار لە ڕێ یە و وەکو مامۆستا هێمن دەڵێت ((ئاسۆ ڕوونە)) .

## سۆفیەتی و زاهید و ((عیشق )) :

لە ڕاستیدا ئەم بابەتە بە نسبەت منەوە گرنگیەکی زۆری هەیە و تا ئاندازەیەکی باشیش فیکر و هۆشمی بە خۆیە سەرقاڵ کردووە ، وە ئەویش لەبەر ئەوەی کە مەحوی یەکەم سۆفی بووە ، دووەم زاهید بووە ، سێ یەم عشق بووە ، بۆیە پێم باشە ئەم بابەت کەمێك فۆرمەلەی بکەینەوە ، ئەویش بە پشت بەستن بەو تێکستانەی کە دەر بابی عیشق وە زاهید ی وە سۆفیەتی یە ، بۆیە من هەوڵ دەدەم کە خوێندنەوەیەکی ئەکادیمیانە بۆ ئەو دوو چەمکەی تر بدەم (سۆفی — زاهید ) ، ئەنجا بتوانین پەیوەندیەکانیان لە ڕووی مەعنەویەتەوە چیە بە مەسەلەی (عیشق ) ەوە ، وە سەرەتا دەکرێت ئیش لەسەر ئەوە بکەین کە ئەدگارەکانی سۆفیەت

چین و ئەدگارەکانی زوهد چین ، تەسەوف چیە و زوهد چیە ، سۆفی چ کە سێکە و زاهید چ کەسێکە ، هەڵبەت بۆ تێگەیشتن لەم کۆنسێپتە عیرفانی و فەلسەفیانە ، وا پێویست دەکات کە بگەڕیمەوە بۆ کۆمەڵێك سەرچاوە ، کە پەیوەندیان بە تەصەوف و تێرمی سۆفیگەرییەوە هەیە ، چونکە بە ڕاستی ئەگەر ئەو سەرچاوانە نەبن ئەوا ئێمەیش ناتوانین نیشانەکەمان بە باشی بپێکین ، وە بڕوا دەکەم ئەو سەرچاوانە یاریمەتی دەر بن تا ئەو کاتەی لە مانا بنچینەییە کەی ئەو دوو چەمکە تێبگەین ، وە دواتر ئێمەیش بڕوای خۆمان و بە پشت بە ستن بە کۆمەڵێك سەرچاوەی تر ، پەیوەندی و ئەنجامگەرایی خۆمان دەخەینە ڕوو ، وە خستنە ڕووی ئەو ماتەرە مەعریفیانە خۆ نەویستی وە مەعریفە دۆستی و مەعریفە ویستی پێویستە ، بۆیە من لە کۆنێکتی نێوان ئەو سێ چەمکەش دا ، هەوڵ دەدەم باسەکە هەر بەو میتۆدە ئەکادیمیە درێژە پێ بدەم .

هەڵبەت سەرەتا گرنگە ئاماژە بەوە بدەین کە مەحوی لە دیوانەکەیدا ، لە زۆر بەیتە شیعر دا باسی (سۆفی) و (زاهید)





دەکات و دەکرێت ئێمە بەگشتی سۆفی زاهید بەسەر دوو تیم یان دوو گروپ دا کلاسیفیکەیشن بکەین ئەوانیش :

گروپی یەکەم : هەڵبەت گروپی یەکەم لە لای مەحوی ئەو سۆفی ناو و زاهید ناوانە دەگرێتەوە کە تەنها بە ڕواڵەت ئەو شوناسەی سۆفی و زاهیدانەیان هەڵگرتووە ، واتا لە لای مەحوی ئەم جۆرە وا خۆیان پیشان دەدەن کە کە کەسانێکن بە تەواوی پشتیان لە دونیاکردوە و ڕوو لە خودان و عەشقی خودا سەرگەردانی کردوون ، وە هیچ کات نەکەوتونەتە دوای پارە و سامان و دەسەڵات ، بەڵام ڕاستیەکەی ئەوانە لە کەسایەتی ڕاستەقینەی خۆیان دابڕاون و لە دۆخی ژیانی درۆدا دەژین و بوونێکی نا ڕاست و ساختە دەژین ، چونکێ بە ڕاستی کۆمەڵێك ڕێو ڕەسم و پرۆسێس هەن کە دەبێت سۆفی زاهیدە ڕاستەقینەکان ئەنجامی بدەن و دەبێت بەو یاسایانەوە پابەند بن ، کە کەس خۆی نیە و هەموویان بریتین لە یەك ، بەڵام زاهید و وشکە سۆفی کاتێك دەستبەرداری دونیاو خۆشیەکانی دونیا دەبن ، وە ئیدی ڕابواردن و سەروەت و سامانیان نامێنێت ، بە شێوە وا خۆیان پیشان دەدەن لە پێناو عیشقی خودا و خودا ویستی و خودا دۆستی و ڕەزامەندی خودا دا ئەو کارە دەکەن ،

کەچی مرۆڤەکەی ناوەوەیان هەر سەرقاڵی ئەو شتانەیە کە ئارەزو وە هەوەس دەیەوێت ، وە هەر بۆیە مەحوی لە بارەیانەوە دەڵێت :

لە نان و ئاو ئەوا ئیمساکیە مردووش ، ئەریٚ زاهید
چ عوجبێکە ، ئەمەندە بۆ دەنازی تۆ بە مورتازی

قسەو باست لە عیرفانە ، کەچی دنیایە مەنزورت
لە عینوانی جۆیایی و ڕوو لە ئەعرازی

قسە گەر عیقدی گەوهەر بیٚ ، غەرەز دەیکا بە خەرموهرە
چ تەئسیریٚ لە وەعزتدایە ، واعیز ، وا پڕ ئەعرازی

زاهید ئەو کارەی کە دەیکات بە لای خۆیە زۆر گەورەیە و هەمیشە خۆی بەو کارەوە هەڵدەکێشێت کە وازی لە دونیا هێناوە و کەوتۆتە خودا پەرستی ، بەڵام بەلای مەحویە ئەم کارەی زاهید هیچ گرنگ نیە ، چونکە ئیٚ خۆ مردووش نان و ئاو ناخوات ، وە مەحوی ڕەخنەی ئەوەی زاهیدیش دەکات کە باس لە عیرفان دەکات و عەلئەساس بە شوێن جەوهەری خودا پەرستی دا دەگەڕێت ، چونکە ڕاست ناکات تەنها





مەبەستی دەسکەوتی شتی دونیاییە و هیچیتر ، لە بەیتی یەکەم مەحوی دەیەوێت پێمان بڵێت کە ئەوەی بە خۆی دەڵێت من زاهیدم و نان و ئاو ناخوات و وازی لە دونیا هێناوە ، هیچ ئازایەتیەکی نەنواندوە و ڕاست ناکات ، ئەم تەنها دەیەوێت لە ڕێگەی ئەوەی کە پیٚ ی بڵێن خوا ناسە و پیاوێکی باشە و چاکە خوازە و پشتی لە دنیا کردوە دەسکەوتی مادی دەسکەویٚ ، وە وازهێنان لە دونیا و پشت تێکردنی بە ڕواڵەت و شێوە نابێت ، بەڵکو دەبێت ئەو کەسە لە ناخەوە واز لە شتە دونیاییانە بهێنێت و بەهیچ جۆرێك پەیوەندی ناوەکی پێیانەوە نەمێنێت ،ئیتر ئەگەر لە دەرەوەش خاوەنی ئەو شتە دونیاییانە بوو ئەوا دەستبەرداریان دەبێت و توڕیان دەدات ، بۆیە لە لای مەحوی زاهید و سۆفی ئەم جۆرە نین ، هەر بۆیە زۆر بە توندی هێرشیان دەکاتە سەر و دژایەتیەکی سەر سەختیان دەکات ، غەزەلێکی جوانی هەیە بۆ ئەو کەسانەی کە لەم چەشنە زاهیدەن ، هاوکات لەگەڵ ئامۆژگاری بۆیان بە توندیش سەرزەنشت و لۆمەیان دەکات :

لەم بەحری فیتنە بەڵکی نەجاتت بدا خوا
داوێنی باخودا بگرە و بەردە ناخودا

بێ کەس منم ، کەسێ لە زوبانم بگا نیە
(هەمدەم) خودا نەناسن و دەم پڕ لە یاخودا

عەهد و وەفایە سوخرەیی و بەد عەهدی یو جەفا
هەر ما بە دادی ئەهلی وەفادا بگا خودا

هەر ئەو کەسە کە خەیری دوعای خێری دیوە لێم
دائیم دوعامە کە شەڕڕی لە من لابدا خودا

لوتفێ بە حاڵی من کە ، وتم ، ئەو وتی بە قتر
تۆ (شێخی با خوداو و ) ، ئەمن شۆخی ناخودا

غەیری ئەمە ، کە سوێندی درۆی پێ بخۆن و بەس
قوربانی ناوی ، ناوی لە ناوا نەما خودا

تا زوڵمەتی وجوودە ، تەریکی لە نوری ((عیشق))
سێبەر نەما هەتاوە ،کە ((مەحوی)) نەما ، خودا





لێرە دا مەحوی سەرەتا دێت و ئامۆژگاری مرۆڤەکان دەکات و دەڵێت هەمیشە ڕاستگۆ بن و کەسی شێوە مرۆڤ مەبن و مرۆڤ دڵ ی ڕاستگۆ و ڕەسەن بن و هەر لەگەڵ خودا دا بن و واز لە کەشتیەوان بێنن ، چونکە مەحوی دونیای بە بەحری فیتنە چواندوە ، دەڵێت تۆ تەنها تەمات بە خودا بێت و واز لە کەشتیەوان بەێنە ، دواتر دێت و باسی هەمدەمەکانی خۆی دەکات و ڕەخنەی توندیان لێ دەگرێت ، ئەم هەرچەندە لە ناو ئەو هەمدەمانەی خۆیدایە ، کەچی هەر خۆی بە بێ کەس دەزانێت و وە کەسێك شك نابات تا لە زمانی ئەم تێبگات ، هەڵبەت حەزرەت مەبەستی زمانی دڵیەتی و پێیان دەڵێت ئێوە کەسێك نین کە لە زمانی دڵی من تێبگەن ، چونکە زمانی دڵی من تەنهاو تەنها گوزارشە لە حەقیقەتێك کە خودایە ، بەڵام ئێوە چونکە تەنها زمانی نێو دەمتان خودا خودایە ، بۆیە لە من تێناگەن ، وە کە لە من تێناکەن چونکە بە دڵتان خودا نەناسن و تەنها زمانتان پڕیەتی لە خودا .. خودا ، بۆیە مەحوی زۆر لەگەڵ خۆیدا بووە و هەست بەتەنیاییەکی قوڵ دەکات و دەیەوێت کەسێك هەبێت لەوە بگات کە ئەم تەنیاییەی ئەم لە پێناو چیدایە و لەو بارەوە قسەی لەگەڵ دا بکات ، وە ئەوان ئاگەداری ئەو

مەسەلەیە نین کە مەحوی لە پێناوی دا تەنیایی هەڵبژاردوە و بەڵام واش خۆیان پیشان دەدەن کە ئاگەداری ئەم مەبەست و مەسەلەیەی مەحوی هەن ، بەمەش لە کەسێك دەچن کە خوانەناسن و بەردەوام ناوی خواشیان لەسەر دەم بێت !

بێ گومان لێرە مەحوی وا باسی ئەم کەسانە دەکات کە ناوی خوایان لەسەر دەمەوە بە هەمیشە هەر دەیڵێنەوە ، بەڵام لە ڕاستیدا وانین ، ئەو کەسانە ڕیاکار ن و بە درۆ وا خۆیان پیشان دەدن کە ڕاستگۆن ، هەڵبەت ناو هێنانی وشەی هەمدەم لەوەوەیە ڕەنگە چواردەور و هاوڕێکانی وەکو مەحوی سۆفی بوبن ، ئەویش بەو پێ یەی کە مەحوی خۆی سۆفی بوە و دەستبەرداری دونیا بووە ، بەڵام چواردەورەکەی کە خۆیان بە سۆفی داوە لەقەڵەم ، ڕاست ناکەن و تەنها دەیانەوێت بەو شێوەیە خۆیان پیشانی مەحوی بدەن ، کەچی لە ناوە وە شتێکی ترن و قسەی دڵیان شتێکی ترە ، هەر بۆیە مەحوی بەو شێوەیە باسیان لێ وە دەکات و پێ یان دەڵێت ئێوە تەنها دەمن ، چونکە ئەگەر وا نەبوایە ئەوا لە من تێدەگەیشتن .وە ئەوانە لە جیاتی گوێ ڕایەڵی خوا و بەجێ هێنانی فەرمانەکانی ، گوێڕایەڵی ئەم و ئەو دەکات و پەنا دەگرنە بەر شێخ و پیری تەریقەت ،وە ئەوەندەی گوێڕایەڵی ئەوان دەکات ئەوەندە گوێڕایەڵێ خودا ناکات ،وە





گاڵتەی بە عەقڵیان دێت و بە بێ وەفا ناویان دەبات ، چونکە وەفاداری زۆر کەمبووە لە سایەی زاهید و سۆفی شێوەکان ، چونکە ئەوان وەفایان بۆ خوا نیە و زیاتر وەفادارن بەرامبەر بە مرۆڤەکان ، بۆیە خودا هەر وا بێوەفاییەکانی ئەوان دەنوسێت ، وە لە شوێنێك دا باسی ئەوە دەکات ئەگەر شێخ و واعیز و سۆفی کە مامۆستای فڕ و فێڵن و مامۆستای درۆن ببرێنە بەهشت ، ئەوا دەبێت کەسی وەکو ئێمە ببرێنە دۆزەخ ، چونکە ئەوانە تەنها بە شێوە خودا پەرستن ، وە ئەگەر ئەوان بڕۆن بۆ بەهەشت کەواتە بەهەشت بە ڕیا و درۆ بەهەشت دێت ، ئەگەر بە حیسابی ئەوان بێت ، وە ئێمەش دەچین بۆ جەهەننەم ، وە لە شوێنێکی تردا پێ ی وایە زاهید دوای ئەوەی تەمەنێکی زۆر دەستی لە دونیاو خۆشی و ڕابواردن هەڵگرتوە و گۆشەگیری هەڵبژاردوە و ئیدی لە مردن نزیك بوەتەوە ، مەحوی ئاگەدارە کە ئەم گۆشەگیری و دورکەوتنەوەی زاهید لە دونیا ، تەنها بەشێوە بووە ، بە هیچ شێوەیەك گوتاری دڵی نەبووە ، تەنها گوتاری دەمیەتی ، وە دەزانێت ڕیایە و ڕاست نیە ، بۆ یە داوا دەکات کە زاهید بە زووترین کات تۆبە بکات تا نەمردووە ، کە دەڵێت نزیکە مردنت ئەی پیرە زاهید، وەرە با تۆبە بکەین ئیتر ڕیا بەس ، بۆیە مەحوی داوا دەکات کە زاهید بە زووترین کات تۆبە

بکات و ئیدی بەڕاستی و ڕاستگۆیی ڕوو بکاتە بارەگای عیشق ، هەرچەندە دەزانێت کە ئەو زاهید شێوەیە بە هۆی ڕیاوە لە ڕیزی ناکەسان دایە ، بەڵام بە بڕوای مەحوی بارگاەی عیشق بەرز و فراوانە و جێگەی هەموو کەسێکی تیا دەبێتەوە ، تەنانەت ئەگەر ناکەسیش تۆبە بکات و بە ڕاستی ڕوو بکاتە بارەگای عیشق ، ئەوا عیشق لە بارەگاهی خۆی وەری دەگرێت :

**زاهید وەرە ڕوویێ بکەرە بارەگاهی عیشق**
**عالی جەنابە ، وا نیە ، هەر ڕی بدا بە (کەس)**

**گروپی دووەم :**

گروپی دووهەم لەلای مەحوی ئەوانەن کە تەواو ئەنتی و پێچەوانەی گروپی یەکەمن ، ئەوانەن کە مەحوی لە قۆناغەکانی تەمەنیدا بڕوای وایە ئەو کەسانە بەڕاستی سۆفی و زاهیدی ڕاستەقینەن ، وە لەبەر ئەوەش سۆفی و زاهیدن تەنها بۆ ئەوە بگەن بە عیشقی خودا و یار ، مەحوی پێ ی وابووە ، کە ئەو کەسانە سۆفی و زاهیدی ڕاستەقینەن و ئەو کەسانەی پێ باش بووە و بۆ نموونە حەللاجی پەسەند





کردووە کە کەسێکی ڕاستەقینە بووە لە شوێنی زوهد و تەصەوف دا ، بەڵام هەروەکو وتمان لە هەندێ شوێندا ڕەخنەی ئەویشی کردووە ، بەڵام ئەو ڕەخنەیەش لە قۆناغێکی تری تەمەنیدایە کە لە حەللاجی دەگرێت ، ببینن بزانە لێر چۆن ستایشی مەنسوری حەللاج دەکات :

**موحەققەق هەر کەسێ مەسلەکیە حەقق و حەققیە مەنزور**
**سولوکی چوونە سەر دارە ، تەریقەی (پیرە مەنسور)**

**لە ئولکەی عیشقە دا ، بۆ هەر کەسێ سەرداریە مەنزور**
**عولووی مەرتەبەی سەردارە ، بۆتە پەیڕەوی مەنسور**

مەحوی پێ ی وایە هەرکەس دەیەوێت بە دوای حەق دا بگەڕێت و حەقی مەبەست بێ ، دەبێ بۆی بچێتە سەردار وەکو مەنسوری حەللاج ، وە هەرکەسێك بیەوێت لە وڵاتی عیشق دا ببێتە سەردار ، بەچوونە سەر سێدارە ئەم پلەیەی دەست دەکەوێت و هەرکات ئەمە کرد دەبێتە یەکێك لە پەیڕوانی مەنسور ، چونکە ئەوە مەنسور بوو کە لە پێناوی

عیشقەکەی دا درا لە دار ، واتا لێرە مەبەستی مەحوی ئەوەیە کە مرۆڤ پێویستە پەیڕەوی لە ڕێبازی مەنسوور بکات و شوێن ئەو بکەوێت بۆ گەیشتن بە حەقیقەتی عیشق ، بەڵام لە قۆناغێکی دیدا لە تەمەنی ، مەحوی ڕەخنە لە حەللاجیش دەگرێت ، واتا لە هەموو حەللاج نا ، لە بەشی:ی حەللاج کە ئیدیعای خوا بوونە و ئەو پیٚ ی وایە حەللاج ئەگەر مەبەستی لە (أنا الحق) واتا من خوام ، ئەوا زۆر هەڵەی کردووە ، چونکە وەك ئەوە وایە (مەجنوون) بڵی من (لەیلا) م :

با حەقیشی بیٚ لە بۆ ((مەنصور) (أنا الحق) حەق نیە
شێتیە مەجنوون ، ئەگەر بیٚ نازی لەیلایی بکا

واتا وەك چۆن ئەو کارەی مەجنوون هەڵە بوو کە لە پێناو لەیلا دا وازی لە کۆمەڵێك مەنهەجی مەعنەوی و دونیای ڕاستەقینە هێنا ، بە هەمانشێوەیش ئەوکارەی حەللاج هەڵەیە کە دێت دەڵێت من خوام ، چونکە ئەگەر مەسوور بڵی من خوام ، ئەمە بۆ خۆی دەسکاریکردنی سیستەمی عیشقە و یاسای عیشق تێکدەدات ، واتا لەو مەسەلەیەدا مەنسوور لە دۆخی وەمدا ژیاوە و ڕاستی نەپێکاوە ، ئەمەش بەروە





تێزەیەکی نیچەمان دەبات دەربارەی زوهد، کە نیچە پیٚ ی وایە (زوهد ... باشترین ئامرازی دەسەڵات پەیداکردنی زاهیدە و . مۆڵەتێکی باڵایە کە سەرپشکی دەکات لە گەیشتن بە دەسەڵات ) ،وە زیاتر دەڕوات و لەسەر بابەتی دەسەڵات وەرگرتنی زاهید قسە دەکات و دەڵێت: بە نیسبەت ئێمەوە کاهینی زاهید دەبێت ڕزگار کەرێکی ئامادەبێت ، شوانی گەلەخەڵکێکی نەخۆشی دەرونیە و پارێزگاریکەریانە ، بەم شێوەیە دەتوانین لە کارە مێژووییە لە ڕادەبەدەرەکەی زاهید تێبگەین، ئەو غەریزەیەیەی بۆ ئەوە ئامادەکردووە کە دەسەڵات بەسەر چەوساوەکان دا پەیدا بکات ، جگە لەم تێزەیەی نیچەو بەکارهێنانی ئەو تێرمانە دەربارەی زاهید ، پێم وایە خوا پێویستی بەم جۆرە لە عاشقبوونەی مرۆڤ نیە ، چونکە ئەگەر مرۆڤ بڵێت من خوام یان نا، هیچ لە مەسەلەی ((خوا بوونی خودا)) ناگۆڕێت ، ئەوە کە خوایە کە هەمیشە هەر خوایە ، واتا ئەگەر کەسێك بێت و بگاتە حاڵەتی (اتحاد) ەوە بڕیار لەسەر خوابوونی خۆی و مرۆڤ بوونی خوا بدات، ئەمە جگە لە گەمژەیی هیچیتر نیە ، هەڵبەت گەمژەیی بۆ بیرکردنەوەی ئەو کەسە لەو پرۆسەیە کە ئیدعای خوابوونی خودە ، ەهڵبەت ئەمە لە نێو فەلسەفەشدا جێگەی نابێتەوە ، مرۆڤ لە فەلسەفەی بوونگەرایی دا ، مرۆڤە و هیچیتر ، جا

**لەبەر ئەوەیە کە مەحوی دێت و بەگژ مەنسور دا دەچێتەوە و پیٚ ی دەڵێت شێتیە وتنی خوا منم ، ئەگەر بە بڕوای خۆی حەق و ڕاستیشی وتبێت بە بیری خۆی ، چونکە وتنی ئەو دەستەواژەیە ، دەبێتە هۆی تێکچوونی هاوکێشە فەلسەفی و عیرفانی و سۆفی گەرییەکان ، هەر بۆیە مەحوی تەنانەت لە گروپی دووهەمیش دا ڕەخنەی خۆی هەیە ، چونکە مەحوی نەهاتووە حەقیقەتی ڕەها بدات بە هیچ گروپ و ئیتنی یەك ، چونکە ئەوە نەشیاوە و لەگەڵ تێکستە شیعریەکانی ناوەشێتەوە ، واتا تێکستەکانی تری جۆرێکی ترن لە تەئویل کردنەوەی ئەو بابەتانە.**

**لێرە دا باسی ئەم بەشەیشمان کۆتایی پێهات و بە شاکارێکی حەزرەتی وەفایی سەبارەت بە عیشق کۆتایی پیٚ دەهێنین :**

**جیلوەی صەبا لەنجەی شەماڵ،بۆی زوڵفوخاڵی یار دەدەن**
**یا نەوبەهار دێنیٚ بە بار ، میشکی تەتار بۆی نەستەرەن**





**ڕەنگی وەنەوشەی دەشت و ڕاغ،عەکسی گوڵ و سەحراو باغ**
**عالەمیان کردە شەو چراغ ، وەك زوڵف و ڕوی دڵداری مەن**

**بە کەسك و سور،باغ دەر وژوور،پڕ بوولە نوور،وەك کێوی توور**
**لەبەر زوەور،کەوتە حوزور،نزیك و دوور،دەشت و دەمەن**

**بورقەع بەسەر،ئەتڵەس لەبەر،گوڵ هاتە دەر،وەك بووکی تەڕ**
**کاکۆڵ بە دۆش،عەنبەر فرۆش،پێم گوت ئەتۆش،دێم غەفڵەتەن**

**گیسو بڵاو بە نازی چاو،ەات لە ناکاو بە قەصدی ڕاو**
**ڕۆژ بوو بە شەو ، ژین بوو بەخەو ،بڕۆ بڕۆ کەوتە چەمەن**

**جیلوێکی دا ، هات لێکی دا،خۆش تێکی دا ئارامی دڵ**
**جوغد و هوما هۆشیان نەما ، کەوتنە سەما چوونە عەدەن**

**زوڵفی وەشاند،ڕووی خۆی نواند،عەتری وەراند،پێمی نواند**
**کەسی نەهێشت ،بانگی دەهێشت،بۆ کیٚ یە وا وەجهی حەسەن**

**ئەو زوڵف و ڕووی مانگەشەوە ، خۆش دەیگوت و دەیبیستەوە**
**وێم کەوە ، دەتوێمەوە ، ئاسك چاوم ، ناسك بەدەن**

**ئەو دولبەری موعەنبەری ، ئەو موشتەری هەروەك پەری**
**خۆی پێم نواند ، دڵمی ستاند ، هۆشمی ڕفاند ، بە مەکر و فەن**

**ئەو خالٚ و خەت ، هیند وفەرەنگ،وەسلٚ وهیجران شەهد و شەرەنگ**
**پڕ شۆر و جەنگ، لێم هاتە دەنگ، غەمزەم خەدەنگ،زوڵفم ڕەسەن**

**چین چین لەسەر ڕووی وەك شەككەر،زوڵفی عەنبەر،بەستیان چەمەر**
**تابوری چین ، هاتن بە قین ، خۆش داوەرین ، باغی سەمەن**

**زوڵف و نوری ، ڕووی بلووری ، بخوری شەمعی کافوری**
**خاڵی سیای ،چاوی شەهلای،نافەی خەتای،ئاهوی خوتەن**

**خەندەی دەمی ،بۆی پەرچەمی،چاوی بازی،نازی کەمی**
**شەهد و شەکەر،میشك و عەنبەر ،یەغمایی تین،تارجی تەن**

**بە غەمزەکان ، بە ڕەمزەکان،بە قەوسی ئەبرۆی چاوەکان**
**تیروکەمانی تورکەمان،صەیدی دڵان بە جان دەکەن**

**نرخ و بەهای میشکین هەودای،نافەی هەرتای ،زوڵفی سیای**
**بازاڕی چین ،موڵکی صەبا،خیتتەی خەتا،شاری(دەکەن)**

**لەعلی لەبی خۆش مەشرەبی،زوڵفی شەبی،گۆی غەبغەبی**
**قووتی ڕەوان،ئارامی جان،ئابی حەیاتی مەرد و زەن**

**ئەبرۆی کەمان،گیسوی کەمەند،زاری بە خەند،باڵا بڵەند**





**هەم سایەبان،هەم سورەجان، هەم نارەوان، دوو نارەوەن**

**ڕەقص و سەمای،زوڵفی دووتای،لەبەر هەوای باڵای بەڵای**
**هەروەك بولبول، بە ڕۆح ودلٚ،بۆ دارە گولٚ ،کەوتە شیوەن**

**یەغما دەکەن وەك تورکەمان،دەرمان دەکەن وەك تەبیبان**
**وەقتیٚ دەڕوا ئارامی جان،وەختیٚ کە دیٚ تەسکینی تەن**

**حەڵقەی گیسوو،تاتا لاچوو، لەسەر سینەو عاریز و ڕوو**
**شەو چوو سەحە، دیم هاتە دەر،شەمس و قەمەر سەر وسەمەن**

**لە هەناسەی ئەو دڵبەندەی، فرقە خەندەی،ئەو دەم قەندەی**
**بە بای بەهار ،دەتگوت بە بار، گولٚ دێنە خوار بۆ نێو چەمەن**

**گیسو دراز، وەك تێلی ساز،بە چاوی باز ،دەیکوت بە ناز**
**چاوی پڕاو، جەرگی بڕاو،سینەی سوتاو پەیدا دەکەن**

**ئەتۆ چ ڕەنگی ئاوری،دەمێکی گولٚ ،دەمێك شەمی**
**هاوار لە یاری دەمدەمی،فەریاد لە دۆستی ڕیشەکەن**

**ئەتۆ نە نور ، نە ئادەمی! دەمێك دێوی دەمێك پەری**
**هاوار لە یاری سەرسەری ، فەریاد لە دۆستی ڕیشەکەن**

**ئەی شەوچرای زیندو دڵان، ئەی ڕەنگ و بۆی باغی گوڵان**
**ناژیم تۆ خۆش،دەمرم بەڵان، هێندەم بەسە تۆم بێیە کەن**

**جارێك وەرە بەر پەنجەرە، ڕۆحم بەرە یا دڵ بەرە**
**تۆ پادشای موشکیل گوشا، من بیٚ نەوا (یا ژا المنن)**

**دڵ پارەیە،ئاوارەیە، بی چارەیە ، مەیخوارەیە**
**موتریب بڵی ساقی وەرە ! جامێك بدەن،تارێك لێدەن**

**خاکی دەری مەیخانەتم، تەشنەی دووسیٚ پەیمانەتم**
**جانانمی پەروانەتم، تۆ شەو چراغی ئەنجومەن**

**بیٚ موحتەسیب وەختیٚ خۆشە ، بیٚ گفتو گۆیی بیٚ غەشە**
**لەو ساغیرە وا دڵکەسە، کامیٚ بە دڵ جامیٚ بە مەن**

**تـــاری دەمـــا دەم خۆشـــترە، جـــامی پـــەیاپـــەی بێەتـــەرە**
**کوا جامی جەم؟کوا تاجی کەی؟ هەی مەی بدە،هەی نەی بژەن**

**ئاخر زەمانی هیجرەتە ، دەور و دوکانی فیترەتە**
**وەقت و ئەییامی غیرەت ، تۆ دڵگوشا، من موحتەجەن**





**خۆزگـەم بـەوەی بـە نـەشـئـەی مـەی،بـە بـانگی دەف،بـە دەنگـی نـەی**
**دەگریٚ هاموون،هەروەك مەجنوون،دڵ غەرقی خون،ڕوت و ڕەبەن**

**خۆزگەم بەوەی سەودا سەرە،سەرتاپا زەخمی خەنجەرە**
**ئاو بیٚ ئاور، بیٚ خەبەرە ، (فانی فی الله) بیٚ جیٚ و مەسکەن**

**گریـە و خـەنـدەی زۆر و کـەم بـیٚ ، سـۆزە سـینەی دەمـا دەم بـیٚ**
**شادی شیوەن،خۆشی غەم بیٚ،ساغ و کوێری سیڕڕو عەلەن**

**جەرگی هەموو جیٚ نەشتەر بیٚ، خوێنی جەرگی کە بیٚ دەر بیٚ**
**هەتا حەشریٚ خوێنی هەر بیٚ،سەودا سەر و خوێنین کەفەن**

**سەرچاوە :**


**(١)دیوانی وەفایی /محمد علی قرداغی/ چاپ دووەم ١٣٨٥/انتشارات کوردستان**

**(٢)دیوانی مەحوی /مەلا عبدولکەریم مودریس/١٩٨٤،چاپ سێهەم/انتشارات کوردستان ١٩٨٥**

**(٣)دیوانی مەولەوی/عبدولکەریم مووددەریش/ ١٣٧٨/کتابخانه ملی ایران ، چاپ تکراری**

**(٤)کلیات شمس ، جلد اول ، استاد فروزانفر /تەران ١٣٨٧،چاپ چهارم**

**(٥)غزلیات سعدی در سایت :**
TorbatJam.com

**(٦)دیوان رباعیات / ابو سعید ابولخیر**

**(٧) فلسفه الحب/افلاتون،ت : د.ولیم المیری،دار المعارف/مصر/١٩٧٠/ص٣٠-٣١**

**(٧)بوون لە شیعری مەحویدا/د.محەمەد امین عەبدوڵا/٢٠٠١/کوردۆلۆجی**

**(٨)قصه ارباب معرفت /عبدالکریم سروش / سراگ/ ١٣٨٣**







**(٩)اخلاق خدایان/عبدالکریم سروش/سراط/کتابخانه ملی ایران/١٣٨٤**

**()أصل اخلاق و فصلها/فردریك نیتشه/ت :حسین قبیسی/بیروت ،لبنان/سنه ١٩٨٣/ص٩٥-٩٦**

# دەربارەی غەم و شادی، لە نزیك مەحوی گەورە وە

**بێ منەت ڕزقێکە غەم ، بمرم لە برسان ، ئەو دەخۆم**
**تەفرە ناخۆم و تەڵەب ناکەم لە دونیا قوتی ڕۆح**

**(مەولانا مەحوی)**





**مانگ لە ڕۆژ دا هیچ گرنگی و بایەخێکی نیە و بەندەیەکی خوا بە تەماشاکردنی مانگ لە ڕۆژ دا هیچ کات ئاسودەگی دایناگرێت ، ئەو ساتەوەختەی کە مانگ گرنگی و بایەخەکەی تێیدا دەردەکەوێت شەوە، وە ئەگەر شەوەکە چەندە تاریك و توون و ئەنگوستە چاو بێت ، مانگ ئەوەندەی تر جوانتر وەدەر دەکەوێت و ئەوەندەی تر دەبێتە جێگای ئاسودەگی بۆ کۆ هەستی ئینسانەکان ،ئەویش لەبەر ئەوەی زیاتر و زۆرتر دەدرەوشێتەوە ، لە ڕاستیدا چ غەم وە چ شادی هەر هەمان ئەو ماجەرایەی مانگ دەیانگرێتەوە لە ڕوی بایەخ و بێ بایەخیەوە ، هەڵبەت گرنگە هەر یەکێك لە ئینسانەکان توشی غەم بێن و وە توشی شادی بێن ، ئەوجار بایەخی غەم وە شادی دەردەکەوێت ، وەلی ئەگەر توش نەیەن ئەوا ئەو دوو کۆنسێپتە گرنگیەکی ئەوتۆیان نیە ، بەڵامەکێ بە دڵنیاییەوە توش دێن ، ئەوەش لەبەر ئەوەی کە ئینسانن ، بزانن ئەزیزان هیچ کات ئاژەڵەکان وەکو مرۆڤ توشی غەم و شادی نایەن ، ئەزانن بۆ ؟ چونکێکم ئەوان ناتوانن وەکو مرۆڤ پەی بە زۆرینەی شتەکانی نێو زیندەگی بەرن ، ئاخر ئەوان ناتوانن و نازانن وەکو مرۆڤ لە دونیای عیشق و عیرفان و ئەدەب و شتە باڵاکانی تر تێبگەن ،**

**ئەوەی کە دەبێت لە غەم خواری و شادی خواری تێبگات و بیچەژێت مرۆڤەکانن ، بۆچی ؟ چونکیٚ مرۆڤ دواجار ئەو بونەوەرەیە کە قەول و ئەقوال و حەل و عەقد و تەفکیر و تێڕوانینیان جودایە لەگەلٚ ئاژەڵەکان ، من پەیوەندیم بە تێگەیشتن لە غەمی بوونگەراو و غەمی واقیعگەراوە ئەوەندە نیە، بەهەر حالٚ بابەتی ئەخلاقی نێوان مرۆڤ و ئاژەلٚ و تێگەیشتن لێیان گرنگە، دەشێت تێگەیشتنی هەندێك کەس و ئیتنی و گروپ بۆ ئەم مەسەلەیە هەڵە و کارەساتاوی بێت ، چونکە هەندێك کەس و گروپ کە بولمەعریفەن پێیان وایە مرۆڤ ئاژەڵێکی بگۆیە، دەتوانم بڵێم ئەو دوو خاڵەی کە نێوی غەم و شادیە گرنگە بۆ ئەوەی مرۆڤێکی تەواو لە ئاژەڵێکی تەواو، جودا بکاتەوە و هەر ئەم دوو کۆنسێپتە گرنگەش کلاسیفیکەیشنی ئەو دوو بونەوەرە دەکات کە مرۆڤ وە ئاژەڵن ، ئەشێت تێگەیشتنی ئێمە بۆ غەم وە شادی بەس نەبێت بۆ تێگەیشتن لەم دوو بابەت پڕ لە تێڕوانینە ، بەڵام ئێمە لێرەوە تێگەیشتنمان بۆ ئەم دوو بابەت زیاتر تێگەیشتنێکی عیرفانیە و لە نێو سیاقی عیرفان قسەی تێدا دەکەین ، سروش دەباغ یش وتارێکی تا ئەندازەیەك پڕ بایەخی نوسی وە لەو بارەیە(١) ، بەڵام ئەوەندەی بزانم وتار**





**دەربارەی ئەم بابەتە تا ئێستا کەمە ، ڕاستیەکەی ئەوەش نازانم بۆ ؟**

**با لە شیعرێکی ناسکی مەحویەوە بچینە نێو ئەم بابەتمان کە ئەم شیعرە دەبێتە سەرچاوەیەك بۆ هەموو ئەو چەمکانەی کە لە سیاقی ئەم لێکۆڵینەوەیە باس دەکرێن، وەکو حەقیقەت و عەقلٚ و عیشق و ... هتد ، هەڵبەت شیعرانێکی تریش وەکو پشتڕاستکردنەوەی تیۆرەکانمان بەکار ئەهێنین بۆ زیاتر ئاشنایی پەیدا کردن لە گەلٚ تێگەیشتن لە هەردوو چەمکی غەم و شادی ، کە ئێمە لێر زیاتر ئیش لە سەر غەمخواردن دەکەین ، تا بتوانرێت بە شێوەیەکی ئۆتوماتیکی لە بابەتی شادیش تێبگەین :**

**لە باسی مەینەت و دەردی دەرونی بۆیە دەم نادەم**
**لە خوێناوی دڵی پڕ غەم ، کە سینەم مەوج ئەدا تا دەم**

**غەمم دێتیٚ کە بۆ وەك کۆدەك ئاگر بەردەمە کاغەز**
**لە بۆ نوسینی غەمنامەی دڵم هەرگا قەڵەم دادەم**

هەلە ، پاڕانەوە ئەمڕۆ ، زوبان و دلّ لە کارایە
زوبان ئاوەر کە بەستەزمانە سبحەینیّ کە قوچا دەم

بە حەق هەر حەق ، بە نا حەق ناحەقم وتوە لە ڕۆژی بوم
وەکو مەنصور ئەگەر بیشمکوژن ناکەم لە حەق لادەم

بلّ گولّ ئاتەشی تیّ بەر ببیّ ، پەروانە بیّ بولبول
دەبیّ هەر بچمە باغ و ڕازی دلّ شەممیّکی بەر بادەم

سبەینیّ وەرنە سەیری کوشتنم وادەم چەها داوە
لەسەر وادەی درۆی ئەو نادەم ئیتر وادە ، قەت نادەم

وتم : گەر حالّی ((مەحوی)) تیّبگەی ڕەم بەم حەدە ناکەی
وتی : ئەو تیّنەگەییوە ، من پەریم و ئەو بەنی ئادەم

ئیّمە پیّویستە لە دونیای خۆمان تیّبگەین و هەڵبەت غەم و شادیش دوو هەرەمی گەورەی نیّو ئەم دونیایەن ، من دەمەویّت زیاتر جەغد لە سەر غەم بکەمەوە ، چونکە دواجار





ئەوە غەمە بەرهەم هیّنەری ئاوات خواستن بە شادیەو ، هەر خۆیشی بەرهەم هیّنەری شادیە،لەوەش گرنگتر ئەوغەمەی کە هەیە غەمی بیّ نەوایانە ، واتا لە نیّو مرۆڤەکانیش دا غەم بە فۆرمی جیاواز هەیە ، بە بڕوای من غەمی بیّ نەوایانە ، غەمی عاریفە بیّ نەواکان، چاکە ، غەم خواردنی عاریفەکان پڕ عیرفانترین غەمە ، واتا غەمی عاریفان ئەو غەمەیە کە تەفسیر کردنەوەی بە مرۆڤە نۆرمالّ و سادەکان ناکریّت ، چونکە ئامادەیی غەمی عاریفان ئامادەیی زەخیرەیەکی پڕ لە مەعریفەیە و دونیایەك لە عیبارەت و ڕەموز بە مەدلوولەوە ئامادەیە ، هەر بۆیە ئەوان زیاتر لە ئیّمە غەمبار ترن ، تا دەگاتە ئەو ئاستەی کە مەولانای ڕۆمی بلّیّت ئیّمە غەم ناخۆین و غەم ئیّمە دەخوات ! ئەوەتا دەلّیّت :

خون ما بر غم حرام و خون غم بر ما حلال
هر غمی کو گرد ما گردید شد در خون خویش(٢)

**یان دەڵێت بە هۆی غەمی یارەوە دڵم بوو بە ماڵی سەو
دازەدەیی و دڵم هەمیشە بە شوێنیەوەیەتی ، یاخود دڵم
هەموو شوێنێك دەگەڕێت بە شوێنێدا :**

**شد ز غمت خانه سودا دلم**
**در طلبت رفت به هرجا دلم**

**گرنگترین بابەتێك کە مرۆڤ بیری لێبکاتەوە بابەتی فەنا و
بابەتی جاویدانیە ، جاویدانی لە فەنا یان وجوود ، ماسی
کە توشی ئەبێت بە دەریایەکی تەڵخ و لێڵەوە ئیدی مومکین
نیە بتوانێت ژیانی جاویدانی بژیت ، مەرگ ئەندێشەیی
بەشێکە لە دروست کردنی غەم و ژیان ئەندێشەییش
بەشێکە لە دروست کردنی شادی ، ئەم نمونەیە بۆ مرۆڤ
باشە پێم وابێت ، مرۆڤ ئەگەر وەکو ماسیش وا بێت کە
توشی ئەبێت بە وشکاییەکی نا جۆر و پڕ لە جەورەوە ،
ئیدی غەم کاری خۆی ئەکات و مرۆڤ ئەبێت بە بەندەی غەم و**





**کارەکانی غەم دەبات بەڕێوە ، هەڵبەت بە بێ ئەوەی خۆیشی
پێ ی بزانێ، عاشقی کە بەشێکە لەو دونیا غەماویەی کە
مرۆڤ دەردەدار دەکات و دواجار غەم لە ڕێگای عیشقەوە یەك
شارستانیەتی گەورە لە ژیانی ئەو ئینسانە بونیاد دەنێت ،
من غەم بارم ، من شادم ، تۆش هەروا و ئەویش هەر وا ،
ئێوە کاتێك توانیتان جیاوازی لە پێچەوانە جودا بکەنەوە
ئەوا کاری ئێمە ئاسانتر ئەبێت بۆ تێگەیشتننتان لەو بابەتە ،
غەم و شادی دوو لێکچونیان هەیە و تەواویش ئەنتی یەکترن
، ئەویش یەکەمیان : هەردووکیان حاڵەتێکی سایکۆلۆجی
تایبەت بەسەر مرۆڤەکان دا دەەێنن و دووەمیشیان
هەردووکیان بەشێکن لە دونیای ئادەمی ، جا ئێوە کەمێك لە
سروشت بڕوانن و کەمێك لە شتەکانی نێو سروشت و
مەردومەکانی نێو سروشت و ئەوکات کەمێك لەو لێڵیە تان
بۆ ڕوون دەبێتە لە بابی غەم و شادی ، ئەوکات ئێمەی غەم
خوار و شاد خوار ئەو بابەتانە بە ئاسانی تێئە پەڕێنین :**

**گەرەب کەن شوکر زۆری هێناوە غەم**
**(( توقع زوالا اذا قیل تم ))**

بەس ئەمڕۆ بڵێ من سبەی وادەکەم
هەموو(وادەکەم)تە سبەی (وا ندم)

زمانت کە ببڕێ قسەت دێ بەکار
قەڵەم دادە دەم ، پەندی خۆ دادە دەم

بە بێ جێ کەسێ بکا غەیبەتم ،
سەگی هارە ، دێ دەمگەزێ پڕ بە دەم

لە جێ مانەوە ترش و تاڵت دەکا
ترێ بوو بە سرکە ، عەسەل بوو بە سەم

زەعیفی منی کردە پوش ، ئێستەکەش
لەمن هەر دەکەن ئەم غەزالانە ڕەم

لە کۆیا منی گرتە بەر تیری گەعن
ڕەقیب ئیشیە قەتلی صەیدی حەرەم





لە شێوەت ، پەشێوانی فورس و عەرەب
لە لەهجەت ، خرۆشانی ڕۆم و عەجەم

کە لەو بەردەرە بووم بە قاپی نشین
منم ((مەحویا)) ! واریسی تەختی جەم

ئەگەر بتوانم پۆلێنی غەم بکەم بۆ سێ بەش ئەوا ئیشەکەمان ئاسان تر دەبێت :

***یەکەم : غەمخواری عاریفانە**

***دووهەم: غەمخواری عاشقانە**

***سێهەم: غەمخواری عاقڵانە**

***یەکەم غەمخواری عاریفانە :**

**عارفان را شمع و شاهد نیست از بیرون خویش**
**خون انگوری نخورده بادەشان هم خون خویش**

**(کلیات /١٢٤٧)**

**مرا رجای تو باید نه زندگانی خویش**
**اگر مراد تو قتلست وارهان ای دوست**
**(شێخی سعدی)**

**((من تەنها ڕازیبوونی تۆم ئەوێت نەك ژیانی خۆم ، ئەگەر ویستی تۆ کوشتنە ، داوام وایە بمکوژیت و ڕزگارم بکەیت))**





**لەمەوە ئەمەوێت بچمە نێو غەمی عاریفانەوە و دواجار بتوانم سەر لەو غەمەی ئەوان دەربکەم کە هەیانە و هەمیشەگی یە ، تەنها ئەو کاتە غەمی ئەوان تەواو ئەبێت و کۆتایی پیێ دێت کە خۆشیان تەواو بن و کۆتاییان پیێ بێت ، لە ڕاستیدا ئەوان چێژ لەو غەمە نابینن ، بگرە زۆر ئازار ئەخۆن و لەگەڵ ئەو ئازارەشدا ئیدی هێدی هێدی ئەوانیش پوك ئەبنەوە و لە بەین و لە ناو ئەچن و بە دیار ئەو غەمەوە سەر ئەنێنەوە ، غەمی عاریفان غەمی کۆی گەردوونە ئەزانن ؟ ئەوان جیاواز لە فەیلەسوفەکان بە دوای نەبوونی خودا دا ناگەڕێن ، ئەوان بە دوای هەبوونی خودا وە وێڵ نین ، ئەوان بە تەواوی خودیان ناسیوە ، بەڵام لە حیسابی خودا ئەترسێن ، واتا ئەوان هێندە کێشەیان لەگەڵ دونیای جاڤیدانی دا هەیە ، ئەوەندە کێشەیان لەگەڵ خودی ئەو دونیایەی ئێستا دا نیە ، ئەوان هیچ کات کێشەیان نیە لەگەڵ وجوود، ئەوان کێشەیان لەگەڵ مەوجوود دا هەیە ، سوهرابی سپهری ئەڵێت :**

**من بە باغ عرفان**
**من بە ایوان چراغانی دانش رفتم**
**رفتم از پلە مذهب بالا(٤)**

سوهرابییش دەیەوێت پێمان بڵێت ماڵی عاریفان ئەو شوێنەیە کە پڕیەتی لە دانایی ، دانایییش پلەی باڵای مەزهەبە ، وە دواتر دەمەوێت بڵێم عاریفان چونکێ دانان ، ئەوا پێویستە غەگەلێکی زیاتر بخۆن ، ئەویش لەبەر ئەوەی مرۆڤە بچوك و جاهیلەکان هیچ کات غەم ناخۆن ، ئەوە عاریفانن غەمخۆرن و هەمیشە دڵداری لەگەڵ غەم دا دەکەن وەك لە گەڵ شادیدا ، من لەو ساتەوە کە غەزەلێکی مەحوی گەورە م خوێندەوە هەستم بە غەمێکی ئەبەدی قوڵ دەکرد لە دەروونی ئەم پیاوە دا ، ئەم پیاوە لێوانلێو بووە لە غەم خواردن تا ئەو ئاستەی بڵێت من هیچ کات ڕوی ئەوەم نیە کە تەنانەت داوای قووتی ڕۆحیش لە دونیا بکەم تا بمداتێ ، چونکە ئەوە غەم هەیە و بە بێ منەت دەیخۆم و دەیخۆمەوە و منەتی دونیای پوچ هەڵناگرم ، ئەوەتا لێرەش دا دەڵێت :

ئەر لە دونیا چاکەیێ صادیر بوو تەفرەی پێ نەخۆی
ڕوو سپی هەر ڕوو ڕەشە گەر بێ سەد ئازایی بکا





واتا دونیا ئەو شوێنەیە کە چیدی دەبێت مرۆڤەکان پرسەی بۆ بگرن و غەمی بۆ بخۆن و غەمی تیا بخۆن، نەك ئاهەنگ و خۆشی تیا بگێڕن و شاد بن ، ئەمە ئەو خاڵەی کە زۆربەی عاریفا کۆکن لەسەر ئەوەی کە مرۆڤ پێویستە غەم لە ژیان بخوات ، ئەو ژیانەی کە ئیدی بێ وەفایە بەرامبەر تەواوی مرۆڤەکان (٥)، ئەو ژیانەی کە ڕۆژانە مرۆڤی تیا لە دایك دەبێت و مرۆڤی تیا دەمرێت ، بەچی بزانم کە ژیان بێ وەفا نیە، بەوەی کە پێغەمبەرەکانی تیا نەمانەوە ؟ بەوەی کە عاریف و فەیلەسوفەکانی تیا نەمانەوە و بە ڕێ ی کردن ؟ ئاخر بەچی ؟ لە ڕاستیدا ئەوەی کە لە ژیانەوە بە جێما ئەوەبوو کە دۆستانمان تا ماوەیەك دەبێ پێکەوە بین و دواتر بە جێمان ئەهێڵن ، یان ئێمە ئیدی ئەوان بە جێ ئەهێڵین ، دواتریش و دوای ئەو ماجەرا غەمئەنگێزە ، دەبێت بە غەمباری و بە چاوی پڕ لە فرمێسکەوە هاوار بکەین و بڵێین مەڕۆن .. مەڕۆن ، توخوا مەڕۆن ، من ناتوانم ئەوە بشارمەوە کە نوسین و لێکۆڵینەوە دەربارەی کەسێکی وەك مەولانا مەحوی بەر لە هەموو شتێك دەست بردنە بۆ کۆمەڵێك چەمکی ئاڵۆز و نا ئاسایی کە بوونیان هەبووە لای ئەم پیاوە ، پرسیارێك کە بە گرنگم دەزانی بە دوای وەڵامەکەیدا بگەڕێم ئەوەبوو کە ئاخۆ کەی عیرفان لە ناخی مەحوی دا

جیلوەی کردوە؟ ئەگەر تەلیسم و بەندی عیرفانی شەمسی تەبریزی بۆ یەکەمین جار مەولانای ڕۆمی ڕادەکێشێتە نێو دونیای عیرفانەوە ، ئەگەر مەولاناش ئەو تەلیسمە عیرفانیە بێت کۆمەڵێك کەس ڕابکێشێتە نێو ئەو دونیا عیرفانیەوە وەکو ، سروش و شەریعتی و .... هتد ، ئاخۆ ئاخۆ مەحوی گەورە بەکام تووڵە ڕێدا دەستی گەیشتۆتە ئەو شارە پڕ لە نهێنیەی عیرفان ، لێرە دا من دەمەوێت بگەڕێمەوە بۆ (مەولانا خالیدی نەقشبەندی) ، ئەو کەسەی کە من ناوی دەنێم پاسەوانی ڕۆحی مەحوی گەورە ، مەوانای نەقشبەندی جگە لە خودا و ڕۆحی خۆی هیچی تری نەدەناسی ، نیگاکانی هەر لەسەرەتاوە پڕ بوون لە پاکی ، گیانی پڕ بوو لە عیشق و خۆشەویستی بۆ خودا ، من پێم وایە سەرەتای سەرهەڵدانی داستانی عیرفان لە لای مەحوی دەگەڕێتەوە بۆ ناسین و ئاشنا بوون بە دونیا عیرفانیەکەی مەولانا خالید نەقشبەندیەوە ، مەحوی گەورە دەربارەی مەولانا خالیدی نەقشبەندی غەزەلێکی هەیە بە ناوی ((ستایشی حەزرەتی مەولانا خالیدی نەقشبەندی)) کە تێیدا دەڵێت :





ئەگەرچی مودەییێکە من لە زوڵوماتی سیابەختی
و نە زەررەی وجودم ، ڕۆژی ڕوناکم شەوی تارە

لە فەیزی ناوی(مولانا چیا و الدین) ە وە ئێستە
هەموو ڕۆژە شەوم ، قەترەی وجودم بەحری ئەنوارە

هەتا ئەو ناوە پاکەم کردە ژیکر و فیکری ڕۆژ و شەو
هەناسەم بۆنی میسکی گرتوە ، لێوم شەکەرباڕە

بۆیە گرنگە کە بڵێین، ئەو دونیایەی مەولانا خالید بە کۆنکریتی فۆرمەلەی نێو دونیای مەحوی گەورە بووە لە ڕوی عیرفانەوە ، دواجار وەرگرتنی تەریقەت بە ناڕاستەوخۆ لە دونیای نەقشبەندیەکان ، مەولانا خالید سۆفیەکی ((موحەممەدی)) یە و بە هەمان شێوە مەولانا مەحوییش سۆفیەکی ((موحەممەدی)) ە ، ئەمە ئەو نزیکیەی مەحوی دەردەخات لە تیشك و تریشقەی عیرفانی مەولانا خالید نەقشبەندیەوە و لە ئاوی عیرفانی مەولانا خالیدی نۆش کردووە ، هەر بۆیەش غەمی عیرفانی هەردوکیان نزیك بووە لە یەکدیەوە ، بۆ نموونە هەردوکیان غەمی دونیایان نەبووە

و هەردوکیشیان غەمی دونیای ئەو دیو ئەم دونیا بووە ، تا
لە شوێنێك دا مەولانا خالید دەڵێت : خەڵکی هەموو لە
غەمی عیشقی ئافرەت دا مردوون ، من زۆر دڵخۆشم سوپاس
گوزارم کە ماوم ، چونکە شتێك نیە لە لای من بە ناوی غەمی
ئافرەت و عیشقەکەیەوە ، ئەمە بەشێکی کەم و دیاری نێو
دونیای عیرفانی مەحویە ، چونکە من بڕوام بەوە هەیە کە
توانای زانینی هەموو دواکراو زانراو نیە ، نەك تەنەا دیدگای
هەست کردن ، کە دیدگا و تێڕوانینی عەقڵی ڕوتیش هەر
بەو شێوەیە ، من پێم پێم وایە تاکو مرۆڤایەتی لە قەفەسی
مرۆڤایەتی دا بێت حوکم و بڕیاری هەر بەو شێوە و جۆرەیە
کە هەیە ئیدی ، کە پیاوە گەورەکان هەمیشە هێزێکی تر و
نهێنی و زۆرجار نادیار هەیە کە لە پشتیانەوە ئامادەگیان
هەیە ، مەولانای ڕۆمی زۆر بەجوانی دەڵێت :

دم که مرد نایی اندر نای کرد
در خور نای است نەدر خورد مرد

((مثنوي،دفتر دووم،بيت ١٧٩٣))





(( واتا ئەگەر یەکێك نەی لێدا ، دەنگ لە نێو خۆری نەیدایە ،
نەك لە خودی کەسەکە ))

کەواتە ئێمە دەبێت بڕوامان بەوە هەبێت کە ئەوانەی پشت
ئێمەوە ئەگەر مەزن بن ئەوا ڕەنگە ئێمەش مەزن دەربچین ، و
وە بە پێچەوانەشەوە ، هەڵبەت ئەم حاڵەتەی کە باسم لێوە
کرد وەکو بابەتێکی گشتگیرگەرا باسم نەکردوە ، بەڵام بە
دڵنیاییشەوە ئەو حاڵەتە بە کۆنکرێتی نا گشتگیرگەراش نیە
، چونکە کندێشنی لەو جۆرە بابەتی نا ئەنجام گەرا
دەخاتەوە ، ڕیگای عیرفان یان باشتر بڵێم عیرفان ناسی وەکو
دیاردەیەکی مێژوویی هاوتەریب لەگەڵ سەردەمی تازەدا
وێنە ناکرێت ، ئەمە لەبەر ئەو هۆکارەی عاریفانی سەردەمی
دێرین کە مەولانا و سعدی و باباتاهیر و ... هتد دەگرێتەوە ،
تەواو جیاوازن لە عاریفانی هەنوزی وەك : سروش و جۆن
هایك و موستەفا مەلکیان و تا ڕادەیەك سید حسین نەسر ،
چونکە تێزی عاریفانی وەکو مەولانای گەورە و بچوك و
سعدی و حافز و حەللاج و جونەید و ...هتد ، هەموو لەسەر
مەسەلەی بوون و گەیشتن بە بوو بە خودا و ئاخیرەت ، ئاخر

من پێم وایە مەسەلەی بوون (وجووجیەت) پێشتر بەشێك بووە لە عیرفان تاوەکو فەلسەفە ، واتا دواتر فەلسەفە توانی ئەو پاکێجە جیا بکاتەوە و فۆرمەلەی بکاتە نێو سیاق و مەکانی فەلسەفە ، نمونەش لەسەر ئەوە زۆرە ، بۆ نموونە سعدی دەڵێت :

ماهیان ندیده غیر از اب<br>
پرس پرسان از این اب کجاست

واتە (( ماسیەکان جگە لە ئاو هیچی تریان نەبینیوە ، هەموو بە نێو یەکدا دێن و دەڵێن : دەبێت ئەم ئاوە لە کوێوە هاتبێت )) .

لەمەوە بۆمان ڕوون دەبێتەوە کە مەسەلەی بوون و پرسیاری گەردوونی دەربارەی بوون سەرەتا بەشێك بووە لە عیرفان و کاری عاریفان بووە کە قسە لەسەر ئەم بابەتانە بکەن ، باش ، کەواتە لێرەوە ئەوە دەزانین کە ئیشی عاریفانی پێشو پرسیاری گەردوونی بووە و دواتر ئیش کردن بووە لەسەر وەڵام دانەوە ئەو پرسیارانە یان بەشێکیان ، ئەم مەسەلەیە تۆزێك قسە هەڵدەگرێت ، بۆیە من پێم باشە کەمێك لەسەر





پەیوەندی فەلسەفەی دین و بەڵگەکانی بوون و نەبوون بدوێم ، بۆیە هەر پێشم باشە لەم بەشەوە بچمە سەر ئەو پەیوەندیە چونکە ئەم بەشە خۆی بریتی لە ((غەمی عاریفانە)) یان غەمی ((عیرفانی )) ، ئەم پەیوەندیە هەر لەگەڵ درێژی تەمەن و مێژووی فەلسەفەش دا بوونی هەبووە ، ڕەنگیشە یەکێك بێت لە جوانیەکانی فەلسەفە و بەشە پڕ جۆش و خرۆشەکانی ، وە ڕەنگیشە یەکێك خەوشەکانی فەلسەفەی دین بێت ، دیارە ئەمە بابەتێکی زۆر قسە هەڵگرە ، ئەویش لەبەر ئەوەی پەیوەندی دین و بوون پەیوەندیەکی تا ڕادەیەك ئاڵۆزە ، ئەمە بابەتێکە کە لە نێو کەینونە و پێکهاتەی ئێمەی مرۆڤ دا ئامادەگی هەیە دەزانن ؟ تەنانەت ئەوانەی کە باوەڕیشیان بە بوون نیە بە تەعبیرە قورئانیەکەی تەکفیری ئەو بابەتە دەکەن و دەیشارنەوە ئەگەر نا لە گوفتارمان دا ، لە دۆخی نا سروشتی مان دا، لەو دۆخانە دا کە ئیختیارمان لە دەست خۆمان دا نامێنێت بە مانا قورئانیەکەی لەو ساتانە دا کە لە ناو دەریادایین و ڕووبەڕووی شەپۆلە توندو گرژیەکانی دەریا دەبینەوە، لەوێدا ئیدی پەردەکان هەڵدەدرێنەوە ئەوەی لە ژێرەوەیە دەردەکەوێت (٦) ، جا بەم شێوەیە چونکە لێرە عاریفان بەشێکن لە دین و دیندارن ، ئەوا بەم میتۆدە دەڕواننە دونیا کە دەبێت یەکێك هەبووبێت

به شێوەیەکی کۆنکرێتی و گشتگیر گەرایی دونیای دروست
کردبێت ، بۆ هەڵگرتن و پێچانەوەشی سەرەتا بە شێوەیەکی
نا گشتگیرگەرا هەڵیدەگرێت و دواجار بە شێوەیەکی
گشتگیرگەرایی کۆی سیستەمی سروشتی دەپێچێتەوە ، من
هیوا خوازم کە بەڕێزتان لەمن تێگەشتبن لە بابەتی بوون و
نەبوون ، چونکێکم بەڕاستی ئەم بابەتە و هاوشێوەکانی
جێگای ئەوەیە کە مرۆڤ تەئەمول بکات لە دیاری دا ، با
بێینە سەر ئەوەی کە ئایا ئیشی عاریفانی ئێستا چیە؟ واتا
عاریفان ئێستا بە چ فۆرم و ستراکچەرێک ئیش دەکەن ،
عاریفانی وەکو یەحیا یەسریبی و عەبدلکەریم سروش و
سروش دەباغ و مەلکیان و جۆن هایك و محمد موجتەهید
شەبستەری و ... هتد ، زیاتر ئیش کردن بووە لەسەر
ئیشەکانی عاریفانی پێش خۆیان بەڵام بە میتۆدی
هەڵگێڕانەوەی کۆمەڵێك تێکستیان و خوێندنەوەی نویٚ بۆ
کارەکانی ئەوان ، واتا عاریفانی هەنوز پەیڕەوی عاریفانی
پێش خۆیان دەکەن بەڵام بە کۆمەڵێك جیاوازی و
جیاکاریەوە ، ئەمە بابەتێکە زۆر گرنگ نیە، وە هێندەش
پەیوەندی بە بابەتکەی ئێمەوە نیە ، بەڵام بۆ بەرچاو ڕوونی
خوێنەر وا باشترە ئەو جۆرە بابەتانەی کە دێنە نێو هزرمەوە
زیتر شیکارتری بکەمەوە ، ئەویش بۆ ئەوەی دواجار توشی





هەڵە نەبین ، پێم باشە بێمە سەر ئەو بابەتەی کە کۆنێکتی
نێوان مەحوی گەورە و عیرفانە ، ئەویش لەبەر ئەوەی کە
مێك تێگەیشتین لە عیرفانی سەردەمی پێش مۆدێرنە و
عیرفانی سەردەمی دوای مۆدێرنە ، هەڵبەت مەحویش
عاریفی پێش مۆدێرنە بووە .

مەحوی گەورە ئەڵێت :

تیٚ دەگا هەرکەس بکا فەهمی ڕموزی مەعنەوی
هیجر و وەصڵە نار و جەننەی ئایەتی (لا یستوی)

کێوی غەم وادی جەفا گەی کردنە ئەشراتی عیشق
باکی هەوراز و نشێوت کەی دەبیٚ گەر ڕەهڕەوی

ناوی هارو ، ئیسمی قارون ، ئیبتیدا ئیما دەکەن
سەرفرازە سەرکز ئاخر ، سەرنیگونە سەرقەوی

ئەی لەسەر تەختی غینا ئەمڕۆ ، سبەینیٚ تێدەگەی
ئەو گەدایەی تۆ کەوا مەحتاجی شێوی یەك شەوی

**دەنگی پیٚ ی ئەحبابی ڕۆیی و پڕ بە عالەم مەوج ئەدا**
**تۆ بە غەفڵەت موبتەلا، گەر نەیبیەی مەستی خەوی**

**تف لە چارەی خەندە گریە و شیوەنی پێخۆشە دۆست**
**داکە ئەی بارانی ئەشك ، ئەی بەرقی ناڵە نەسرەوی**

**باسی چیبکەم بیٚ کەرانی بەحری پڕ تەشویری عیشق**
**تاقە قەترێکی (فتوحات) ە ، نمێکە (مەسنەوی)**

**ساعیدی دەرکەوت و عالەم بو بە موسایی هەموو**
**موعجیزەی لێوی کە دەرخا ، جوملە دەبنە عیسەوی**

**زامی عاشق بوونی ئەو وەحشی نیگارە موشکیلە**
**مەبیە هەرگیز ئەم قسە : عەنقا دەبیٚ وەك کەو کەوی**

**چاوی بیماری ، بە وەعدی تیرە بارانی نیگاه**
**گفت دا ، جەهدیٚ کە ئەی دڵ ، بەڵکی تۆشی بەرکەوی**

**((مەحویا)) ! هەر ئەشك و ئاهی تۆ لە جیٚ جویٚ بونەوەت**
**چونە بەر بادی فەنایە ، دەرکەویٚ یا سەرکەویٚ**





**لە ڕاستیدا دوو گۆشە نیگا هەیە بۆ ئەوەی لە دونیا عیرفانیەکەی ئەم پیاوە تێبگەین، ئەویش یەکەم نیگا : شوێنکەوتوانی مەحوی ، دووهەم دژەکانی مەحوی :**

**<u>شوێنکەوتوانی مەحوی :</u>**

**قسەکردن لەسەر ئەو کەسانەی کە شوێنی ئەم پیاوە کەوتون ئاسانە ، بەڵام ئەوە ئاسان نیە لەوە تێبگەین کە ئایا شوێنکەوتوان و پەیڕەوانی ئەم پیاوە ئەشێت چ جۆرە کەسێك بن ؟ وە دەبێت ئەو دوو مەفهومە لە یەکتر جیا بکەینەوە کە ناوی لایەنگران و شوێنکەوتوانو ئەوکەسانەی کە مەحوییان خۆش گەرەکە ، چونکە ئینسانی وا هەیە مەحوی خۆش ئەوێت بەڵام کۆمەنیستەو هەروەها شیعرەکانیشی بە جۆرێکی تر لیٚ حاڵی دەبێت و بە تێزێکی مارکسیانەوە تێکستەکانی ئەم پیاوە دەخوێنێتەوە ، وە هەیە لیبراڵە و هەیە کۆنزێرڤاتیڤە و هەیە و هەیە و هەیە ،،،، بەڵامەکیٚ ئەوانەی کە پێیان دەوترێت شوێنکەوتوو یان (تابع) ی ئەو پیاوە ، ئەوانەن کە ئیرتیبات و تەماسیان لەگەڵ**

**خودی ڕۆحی ئەم پیاوە دا هەیە و ئاشنان بە ژیان و بەسەرەاتەکانی ئەو پیاوەی کە ناوی مەحوی یە ، جا بۆیە هەقە ئێمەیش ئینسیجام زیاتر لەگەڵ ئەو کەسانە دا بکەین تاوەکو جیلی پێشو کە باسم کرد وەکو دەستە و گروپی یەکەم ،گروپی دووهەم مەحوییان زیاتر خۆشتر دەوێت وەك لە گروپی دووهەم ، چونکە ئەمان زیاتر قاڵبوونەتەوە بە نێو ژیانی ئەم پیاوە دا وەك لە گروپی یەکەم کە تەنها ڕوکەشانە شیعرەکانی دەخوێننەوە و سودێکی مەعنەوی یان ەاڵف مەعنوی لێوەردەگرن ، هەبۆیەش خۆی لە شوێنێکدا دەڵێت:**

**بەر شەفاعەی ئەو شەفیعەم خەی خودا**
**خۆشم و ئەحباب و ئەهل و داك و باب**

**دژەکانی مەحوی :**

**دیارە کە دژەکانی کێن ، دژەکانی ئەوانە بوون کە شکاتیان لێ کرد ، تا ئەو ئاستەی کە چوو بوون بۆلای سوڵتان شکاتیان لێ کردبوو ، ئەویش دیارە بە هۆی زانست و**





**داناییەکەیەوە بووە ، بەڵام سوڵتانی عوسمانی کە عەبدولحەمیدی دووهەم بووە دەزانێی کە ئەم پیاوە لە پیاوە گەورەو و گەوهەرەکانە و بۆیە بە زوترین کات پشتی دەگرێت و خانەقایەکی لە سولەیمانی بۆ دەکاتەوە بە ناوی خانەقای مەحوی کە ئێستەیش ماوە ، جا گرنگە ئێمە ئەوە بزانین کە مەحوی ناحەزی زۆر بووە ، چونکە هەمیشە لە ژورەکەیدا فەقێ ی هەبووە و دەرسی وتوەتەوە بە فەقێیان ، بەڵام ئینسانی ناکەس و نا جۆر هەمیشە ویستویانە لەکەداری بکەن و بەڵام هەرگیز نەیان توانی ، دەڵێت :**

**چاری هەر دەرد و غەمێ کردنە مردن چبکا**
**نەیتوانیوە بکا چاری دەرد و غەمی حەسەد**

**لەم شیعرە ئەوەمان بۆ ڕوون دەبێتەوە کە حەسوود و پوچ و پوك تەنانەت مردنیش چاریان ناکات ، بەڵام ئەگەر ئێستا مابوایە ئەبوایە چی بوتایە بە خەڵکە !!**
**بابەتی فەلسەفی و چەمکە هزریەکان کە لە ناویان دا فەلسەفەی وشك هەیە و فەلسەفی تەڕ هەیە ، چونکە کتێبەکان ئەوە دەسەلمێنن ، واتا هەردوو پاکێجە**

**فەلسەفیەکە یەك هەناسەی نوسینیان نیە ، بگرە کۆمەڵێك جیاوازی و تەفاوت هەیە لە ڕووی هەناسەی فیکری قوڵ و زانستی ، کە باسکردنە لە سەر ئایدیۆ لۆژیای ترو فیکر و هزر و فەلسەفەی تر ، ئێوە ببینن کە مەبەستی مەحوی لەم شیعرە ئەوەیە کە کەسێ دەتوانێ جوانی خەتی دۆستی لە بەرچاو بێت و ببینێت ، بێگومان کە بەرهەمی چاوی خۆیەتی و وە هەر ئەوەش بەرهەمی بینین و چاویەتی ، من پێم وایە کە بێگومان هەموو کەس توانای ئەوەی نیە کە ڕوخساری دۆست ببینێت ، وە هەموو کەسیش مردنێکی مەردانە نامرێت ، وە هەموو کەسیش حەسو دو کینە لە دڵ نیە ، جگە لەو کەسانە نەبێت کە ئیدی ئاشقی ویستنی جوانی و مردنی مەردانە و دڵ پاك وسینە چاکەکان نەبێت ، مەحوی دەیەوێت بڵێت کە مرۆڤەکان هەموو خراپ نین ، بەڵام هەموشیان باش نین ، وە مرۆڤە دڵ ڕەقەکان ئیدی مردنیش چاریان ناکات تەنها ئەوە نەبێت کە دەسبەرداری ئەو کارەیان بن کە ئیرەیی و حەسودی بردنە بە کەسانی تر ، هەربۆیە لەم بەیتە دا ئاماژەی بەوە دەکات کە مرۆڤەکان ئەگەرچی نامدار بن بەڵام هەمیشە بەربەست هەیە لە بەرامبەر بێ ناو کردن و ناو زڕاندنیان .**





**سیل سرشك ما ز دلش کین بدر نبرد**

**در سنگ خارە خارە قطرەی باران اپر نکرد**

**(حافزی شیرازی)(٧)**

**واتا : لافاوی ئەشکی ئێمە کینەی لە دڵ دەرنەکرد ، دڵۆپە باران کاریگەری لەبەردی خارا نەکرد،**

**حافز پێ ی وایە کە دڵی یار لە ڕقی و سەختی دا هەر لەبەردی خارا دەچێت و هیچ جۆرە فرمێسکێك و گریانێك کاریگەری لەسەر نا بێت ، ئەمە ڕەنگە مەحویش هەمان مەبەستی هەبێت لە بەرامبەر دڵ ڕەقەکان ، ئەی ئەوەنیە حافز بە یار دەڵێت تۆ لە بەردی خارا دەچیت ، هەڵبەت بەردی خارا ئەو بەردەیە کە بە هیچ جۆرێ دڵۆپە دڵۆپەی ئاو ناتوانێت کونی بکات ، بەڵام مەبەستەکەی مەحوی ڕەنگە بۆ یار نەبێت ، ڕەنگە بۆ ئەوانە بێت کە دەیانەوێت ئەو و یار لە یەکتر بخەن و نێوانیان تێك بدەن ، واتا ڕەنگە ئەو بەیتە بۆ ئەوە وترابێت کە ڕەقیب نەك هەر تەنها ڕەقیبە بگرە خەسودیشە ، بۆیە حەسودەکان مردنیش چاریان ناکات ، وە**

**ڕەقیبەکان چونکە حەسودن ، ئەوانیش مردن چارەیان ناکات ، ئەمە لەبەرچی ؟ لەبەر ئەوەی حەسودن .**

## دووەم غەمخواری عاشقانە (عاشقی) :

**لە ئولکەی عیشقە دا بیٚ چونە سەر دار**
**بە ئاسانی مەزانە بوون سەردار**
**هەیە گەر عیشقی سەرداری لەسەرتا**
**بکە مەشقیٚ لەوانەی چونە سەر دار**

**((مەحوی))**





**حەزرەتی ((وەفایی))ش دەڵێت :**

**شەرحی دەردی ئارەزو مەندی لەگەس تەئسیری نابیٚ**
**ئەو کەسە دەردم دەزانیٚ گەر لە یاری خۆی جودا بیٚ**

**ئەی برادەر خانە وێرانی ، جودایی بۆ وەفایی**
**وەك وەفایی ئەی جودایی ، یاخوا خانەت خرابیٚ**

**غەیری دڵبەر دەردی دڵ ناڵینم بە هیچ کەس تا بمێنم**
**دەرد دڵ بۆ وەی بڵێم ، چاکە بە دەردم ئاشنا بیٚ**

**ئاخر ئەی سوڵتانی خوبان، تا بەکەی نا میهرەبانی**
**چاکە مەحرومم نەفەرموی ، یا خیتابیٚ یا عیتابیٚ**

**ڕۆژو شەو تۆ بویتە قوربان شیوەن و شینی دڵی من**
**کاری بولبول فەسڵی گوڵ ناڵینە تا ئاهێکی مابیٚ**

مەنعی سوتانم مەفەرموو ، با وجوودی ئەو جەماڵە
پیشەیی پەروانە هەر سوتانە ، تا شەوقی چرا بێ

هەرکەسێکی گوڵ فرۆشە ، باغی پڕ جۆش و خرۆشە
یا دەری گوڵزاری بگرێ ، یا لە بولبول بێ سەدا بێ

هەرچی تۆ پێتخۆشە مەحزی ڕەحمەت و مەقسودی دڵمە
گەر عیتابی (لن ترانی) یا خیتابی (أو دنا) بێ

بۆیێ سەرتا پا گوناهم ، بۆیێ عاسی و ڕوو سیاهم
تا گەدا شایانی ڕوحم و ئیلتیفاتی پادشا بێ

دوور لە ئەغیار و ڕەقیبان عومری دووسەد ساڵە دێنێ
دەست لە دەستی یار و سەحنی باغ و گۆشەی ماهتابێ

ڕەنگ زەرد و لێو بە بار و ئەشك بار و بێ قەرارە
زۆر پەرێشانە ((وەفایی)) وەك لە یاران هەڵبڕابێ(٨)





سەرەتا دەمەوێت کەمێك قسە لەسەر عیشق بکەم و دواتر تەماس و کۆنێکتی نێوان عاشیق و مەعشوق زیاتر ڕوون بکەمەوە و کۆمێنتی خۆمی لەسەر بدەم ئەگەر توانیمان ، لەو دوو بەیتە سەرەوە دا مەبەستی مەحوی گەورە زۆر ڕوونە و دەڵێت : لە وڵاتی عیشقدا بە بێ ئەوەی کە بچیتە ژێر پەتی سێدار و سەر دار ، ئاسان نیە کە ببیت بە سەردار و پادشای مەملەکەتی عیشق ،ئەگەر ئارەزوی سەرداریت لە مێشك دایە ، لەبەر دەستی ئەوانە دا فێر بە کە چونە سەردار و چاو لەوان بکە .

عیشق ئەو بابەتەیە کە بە بڕوای عاریفان بریتیە لەو شنە بایەی کە وە هەموو کەس ناکەوێت ، جگە لەو کەسانە نەبێت کە عاشقی عیشقن ، بەو مانایەی کە عاشن بەڵام هەڵگری کۆمەڵێك پرانسیپ و مەبادیئن ، هەڵگری ئەو بیر و بڕوایەن کە کەسێك عاشق بێت و لەسەر ئەو عیشقە جاویدانیە بمرێت شەهیدە، عیشق دەکرێت بڵێین پێچەوانەی درۆیە ، وە دەکرێت بڵێین مانا عیرفانەیەکەی عیشق پێچەوانەی ڕقی ئینسانەکانیشە بەرامبەر بە شتەکان و تا ڕادەیەك بەرامبەر بە خۆشیان ، ئاگری عیشق کە کەوتە سەر ئینسانەکان ئیدی ئەو کەسە دەکرێت پێ ی بڵێین عاشق ، عیش جۆری زۆرە ، دەکرێت ئێمە دوو بەشی

سەرەکی لێك جودابکەینەوە ئەوانەش یەکەم : عیشقی مەجازی و دووهەم عیشقی حەقیقی ، وە دەکرێت ڕقیش دوو جۆر بێت ئەوانیش ڕقی تەحقیقی و ڕقی مەجازی یان میتافۆڕی ، من نامەوێت بچمە نێو دونیای پرسیارگەلی وەك ، هەیە عاشقی ڕق و کینەیە و هەیە ڕقی لە عیشقە ، چونکێکم ئەوە دوو بابەتن یان دوو پرسیارن کە مرۆڤەکان هەمیشە وەکو کارایەکی لیکسیکۆ لۆژی بەرامبەر بە دەستەواژەکان بەکاری دەهێنن ، ئەوە ی گرنگە ئەوەیە سەرەتا ئێمە لە ڕق تێبگەین ، دواتر دێین مەفسیل و تەفاسیلی عیشق زیاتر ڕوون دەکەینە کە هەڵبەت لە عیشق باڵتریشمان هەیە کە دواتر باسی دەکەین ، کاتێك ئێمە دەمانەوێت دەرباری عیشق شتێك بڵێین ، کۆمەڵێك واریسی عیشق وەردەگرین بە نموونەی مەولانا و سەعدی و حەللاج و نیزامی و ... هتد ، وە ئەو مەواریسانەی عیشق مەواریسی حەقیقین و مەواریسی عیشقێکی حەقیقیشن ، لەمە دەکرێت ڕوونکردنەوە لە ئەرباب و مەواریسە حەقیقیەکانی عیشقی حەقیقی زیاتر بدەم ، ئەویش بەوە کە ئەم مەواریسانە لە پاڵ ەەبوونی عیشقی حەقیقی یەوە بە میتۆدی مەجاز عیشقە حەقیقیەکەیان دەربڕیوە ، وە ئەوەشی کە پێ ی وابووە ئەو کەسانە تەنها عاشقی مەجازی بوونە ، پێم وابێت





بەهەڵەیەکی گەورە و کوشندەیشدا چوون ، لیکەن ئەم بابەتە بابەتی ئێمەیەوە دەبێت بە جددی ئیشی لەسەر بکەین بۆ گەیشن بە مەفهومی حەقیقەتی عیشق خۆی دواجار جیاکردنەوەی عیشقی حەقیقی و مەجازی ، ئەمیش بۆ خۆ پاراستن لە تێکەڵاو نەکردنی ئەو چەمکانە ،با سەرەتا لەسەر حەقیقەت کەمێك بدۆێین و بڵێین گریمان یەکێك لە خولیکانی ئێمە دۆزینەوە و خەمخۆریە لە مەڕ حەقیقەت Truth ، مەبەستی من لە حەقیقەت گوزارشتە لە ڕاستی ، واتا مەبەستم مەبەستم لە ڕاستی هەمان ئەو چەمکە نەریتیەی کە (هاوشێوەی واقیعە) ، بەم پێ یە بێت کەسی حەقیقەت خواز کەسێکە حەز لە گەنجینی باوەڕەکانیدا لە ناوەڕۆکی درۆ کەم دەکاتەوە و ناوەڕۆکی ڕاستی پێ زیاد بکات ، بەڵام ئەم پێناسە و هەڵگرتنی ئەمجۆرە لە شوناس چەند گرفتێکی لۆژیکی گرنگی هەیە ، بەڵام ئەو بینراوانەی کە لە پێشەوە شاردراونەتەوە لانی کەم تا ئەو جێگایەی کە پەیوەستە بە بابەتەکەی ئێمەوە ، وا دەردەکەوێت کە جێگەی قبوڵ بێت .

دەتوانم ئێستا مانایەکی دی بۆ حەقیقەت پێناسە بکەم ، ئەویش ناوی بنێین حەقیقەت بریتیە لە دیمەنێك لە نێو کۆی دونیای واقیعگەرا، کە تۆ لەسەر بنەمای ناوەڕۆکی گەنجینەی باوەڕە هەنوکەییەکانی خۆت دا بە دەستی

دەهێنیت ، هەڵبەت ڕوونە کە حەقیقەت ڕەنگە لە لای من و تۆ جیاواز بێت ، ئەم کارە یان ئەم جیاوازیە لانی کەم بە هۆی ئەو بەڵگانەی خوارەوەیە :

یەکەم :جۆری ئەو گوزارە ڕاستیانەی کە لە گەنجینە باوەڕەکانی تۆ دا بوونی هەیە ، دەشێت لەگەڵ گەنجینەی گوزارە ڕاستیەکانی من دا جیاواز بێت ، بۆ نمونە ڕەنگە گوزارەی ڕاستی لە لای تۆ لە بارەی سیاسەت و ئابوری یەوە هەبێت و بەڵام لەلای من غیابی ئەو گوزارەیە هەیە نەوەك گوزارەکە خۆی ، ڕەنگە لای من هەندێك گوزارەی ڕاستی دەرارەی فەلسەفە بوونی هەبێت لە لای تۆ نەبێت ، وە ڕەنگە لەلای کەسێکی دی بوونی هەبێت بەڵام بەشێوەیەکی ڕێژەگەرایی .

لە دنیا جەننەتی خۆ دیوە هەر کەس<br>
کە تۆ بی حازری وەقتی وەفاتی<br>
ئەگەر ڕۆژە بتی من! هەر بتیٚ بیٚ<br>
سەرەو ژێرە کە تۆ وەك ڕۆژ هەڵاتی<br>
(مەحوی)





دووهەم : پێم وایە تەنانەت ئەگەر ستراکتۆری ڕاستی گەنجینەی باوەڕەکانمان وەکو یەك بن ، واتا هەر گوزارەیەکی ڕاستی لای من بوونی هەبێت و لەلای تۆش بەهەمان شێوە ، هەمدیسان ڕەنگە هەریەك لەمن و تۆ گوزارەی ڕاستی لای خۆی بە جۆرێکی جیاواز پەرە پێبدات و دەوڵەمەندی بکات ، واتا وێنای ئێمە بۆ جیەان تەنها بەرهەمی کۆمەڵە گوزارەی ڕاستیەکانی لای ئێمە نیە ، بەڵکو گۆڕانی ئارایش و پێکهاتەی ئەو گوزارانە وێنەیەکی جیاواز لە وقیعیەتمان پیشان دەدات ، تۆ وا دا بنیٚ هەریەك لە ئێمە شەش خاڵی ئەندزیاریمان لەلا هەیە ، وە هەریەك لە من و تۆ دەتوانێت لە شەش خاڵە چەندین شێوەی شەش ڕوو دروست بکەین کە هیچکامیان لەوی تر نەچێت .

سیٚ هەم : حەقیقەت خۆی تەنها شوێنکەوتەی ناوەڕۆکی ڕاستی گەنجینەی باوەڕەکانی ئێمە نیە ، مەولانا خالیدی نەقشبەندی دەڵیت : حەقیقەت ئاوێنەیەك بوو شکا ، هەر یەکێك لە ئێمە پارچەیەکی بچووکمان چنگ کەوت ، بەڵام

هەمووشمان ئیدیعای ئەوە دەکەین کە حەقیقەتی تەواو لە لای منە ، بەڵام ڕاستیەکەی خۆیشی وا نیە ، ڕەنگە ناوەڕۆکی ڕاستی بڕواکانی من و تۆ کوت و مت وەکو یەك بێت ، بەڵام ناوەڕۆکی درۆی باوەڕەکانی ئێمە ئێجگار جیاواز بێت ، لە ئاکام دا پێکهاتەی ناوەڕۆکی ڕاستیەکی یەکانگیر ، لەگەڵ جۆرەها گوزارەی درۆ دەتوانێت بە چەندین ئەنجامی جیاواز کۆتایی بێت ، وە ئەنجامانە خۆیان دەتوانن ڕاست یان درۆ بن ، هەر لە مونتەڵەقی باوەڕەوە مەحوی پێمان دەڵێت :

نەصیحەت بێ برا ! گور ڕۆڵە بوو مەڕوانە بۆ ئابا
گەواهی عەدلی ئەم دەعوایە ، پوری پوری مەڕوانە

مەتاعی صیدق و ئیخلاصم لە بازاڕی ڕیاکاران
لە سوڕەی (قل هو الله ) دەکەم لەم موشریکستانە

ئەوەندەم لەو قەدو باڵایە ئاشوب و بەڵا دیوە
لە سەیری سەروی باغم غایلەی غولی بیابانە





نەما جێ ی ئەو جگەر گۆشە ، مەگەر ڕۆح و ئەویش دەڕوا
جگەر سۆزانە ، دڵ بریانە ، دیدە پڕ لە گریانە

چ بەرقی جیلوەیەك هەوری بەهاری کردوە بێ تاب
بە ناڵەو گریەوە دێت و دەچێ وەك تازە دێوانە

سیابەختی لە مەجنونی من ئیتر چیت ئەوێ ((مەحوی))
سەرم شێواوە ، ڕۆژم تیرەیە ، حاڵم پەرێشانە

چوارەم : حەقیقەت لەوەیش کە نایزانین شێوە دەگرێت ، ئەوەی کە نایزانین ڕوون و ئاشکرایە ، ئەوە کە نایزانین جودا لەو شتانەیە کە بڕوای درۆمان لە بارەوە هەیە ، لە نێو ئەم دونیا جەنجاڵە دا کارو بارگەلێکی زۆر هەن کە لە بنەڕەت دا من لێیان بە ئاگا نیم بێ ئاگام لێیان ، واتا ناتوان باوەڕی ڕاست یان درۆم هەبێت لە بارەیانەوە ، بەم پێیە حەقیقەت تەنها شوێنکەوتەی زانیاریەکانی ئێمە نیە، وە ئەو هۆکارانەی دەتوانن لەلای من و تۆ ببنە هۆی جیاوازی حەقیقەت ڕەنگە زۆر لەمەش زیاتر بێت ، بۆیە من لێرە دا

بانگەشەی کۆکردنەوەی گشت ئەوانە ناکەم ، پێم باشە هەر ئەم چەند خاڵە بەس بێت بۆ تێگەیشت لە بابەتی حەقیقەت ، دەکرێت بڵێم حەقیقەت جیاوازیشە لە کەسی حەقیقەت خواز ، چونکە حەقیقەت خۆی کەمترین ئامانجی کەسی حەقیقەت خوازە ، بەڵامەکیٚ ئەوەی لە واقیع دا دەبێتە پشکی ئێمە (حەقیقەت) ە ، واتا بەشێك یاخود پشکێك لە کۆی حەقیقەت ، چونکە وێنایەك کە ئێمە دەیدۆزینەوە لە واقیع دا حەقیقەتە ، بەڵام بە هەمان شێوەی کە وتم حەقیقەتی من و تۆ دەشێت جیاواز بێت ، وە جیاوازی حەقیقەتی من و تۆ دەشێت بەرئەنجامی لانی کەم هۆکارێك یاخود چەند لەو هۆکارانە بێت کە باسم لێوە کردن .

گر ز سر عشق او داری خبر
جان بده در عشق و در جانان مگر

عشق دریاییست و موجش نا پدید
اب دریا اتش و موجش گەر





گوهرش اسرار و هر سویی ازو
سالکی را سویی معنی راه بر

سرکشی از هر دو عالم ەمچو موی
گر سر موی ازین یابی خبر

دوش مستی خفته بودم نیمشب
کاوفتاد ان ما از اشك تر

رحمش امد شربت وصلم بداد
یافت یك یك مو من جانی دگر

گرچه مست افاتده بودم از شراب
گشت یك یك موی بر من دیده رو

در رخ ان افتاب هردو کون
مست لایعقل همی کردم نظر

(کلیات/١٠٩٦)

**ڕۆحێك ئامادگی هەیە کە تەعبیر لە عیشق بکات و لە گەڵ**
**ئەوەش دا لە ژێر پەردەی ئەدەبە وە ئەو تەعبیرەی خۆی**
**دەکات و مەحوی پێمان دەڵێت :**

**ڕووتی دی لەو ڕۆژەوە گەر ڕۆژە سەرگەردانە ڕۆژ**
**گەییە ئێوارە وەکو من ئیشی قوڕ پێوانە ڕۆژ**

**ڕەهڕەوی ڕێگەی مەحەببەت وا دەبێ هەر سەعیەتی**
**تا هەیە لەم ڕێگە ئاخر کاری سەر دانانە ڕۆژ**

**لاجەرەم کردویە نوری جیلوەی ئەو ماهە بە چاو**
**دەوری بۆ ئەو شەمعەیە دایم وەکو پەروانە ڕۆژ**

**شەو بە ئێمە با نەویدی هاتنی جانانی دا**
**یەعنی: ئەی شەونم گەلینە مژدە بێ میوانە ڕۆژ**

**مەتڵەبت گەر یارە ، هەر سەعیت بەکارە دائیما**
**بۆ تەوافی قاپییەك وا بەر زەدە دامانە ڕۆژ**





**ئەڵبەتە مەجنونی ڕۆژی ڕوومەتی لەیلایە کە**
**موتتەصیل ، شام و سەحەر ، کەوتۆتە ئەم شاخانە ڕۆژ**

**ماهەکەم ئەمشەو شوکر ، پڕتەو ئەفشانی خانەیە**
**قەت لە دەرگا دەردەچم ، گەر بێتە ئەم سەربانە ڕۆژ**

**ئەم گلاراوەی لە عیشقا تا قیامەت هەر دەبێ**
**صەد مەسیحا چاری ناکا ، دەردی بێ دەرمانە ڕۆژ**

**ڕۆژ و شەو ئەم سەر زەمین و بن زەمینەی پشکنی**
**نەبووە شوێن هەڵگر لە عەکسی جیلوەی ئەو جانانە ڕۆژ**

**ڕۆحی بە فدا کە ، بزانە کێ یە چەوگان بازەکە**
**((مەحویا)) چەوگانە عیشق و ، گۆیە لەم هەیوانە ڕۆژ**

**حەقیە ڕۆژ و شەو کە بێ تابی دەکا وادەی ویصاڵ**
**شەو بوو ، بێ بەش ما لە وەصڵی ئەو سەراپا جانە ڕۆژ**

**شەو چ شەو ، لێ پشکواوی قەڕنەها سوبحی ئومێد**
**هەر لە داوێنی یەکێ سوبحا ، بەلەك پەنهانە ڕۆژ**

شەو شەوی میعراجی شاەی ئەنبیا بێ وا دەبێ
بیپەرستێ ، بەڵکی سوجدەی بۆ ببا ، هەر ئانە ڕۆژ

شەو نەبوو ، بەحری موحیگی عەنبەری بوو ناوی شەو
بو بە نیسبەت ئەو شەوە ، خاکستەری گوڵخانە ڕۆژ

بۆ کەمێ لەو عەنبەرە، بۆ تەقویەی ڕۆحی دەماغ
بێنی کا ، وەك ئێمە ، داییم چاوەڕێ ی ئیحسانە ڕۆژ

من فیدای ئەو زاتە بم ، بەو ، ئەو شەوە بوو بەم شەوە
تا قیامەت هەر حەسەد با ، بەو شکۆ وە و شانە ڕۆژ

تۆ قبوڵم کەیت بە عەبدی خۆت و بەندەی ئەو خودا
تا ببێتە خانە ڕوو بم ، چەند ئەگەر خاقانە ڕۆژ

دائیمەن سەر خۆیی و سەر ئال و سەخابەی بێ نیپار
پڕ بە عیلمی تۆ ، سەلامی تۆ ، هەتا تابانە ڕۆژ

بەڵکە ئەو وەقتە مەبروکە موبارەك جێگەیە





غەیری نوری ئەو ، نە مەه نوری لە ناوا ما ، نە ڕۆژ

لەو صەلاتانە کە وەك گەوهەرن و دەدرەوشێنەوە
جیلوە دەر، لامیع، هەموو ڕەخشندە ، وەك ڕەخشانە ڕۆژ

جا با عیشق و تەماسی عیشق لەگەڵ حەقیقەت بخەینە ڕوو، لە ڕاستیدا پەیوەندیەکی قوڵ هەیە لە نێوان عیشق و حەقیقەت ، وە ئەم پەیوەندیە خۆی وجوودی هەبووە، بە بێ ئەوەی ئینسانێك یان ویاتر لە ئینسانێك هاتبێت و ئەم پەیوەندیە تەوزیف بکات و ڕۆڵێ بداتێ ، لەسەرەوە باسی حەقیقەتمان کرد و پێم وابێت تا ئەندازەیەك توانیمان ئەرك و تەوزیفی ئەم بابەتی حەقیقەتە ڕوون بکەینەوە ، ئەوەی ماوەتەوە مەجازە کە گرنگی خۆی هەیە و دوو شتی تریش ماون کە دواتر باسیان دەکەم ئەوانەش پەیوەندی عیشق بە مەجازەوە و پەیوەندی مەجاز بە حەقیقەتەوە دەخاتە ڕوو .

وەكو وتم كۆنێكتی عیشق بە حەقیقەتەوە قوڵە و دەشێت زیاد لە ڕەهەندێك و زیاد لە پەیوەندیەكی هەبێت ، ئەویش بەو مانایەی كە عیشق بە بێ حەقیقەت تەواو نیە (غیر كامل) ، بەڵام دەشێت بە مانایەكی فەلسەفی مۆتۆلۆژیانە بڵێین كە خودی حەقیقەت پێویستی بە عیشق نیە ، ئەمە لە دەرەوەی سیاقی ئەوەی كە دەبێت بڵێین مانا ئینسانیەكەی حەقیقەت علشق بوونە بە حەقیقەت و مانا عیرفانیەكەیشی بریتیە لە عاشق بوونی حەقیقەت بە عیشق و عیشق بە حەقیقەت ، لێرەوە دەكرێت ئاگەداری ئەو پەیوەندیەش بین كە هێزی گرێدانی ئەم پەیوەندیە شاردراوەیەو نەبینراوە ، بەڵام لە هەمان كات دا هەستپێكراو ، بڕوام وایە ئێمە چەنێك قسە لەسەر ئەو پەیوەندیە بكەین ناكەینە ئەنجامێك كە دواجار بمانگەیەنێتە كەناری یەقین و ئاسودەگی ، بەڵام بەهەر حاڵ ئێمە هاتوین ئەوە بڵێین كە دەشێت نەوترابێت ، یان وترابێت و ئێمە زیاتر تەوزیفی بكەین و ڕۆڵی پێ ببەخشین ، عیشق بابەتێكە لە لای عاریفان جیاوازە وەك لە لای كەسانی ئاسایی، وە حەقیقەتیش بە هەمان شێوە لە لای عاریفان جیاواز ترە وەك لە لای كەسانی سروشتی و ئاسایی ، وە پەیوەندی نێوان عیشق و حەقیقەت بە هەمان شێوە جیاوازە لە لای عاریفان وەك لە لای مرۆڤە ئاساییەكان و نۆرماڵەكان ،





بۆیە سەرەتا دەبێت ئاگەداری ئەو خاڵە بین كە ئایا ئێمە كە قسە لەسەر پەیوەندی نێوان عیشق و حەقیقەت دەكەین ، قسە لەسەر ئەم پەیوەندیە دەكەین لە لای كێ ؟ من پێم باشە قسە لەسەر هەردوو جۆرەكەی بكەم و بەڵام سەرەتا لەو پەیوەندیەوە دەست پێ دەكەم كە لە نێوان مرۆڤە سادەكان دا هەست پێ دەكرێت ،مرۆڤە سادەكان چونكە ئاستی (راسیۆنالیزەیش) یان تا ڕا دەیەك كەمە ، واتا ئاستی هۆشیاری و ئاگایی یان ، بۆ بە ئاستەمیش لەم پەیوەندیە تێدەگەن ، بگرە گروپ یان ئیتنی واهەیە لە كۆی ئەو مرۆڤە سادانە هەست بەو پەیوەندیە هەر ناكات ، چونكە بوونەوەرێكە خاوەنی شوناسی پێرفێكت راسیۆنال نیە ، ئێ باشە خۆ دواجار عاریفەكانیش خاوەنی ئەو پێرفێكت راسیۆناڵە نین ، بەڵام دەكرێت بڵێم عاریفان زۆر جیاوازن لەو كەسانە ، ئاخر كەسێك نەزانێت حەقیقەت چیە ناشزانێت عیشق چیە ، كەسێك نەتوانێت لە عیشق تێبگات ناتوانێت بگات بە سەرمایەی حەقیقەتیش ، بەڵام عاریفان هەمیشە ویستویانە لەڕێگای ناسینی عیشقەوە بگەن بە حەقیقەت ،یاخود دواجار گەیشتون بە حەقیقەت و لەوێشەوە بەرەو كەناری عیشق ملی ڕێگایان گرتۆتە بەر و ڕێگایان تەی كردوە ، مرۆڤی ئاسایی كە حەقیقەتی عیشق و عیشقی

حەقیقی بە تەواوی نازانێت و لەلای نیە هەمیشەیش لاڤ
کەمالات و گەیشتن دەدات ، بەڵام هەرچی عاریفانن تەواو
پێچەوانەی ئەم هاوکێشەیەن کە لەلای مرۆڤە نۆرماڵە کان
هەیە ، ئەوان پێیان وایە چەنێك لە حەقیقەت نزیك بیتەوە
ئەوەندە دوریت و چەنێك لە عیشق نزیك بیتەوە ئەوەندە
دوریت ، مەحوی لە شوێنێکدا دەڵێت :

**هەر گفتوگۆمە ، کەچی هەر دەڵێم و تیٚ ناکەم**
**هەر جوست و جۆمە ، کەچی هەر دەڕۆم و پیٚ ناگەم**
**چاوم ڕواو گۆشەیی ئەو ئەبروەم نەدی**
**دڵ بوو بە بەحری عولوم و، لە ئەلف و بیٚ ناگەم**

بۆیە عاریفەکان هەمیشە لە گەیشتن بە شتەکان هەست
بەکەمی و نەگەیشتن دەکەن و هەمیشەیش لە هەوڵی ئەوەدان
کە بگەن بەو شوێنەی کە خۆیان مەبەستیانە ، بەڵام ئەوانی
تر ئەمەیان ناوێت و ئەوەش ناڵێن کە عاریفان مەبەستیانە ،
ئەمە وێڕای ئەوەی کە عاریفان بە شوێن و مەبەستی وا
گەیشتون کە ئینسانەکانی تر بە ئاسانی و سانایی پیٚ ی
ناگەن.





جۆرە پەیوەندیەکی شاردراوەی تریش هەست پیٚ دەکرێت
لە نێوان عیشق و حەقیقەت دا ، ئەوەش ئەوەیە کە
عاشقەکان زۆر کات لەو بڕوایەدان کە گەیشتون بە
حەقیقەتی خۆیان ، پێم وایە دەشێت بەشێکی ئەو عشقە
ڕاستەقینانە مەبەستەکەیان تەواو بێت ، بەڵام من ناتوانم
ئەوەش بشارمەوە کە هەموویان ئەو قسەیەی من
نایانگرێتەوە ، واتا گشتاندن نابێت تەنانەت بۆ عاشقە
ڕاستەقینەکانیش ، چونکە ئەوە تۆیت عاشقی ڕاستەقینەیت
و بەڵام ئەی بەرامبەرەکەت کیٚ یە ؟!

**مەحوی دەڵێت :**

**بڕوانە سوتنم ، وەرە ، بڕواکە من نەمام**
**پەروانەم ئیترم نیە پەروا کە من نەمام**

**ئەو نەمامە کەی بەری میهر و وەفا دەدا**
**بۆ من ، دەستی جەور و جەفا دا ، کە من نەمام**

**بازاڕی دەرد و غەمکەدەی ئەندۆە و ، کونجی غەم**
**بیٚ ڕەونەق و نیشات و صەفا کە من نەمام**

**مانم ئەوەندە پڕ فەتەراتە ، کە قەوم و خوێش**
**ئوممێدی هەر بە عەفوە کە من نەمام**

**چقڵی مەزاری من چەقیە دامەنی ، چ سود**
**شومی بەرۆکی بەختمی بەردا کە من نەمام**

**ئەو شۆخە هەر کە نەعشی منی دی قیامی کرد**
**چی بم من ؟ ئەم قیامەتە هەستا کە من نەمام**

**((مەحوی)) کە غەمیە مردم و غەم پەروەری نیە**
**(غەم) مایەوە بە بیٚ کەس و مەئوا ، کە من نەمام**

**بەرامبەر و کەسی دووهەم گرنگە کە تۆ عاشقیت بەو ، لە لای عاریفان هەمیشە کەسی دووهەم یەکەم و ئەوان دووهەمن و پاشکۆی کەسی دووهەمن ، بزانن کە ژیان هەرگیز ناوەستێت و بە زیندویی دەمێنێتەوە ، هەمیشە**





**وەکو ئەدۆنیس دەڵێت : باوکێك شاهێدی مەرگی باوکی خۆی ئەبێت ، وە ڕەنگە شاهێدی مەرگی کوڕەکەشی ببێت ، بڕوا بە خاڵێکی گشتگیر دەهێنم لێرە دا ئەویش ئەوەیە کە تەنها عاشقەکان دەتوانن خۆیان لە بەشێکی گرنگی دونیای حەقیقەت بدزنەوە ، ئەویش لەو چرکە ساتە دا ڕوو دەدات کە کاتێك عاشق بیەوێت پەنا بەرێتە بەر هەموو پاساوێك بۆ گەیشتن بە مەعشوق ، واتا کەسی عاشق تەنانەت ئامادەیە پەنا بەرێتە بەر درۆگەلێکیش ، بەڵام بۆچی ؟ بۆ ئەوەی دواجار بتوانێت بگات بە عیشق و تەنانەت بە بڕوای ئەو ئەو عیشقە ، عیشقێکی حەقیقیشە ، بەڵام ئایا دەکرێت ئێمە بڕوا بەوە بهێنین کە مرۆڤ دەتوانێت لە ڕێگای درۆوە بگات بە حەقیقەت و ڕاستی ؟! یانی ئێمە با بگەڕێینەوە بۆ مێژووی ئەم دیاردەی حەقیقەت و گەیشتن پیٚ یە ، یان مەسەلەی خۆ بە حەق دانانە ، بۆیە دەڵێم با بگەڕێینەوە بۆ میژوو ، چونکە دڵنیام مێژوو جگە لە گێڕانەوەی حیکایەتەکانی نێو دونیا شتێکی دی ناکات دەزانن؟ وە لەتەك ئەمەش دا مێژوو بریتیە لە ڕەنگدانەوەی نموونەی عیرفانی و ئاینی و هەتا مێژوو پێمان دەڵێت کە مەولانای ڕۆمی کیٚ بووە و مەحوی کیٚ بووە و سەعدی و حافز و نالی کیٚ بوونە ، وە تا دەگاتە ئەو پنتە کە مێژوو وە گۆ دێت و پێمان دەڵێت حیکایەتی**

عاشقەکان لە کوێوە دەستی پێ کردوە وە لە کوێشدا کۆتایی پێ هاتوە ، واتا مێژوو تەنها بریتی نیە لە وێنە ، نەخێر مێژوو بریتیە لە نوسینیش ، هەمیشە مێژوو پەیوەست بووە بەو حیکایەتانەوە ، جا بەشێك لەو حیکایەتانە هەڵبەت پەیوەندی بە نموونەی سیاسی و زانستەکانی سەردەمی خۆشیەوە هەیە ، بۆیە پێم باشە کە لە مێژووی پەیوەندی نێوان عیشق و عیرفان تێبگەین ، ئاخر بۆ؟ لەبەرئەوەی تێگەیشتن لە مێژووی ئەم دوو بابەتە بۆ خۆی گرنگە ، دڵنیام بەشێکی زۆرتان دەزانن کە مێژوو وەکو مێژوو ، لە سەدەی نۆزدەهەمەوە چۆتە نێو پرۆسەی خوێندنەوە ، بۆیە گرنگە لە مێژووی ئەم دوو بابەتە تێبگەین ، پێم وابێ مێژووی هەردوکیان پێکەوە نین ، هەڵبەت حەقیقەت پێش هەموو شتێك هەبووە و دواجار وەکو فەیلەسوفێك دەڵێت (حەقیقەت خۆی هەیە ، بەڵام درۆ دروست دەکرێت) ، بەڵام مەسەلەی عیشق ئەوە دەبێت بگەڕێینەوە بۆ سەرەتای درووست کردنی ئادەمیزاد ، لە ناو کوردەواری خۆمان دا شتگەلێك و قسەگەلێکی سەیر و پڕ مانا هەیە ، یەکێك لەو قسانە کە گوێم لێ بوو لە هاوڕێ یەکم دەیوت : وەختی خۆی کە باوە ئادەم و دایکە حەوا هاتنە سەر زەمین ، ئیدی دەبوو بە شەڕیان و باوە ئادەم داوای لە





خوای گەورە دەکرد کە یان ئەم یان دایکە حەوا بەرێتەوە ، جا کە دایکە حەوا دەمرد و جێ ی دەهێشت، باوە ئادەم تامەزرۆی دیدار و بینینی دەکرد و دووبارە داوای لە خودا دەکردەوە کە دایکە ئادەمی بۆ بگەڕێنێتەوە ، ئەم نموونەیە دەشێت بڵێین خۆی دەلالەتە لە تێگەیشتن لە واتای عیشق و دواجار دەبێت بڵێم عیشق بەشێکی گرنگی نێو واتای ژیانە ، واتای ژیان مەسەلەیەکی تا ئەندازەیەك تێکەڵاوە ، بۆیە ئەگەر بتوانم لێرەوە کەمێکی لێ دەخەمە ڕوو ، ئەویش بۆ ئەوەی بتوانین مانای ژیان و مانای عیشق پێکەوە گرێ بدەین و پەیوەستەگیەك لە نێوانیان دا ببینین کە خۆی هەیە و ڕەنگە هەندێك لە ئێمە نەیبینین، سەرەتا دەبێت دوو مەسەلە لەیەکتر جیابکەینەوە بۆ تێگەیشتن لە واتای ژیان ، چونکە هەندێ جار مەبەست لە واتای ژیان ئامانجی ژیانە ، هەندێ جاریش مەبەست لێ ی سود و قازانجی ژیانە ، ئەم دووانەش زۆر لەیەکدی جیاوازن ، بۆیە من سەرەتا دەربارەی واتای ژیان بە ئامانجی ژیان قسە دەکەم وپێم وایە هەندێکجار ئامانج دەدرێتە پاڵ بوونەوەرێك کە خاوەنی ئیرادە و زانستە ، وە هەندێك جاری تریش دخرێتە پاڵ ئەو کەسانەی کە بە هیچ جۆر خاوەنی ئەو دوشتە نین کە دانش و ئیرادەیە،ئێستا ئێمە لە پەیوەندی بوونەوەرانێك دا کە

خـاوەنــی زانــست و ئـیرادەن ئـاوڕ لــە مــرۆڤ دەدەینــەوە ، بوونـەوەر لـە یـەك بـەیـەكـی ئـەو كارانـەی كـە بـە هۆشیاریەوە ئەنجامی دەدات ، گەیشتن بە شتێك لـە پێشچاو دەگرێت كـە ئەو شتا ئامانجی پیێ دەوترێت ، ئەو جۆرە ئامانجەش كە لە هەناوی مرۆڤەكە دا یە پیێ دەوترێت ئامانجی خودبینا ، واتا ئامانجێك كـە بونیـادەكـەی لـە خـودی بوونـەوەرێكـی خـاوەن ئیرادە و زانستە ، بەڵام هەندێك جار ئامانج ئامانج دەدرێتە پاڵ بوونەوەرێك كە شوناسی زانست و ئیرادەی هـەڵنـەگرتوە ، لـەم جـۆرە حاڵـەتانـە دا كاتێـك دەپرسـین ئامـانج چـیە ؟ مــەبـەسـت لــەمــەیــە كــە (بونیادنــەری) ئــەم بوونــەوەرە چ ئامـانجێكی لـە بونیادنـانی ئـەم ئامانجـە دا هـەبـووە ، ئـەم ئامانجـەش ئامـانجی دەرەكیـە ، واتـا ئامانجێك لـە هـەنـاو و دەروونـی خـودی مرۆڤـەكـە دا نیـە ، بـەڵكو لـە دەرەوەی ئـەو دایە ، واتا لە هزر و ویژدانی ئەو دا بوونی هـەیـە نـەك دەرون ، واتـا لـە ویـژدان و هـزری دروستكـەری ئـەو دایـە ، تـەنانـەت كاتێـك ئامــانجێكیش دەدرێتــە پــاڵ ڕەفتــاری مرۆڤێــك ، مـەبـەستمان هـەر ئـەم واتایـەی دەرەوەیـە ، چـونكە هـەمـوو ڕەفتـاری مـرۆڤ خـاوەنـی زانـست و ئـیرادە نیـە ، تـا ئێـرە بـۆ جیاكردنـەوە ئامانجی خودبینا و ئامـانجی دەرەكـی بـەسـە ، بـەڵـام ئایـا دەشێت ئامـانجی خودبینـا بدرێتـە پـاڵ ژیـان ؟وا





دێتە پێش چاو ئەگەر مەبەست لـە ئامانج ئامـانجی خودبینـا بێـت ، دەبێـت بڵـێم كـە ژیـان هـیچ ئامـانجێكی ئـەو تـۆی نیـە ، چونكە خـاوەنـی زانـست و ئـیرادە نیـە وەكـو باسـم لێـوە كـرد تـاوەكـو ئامـانجی هـەبێـت ، ئایـا دەشـێت ئامـانجی دەرەكـی بدرێتە پاڵ ژیان كە خۆی بۆ خۆی خـاوەنـی زانـست و ئـیرادە نیە ؟! پرسیاری سەرەكی ئەمەیە بۆ نموونە هـەر وەك ئـەوەی كـە : بـۆ سـەعـات درووسـتكـەرێكـی خـاوەن ئـیرادە و زانـست بــوونـی هــەبــووە ، بــە هــەمــان شـێوە بـۆ مرۆڤــەكــانیش سازێنـەرێكـی خاوەن زانـست و ئـیرادە هـەیـە یـاخود نـەخێـر ؟ وەڵـامی ئـەم پرسیارە پـەیـوەسـتە بـەوەی كـە ئایـا تـۆ مادیـت یـاخود بـە واتـایـەكـی تـر سـیكـۆلار بیـت یـان ئیلاهـیش بیـت دەگـۆڕێت ، ئەگەر تۆ مادی یـان سـیكـۆلار بیـت ئـەوا بێگومـان بـاوەڕت بـەمـە نیـە كـە ژیـان بـەدیهێنـەرێكـی هـەیـە ، كـە بەهرەمەندە لە زانست و ئیرادە ، لـەم ژیانـە دا ناتوانین بڵێین ژیان خاوەنی ئامانجێكی دەرەكیە ، لە لایەكی دیكەوە ئـەگـەر ئیلاهـی بیـت دەتـوانیـت بـە ئاسـانی بـاوەڕ بـەمـە بـەێنیـت كـە سیكۆلار و مادیەكان باوەڕی پیێ ناهێنن ، واتـا بـاوەڕهێنـان بەوەی كە ژیان سازێنەرێكی هەیە و ئەو سازێنەرەش زانست و ئیرادەیە .

## مەحوی بڕوای تەواوی بە مەسەلەی مەعنەویەت هەیە و دەڵێت :

**دەوای ئەم نەفسە مەلعونەت دەویٚ ، هەر دەردە وەك جیوە**
**کە هاتی کوشتتن، ئەو ڕۆحی مەحز، ئەم جەوهەری زیوە**

**لە دنیا تا دەگاتە ئاخیرەت ، کاریگەرە تیری**
**وەکو تەهەمتەن زامی پام ئەم دیو و ئەو دیوە**

**لە ئەحواڵ و مەقامات ئەردوا خۆ ، خۆ نەگۆڕیٚ لێت**
**هەر ئەو گورگە ، ( ئەبو زەیدی سوروچی ) تەوری گۆڕیوە**

**عەلاوەی بوونە ڕۆح ، هەر بیکوژیٚ ، ئەعدا عەدو دەکوژیٚ**
**چ عەقڵە ؟ دوشمنی وا پەروەری کیٚ خێری لیٚ دیوە ؟!**

**لە عیشوەی پڕ فەنی دنیا مەبە ئەیمەن ، کە وەك نۆشی**
**بە تەفرەی مەی ، بە صەد دانا قەرابەی زەهەری نۆشیوە**





**وەکو (قەترینە) بحریٚ دین و دنیای پێشەکی لیٚ سەند**
**بە هەر کەس قەترەیە بەر ماوە وەصڵێکی ڕەوا دیوە**

**وەکو دێو ئیشی عەکسە ، میهری قەهرە ، شەربەتی زەهرە**
**فریبە : گەنمی هەر جۆ ، شیری هەر دۆ ، ڕۆنی هەر پیوە**

**کە دەستت بۆ لە سەر سەر نیٚ ، سەر و ماڵت بە غارەت چوو**
**کە لێوی پێکەنیٚ ، عالەم دەما سەر شێت و کالیوە**

**لە مەکری ئەم عەجوزە و سیحری دێوی نەفس ئەمن ((مەحوی))**
**پەنا دەگرم بە زاتی ئەقدەسی بیٚ چونی نادیوە**

**بەم پێیە دەتوانیت ئەوە بڵێیت کە ژیان خاوەن مانایە و خاوەنی ئامانجی دەرەکیشە ، بەڵام وەکو موستەفا مەلەکیان دەڵێت : هەندێك جار مەبەست لە مانای ژیان ئامانجی ژیان نیە ، بەڵکو سود و قازانجی ژیانە ، کاتێك دەتوانین بۆ شتێك سودێك لەبەرچاو بگرین کە ئەو شتە لە تانوپۆیەك دا یاخود سیاقێك و ژینگەیەکی گەورە دا لە پێش چاو بگرین ، پاشان**

**پرسارەکەی ئێمە ئەوە بێت کە ڕۆڵی ئەمە شتە لەم تانوپۆ و سیاقە دا چیە ؟**

**سەبارەت بە مرۆڤیش دەبێت یەك ژینگە یان یەك تانوپۆ لە پێش چاو بگرین و پاشان بڵێین کە لەم تانوپۆیە گەورەیەدا ئەم بەشە بچوکە چ ڕۆڵێك دەگێڕێت ؟!**

**لێرە دا باس لە ئامانج لە گۆڕێدا نیە .**

**بەڵکو باش لە کارکرد و ڕۆڵێکە کە شتێك لەم کۆمەڵە گەورەیە دا دەیگێڕێت ، تەنها جیاوازیەکی کەسێکی ئیلاهی لەگەڵ مادیەك لەمە دایە کە دوایین گەشتێك بۆ کەسێکی ماددی سروشتە ، بەڵام کەسی سروشت بەبەشێك بە گەشتێکی دورتر دەزانێت بە ناوی میتافیزیك یان جیهانی بونەوەر کە باڵادەستە بەسەریدا ، هەموو قسەکانی من تا ئێرە تەنها سەبارەت بە مرۆڤی نێو ژیان بوو ، واتا ئەو مرۆڤەی کە واتایەکی جیاوازتر لەویدی بە ژیان دەبەخشێت ، بەڵام ڕەنگە کەسێك لەبری ئەوەی کە ژیانی مرۆڤایەتی یان ژیانی مرۆڤ بەشێوەیەکی گشتی بخاتە ڕوو ، بەشوێن مانای ژیانی خۆیدا بگەڕێت ، کاتێك قسەو باس لەمانە شتێك دەکات دەبێت بەوردی ئەوەش دیاری بکەین کە:**





**مەبەست لەمانا ئامانجە یان سود؟**

**مەبەستیش لە ئامانج ، ئامانجی خودسازە یان ئامانجی دەرەکی؟**

**ئایا پرسیار دەربارەی ئامانج دیاردەیەکە یان ئەوە ئامانجە یەکێکە لە دەرئەنجامەکانی ئەو دیاردەیە ؟**

**پەیوەندی عیشق و مانای ژیان :**

**عیشق کۆمەڵێك مانای جیاوازی هەیە ، ئەگەر مەبەست لە عیشق ، عیشق بۆ هاوڕەگەز بێت ئەوە پاوەنخوازی نیە ، بەڵکو جۆرێکە لە عیشق کە من دەتوانم لە یەك کات دا بۆ هەموو مرۆڤەکام هەمبێت ، گومانی تێدا نیە کە ئەم جۆرەی عیشق دەتوانێت مانا ببەخشێتە ژیان ، بەڵام چەند بەشێکی دیکەشی هەیە ، کە یەکێکیان عیشقی** exclusive **, لەم عیشقە دا عاشق خوازیاری ئەوەیە کە مەعشوق تەنها مەعشوقی ئەو بێت و وێڕای ئەمەش توانای ئەوەشی نیە کە خۆیشی مەعشوقێکی دیکەی هەبێت ، لە ڕوی تیوریەوە کێشەیەك نیە کە بڵێین عیشقی** exclusive **یش دەتوانێت مانا بە ژیان ببەخشێت ، مەحوی گەورە جوانی فەرموە**

**دەربارەی ئەم جۆرە عیشقەی کە لە کۆتاییدا باسم لێوەکرد و دەڵێت :**

**ئەگەر تۆ ڕوو بە خاڵێکی لە (لەیلا) شۆخ و زیباتر**
**منیش ئاشفتە حاڵێکی لە (قەیس) م شێت و شەیدا تر**

**بە دڵمە جوێنی ئەو لێوە ، لە بۆسە نەشئە بەخسا تر**
**لە کن تریاکیە ئەڵبەتە قاوە صەد لە چا چاتر**

**لە کۆیا موددەعی دیمی ،بە ئیستیهزا وتی : شاەم**
**گەدای ئەم کۆیە بم ، شاهەنشەهێکم صەد لە شا چاتر**

**لەبەر دەرگاهی عیشقا یەکسەرە هەرکەس سەر دانا**
**ئەگەر پەتیارەك بوو ، بوو لە صەد عەللامە داناتر**

**بنازم بەم شەهی مەه سەیرە ، بۆ گەشت و گوزاری شەو**
**سوارێکە : بوراقی تەوسەنە ، جیبریلیە شاتر**

**لە دنیا تێپەڕی هەرکەس بێ باڵی هیممەت ئازایە**
**لە عوقباش ئەو کەسە گەر تێپەڕی ، بازێکە ئازاتر**





**ئەگەر ئەم ئەهلی دنیایە ، وەکو هەن ڕێخەنە جەننەت**
**دەنائەت زوو دەکا ئەو دونیە لەم دونیایە دونیاتر**

**کەسی من گەر کەسن ، کەس من نەخاتە فیکری ئەو شاهە**
**بەیادی ناکەسان ئازوردە حەیفە خاگیری عاتر**

**خودا بیدا بە ڕەحمەت ، داغی دڵ چاوی دڵە ((مەحوی))**
**بە گریە چاو ئەگەر چوو ، شك دەبەم چاوێك بیناتر**

**دیارە بەدەر لە سیاقی ئەم پەیوەندیە ، دەکەوینە نێو سیقی دوو بابەتی تر کە بەتەواوی و کۆنکرێتی ئەنتی پەیوەندی ئەو دوو کۆنسێپتەی پێشوون کە باسم لێوەکردن ، کە ئەوانیش عیشق و حەقیقەت و دواجار واتای ژیان و کۆنێکتی واتای ژیان لە گەڵ واتا عیشق ، ئەو پەیوەندیە ئەنتیەش دەتوانم ناوی بنێم : زڕە عیشق و زڕە حەقیقەت ، واتا هەبوونی زڕە ، کەوەکو شێرپەنجە لەهەر بزاوتێکی ئەدەبی و مەعنەوی و فەرهەنگی و ڕۆحی و هونەری دا**

ڕیشەی داکوتاوە ، واتا هەبوونی عیشقی درۆ و حەقیقەتی درۆ ، بوونی عیشقی درۆ و زڕ و ساختە لە دەموچاوێکی حەقیقەت گەرانە دا،لێرەوە بڕوام بەوە هەیە کە زڕە عیشق دەیەوێت لە بەرگی حەقیقەتی عیشق دا خۆی نمایش بکات ، بۆ نمونە ئەگەر بگەڕێینەوە بۆ عیشقی هاو ڕەگەز و کەمێك تێبفکرین ،دەبینین هەموو عیشێکی هاو ڕەگەز ، واتا ئەو عیشقەی کوڕێك هەیەتی بۆ کچێك و بە پێچەوانەشەوە ، ئەو عیشقە نیە کە بە هەموو مانایەکەوە پێ ی بڵێین عیشقی تەحقیقی، چونکە لە ڕاستیدا ئەم جۆرە لە پەیوەندیە خۆی لە ناوە وە ئیشکالیەتی هەیە وە نەیاوانیوە بە شێوەیەکی ڕێك ئینسیجام بکات، واتا ئینسیجامنەکردنی ئەمیان لەگەڵ ئەویان و ئەویان لەگەڵ ئەمیان دا هەست پێ دەکرێت لە ستراکچەری پەیوەندیەکەیان دا ، مەعنەویەت ئەگەر نەبوو بە بەشێك لە عیشق ، ئەوکات ئەو عیشقە زڕە عیشقە ، وە ئەگەر مەعنەویەت نەبوو بە بەشێك لە حەقیقەت ئەوە دەبێت بونرێت ئەوە حەقیقەتی تەواو نیە و هاڵف ترەس و نیوە حەقیقەتە ، کەواتە ئاروزومەندی بۆ گەیشتن بە سامانی عیشق و لەوێشەوە شۆڕبوونەوە بۆ دونیای حەقیقەت و ئالودە بوون بە خودی عیشق و حەقیقەت ، ئەوە دەبێت تەنها و تەنها پەنا بەرینە بەر عیرفان ، ئەمە و دروستکردنی





پەیوەندی لەگەڵ عیشق دا و هەروەها ئیشکردن لە سەر بە تەحقیقکردنی عیشق ، هەر لە ڕێگەی عیرفانەوە دەبێت ، وە دەشبێت بڕوا بەوە بەێنین و دانی پیا بنێین ، کە عاریفان لە کۆ هەستی عیرفانەوە نادوێن ، دەشێت عاریفان شتگەلێکی زۆریان وتبێت ، بەڵام هێشتا ئەوەندە بەس نیە بۆ خودی عیرفان ، وە ڕەنگە عیرفان داوای فۆرمەلەکردنی زیاتر بکات و عاریفان زیاتر عەوداڵ و ئاشنا بکات بە قەول و ئەقوالی مەعریفی و دونیاکەی خۆی کە بریتیە لە دونیای عیرفان ، ڕاستیەکەی ئەو غەمەی کە عاریفە عاشقەکانیش هەیانە دەشێت بڵێین جیاوازە لەو غەمەی کە تەنها شاعیرێکی عاشق هەیەتی ، هەریەکێك لە ئێوە دەکرێت ڕۆژێك شیعرێکی عاشقانەتان خوێندبێتەوە ، وە دەکرێت ڕۆژێك سەرسام بووبن بە شیعرێکی عاشقانەی هاوچەرخ ، بەڵام ئەو عیشقە ڕاستی و حەقیقیەی کە وجوودی هەیە تەنها ئەو عیشقەیە کە لەلای عاریفانمان هەیە ، ئەو عیشقەیە کە لە لای کەسانی وەکو مەحوی گەورە بوونی هەیە ، ئەمە بەو واتایە نایەت کە ئیدی ئەوانی دی عاشق نین ، نەخێر ، من مەبەستم مانا قوڵەکانی عیشقە ، نەك تەنها عاشق بوون ، ئێمە گرنگە کە شتێك ئەبین پێویستە سەرەتا هۆشیار بین دەربارەی ئەو بابەتە ، عەبدولکەریم سروش لە کتێبی بسط تجربە نبوی دا

دەڵێت : ئەگەر ئێمە بمانەوێت ئازاد بین ، پێویستە لە ماناکانی ئازادی تێبگەین ، واتا تێگەیشتن پێش پێگەیشتن ، منیش پێ وایە ئەگەر بمانەوێت بە تەواوی عاشق بین پێویستە لە مانا قوڵەکانی عیشق تێبگەین و ڕەهەندە جیاوازەکانی تری دونیای ئەو دیوی عیشق بخوێنینەوە ، قوڵبوونەوەیەك وەکو مەحوی و مەولانای ڕۆمی و مەولەوی خۆمان ، مەولەوی کورد یەکێکە لەو کەسانەی کە تا ئاستی نوقم بوون ڕۆچوو وەتە نێو دونیای عیشق و بە تەواوی تێگەیشتوە لە مەغزاکانی تری نێو ئەو دونیا عیرفانیەی خۆی و بۆ لاواندنەوەی عەنبەر خاتونی خێزانی ئەم شیعرەی نوسیوە وە تێیدا دەڵێت :

دڵەی دڵ وە مەی مەیل لەیلیٚ کەیل
مەحرەم وە ڕازان خەڵوەت خانەی لەیل

لانە حەڵقەی زوڵف عەنبەر بۆی شەو ڕەنگ
هام دەم جای تەنگ ئەڵحەد سەرای سەنگ

پەروانەی مەزار ئەو ئاوات واستەم
تەرجەمەی حاڵات پەشێوی جەستەم





عەرز کەر وە لەیلا وە سەد خەمەوە
چەم وە نمەوە ، دڵ وە تەمەوە

دێوانەکەت دیم بڵێسەش بەرز بیٚ
بەرزی بڵێسەش هەر سات سەد تەرز بیٚ

وە هەر تەرزیٚ لەیل ملاوناوە
دڵەی سەنگ سەخت متاوناوە

گا گۆیا مەویەرد ئیند مەویەردەوە
گا موات وە دەم ئێش و دەردەوە

ئای جە ئێش تەن جە گیان جیای من
ئای جەلوای تۆ و ئەو شۆن دیای من

سەختی ئێش دەرد بەدحاڵێم لایٚ
وای بیٚ تۆ مەنزڵ گشت خاڵیم لایٚ

وە هەر مەنزڵ داو هەر ڕاگوزەر دا

**هەر دەست حەسرەت مدا وە سەردا**

**چێشەن موینوون مەنزڵ بێ تۆ بۆ**
**بێ هۆشم ، خەو بۆ ، راس بۆ ، درۆ بۆ**

**گا تێکەڵ مەکەرد چەنی دەرد وێش**
**فەرد هام فەردش چەنی فەرد وێش**

**موات : فیداش بام یە جای شیرینەن**
**گوزەرگای ئەو شۆخ زوڵف عەنبەرینەن**

**جە باڵای ئەی سەنگ پا ئاوەردەوە**
**بەرقەی ناز جە ڕووی ئەو شەنگ کەردەوە**

**جەو جاسوس گاوە ، بەو خەدەنگەوە**
**دڵتلنا وە زام هەزار ڕەنگەوە**

**جەو سەردەشتەوە گوڵاو ڕێزان کەرد**
**سارا بۆی عەنبەر سارا هەرزان کەرد**





**جۆگە جەلای جام جەبهەی جەماڵ دا**
**بەرگەشتی وە بەخت بەدر کەماڵ دا**

**جێگەی حوقەی ڕاز شیرین کەردەوە**
**تام تاڵی دەرد دوری بەردەوە**

**گوزەرگەی جیلوەی لەیل بێ حەد بەو تەرز**
**زایەڵەی مەجنون جە عەد ڕەد بەو تەرز**

**چۆن کەرون تەقدیر پەی سەر کار تۆ**
**نە تۆ بژنەوی نە دۆس دار تۆ**

**مەعدوم چون قەزا ئاما جە ناکاو**
**دانا چون نادان وە زۆ وەگەرداو**

**عیرفانەکەت کۆن ، فامت کۆشیەن**
**ئای پەی جیلوەی دۆس نیهایەت نیەن**

**ئارۆ یەك جیلوەش ها نە ڕووی کار دا**
**فەردا چێش ئەو یەك جیلوەش دیار دا**

لا ، بەڵ ئەو جیلوەی ڕوو نە پەنەانی
نەوعە زوەووڕێن ، زاناش ویجدانی

چ ماتەمێوەن پات بیەن پێوە
دانا و مەخشوشی کیٚ دیەن پێوە

ئەو جیلوە کەردەن ئەرشی وە تاقی
ئێد جیلوە کەردەن سوراحی و ساقی(٩)

ئێمە دەتوانین لەسەر عیشق و غەمی عاشقی قسە بکەین ، وە بە قەولی عەبدولکەریم سروش دەتوانین کەمێك لەسەر عیشق و گوناهیش ئیش بکەین ، بە تایبەتی لە دونیای ئاینی ئسلامیدا و لە فەرهەنگی ئیسلام دا قسە و باسێکی تایبەتی هەیە لەسەر ئەو مەسەلەی عیشق و گوناهە ، ئێمە لە بارەی عیشق و گوناهەوە قسەمان هەیە و وەکو ئەوە وایە زامێکی کۆنمان هەبێت و ئەزمونێکی تاڵمان تیا بە ڕیٚ کردوە ، بە ڕاحەتی و سانایی دەتوانین بڵێین کە کۆمەڵێك کەس پێیان وایە عیشق گوناهە ، گوناه بەمانا دینیەکەی و





دواجار گوناه بە مانا کلتوریەکەی ، چونکە مەرج هەمیشە کلتور تەعبیر لە دین بکات و دین تەعبیر لە کلتور بکات ، ڕیگرەکانی بەردەم عیشق زۆر زۆرن ، وە بەشێك لەو ڕێگرانە بە گوناه چواندنی خودی عیشقە ، کەسێك کە عاشق دەبێت و نامەی هەیبەتی عیشق هەڵدەگرێت بۆ چی گوناەی کردوە ؟ دواتر لێرە دا کێشەیەکی دی بۆ عیشق خۆی دروست دەکات ، بەم گوزارشتە دەبێتە هۆی ئاشنابوونی عاشق بە غەمێکی دی مەلول بوونی ئەو کەسە بە هۆی گوناهەوە ، واتا گوناهێك کە هاوتەریب بگۆیەکی ئەدەبی لەگەڵ دا وجوودی نیە ، وتنی فتوایەکی کلتوری بەرامبەر بە عیشق و نواندنی عونفی کلتوری و دینی بەرامبەر بە عیشق ئەم خۆی هاتنی پادشای غەمە و بونیادنانی مەملەکەتی غەمە لە نێو دونیای حەرارەت و حەلاوەتی عیشق دا ، من لەو وتراوانە تەواو بیٚ تاقەتم ، چونکە ئەو وتراوانە هەمیشە ویژدانی تیا هەست پیٚ ناکرێت و وەکو هومایە نەك کەبوتەر ، کەناری عاشقان هێندە تایبەتە کە هەموو کەس ناتوانێت تییدا بگیرسێتەوە ، سۆز و جەزبی عاشقان گوناهی ئەوانەش ئەسوتێنێت کە گوناهیان هەیە ، ئەك نەفەس و هەم نەفەس دواجار یەك قیامەت چاوەڕێیان ئەکات ، ئاخر تۆ بزانە هاوڕیٚ ، پەریەکان موڵکی هەموو کەسێك نین و ئێمەش

**هەموو موڵکی پەریەکان نین ، باڵندەی غەم بۆ لای هەموومان نایەت ، واتا ئەستێرەیەك موڵکی هەموان نیە و دەشێت موڵکی یەکێکمان بێت ، وە دەشێت ئەستێرەیەکی ڕاستەقینە موڵکی هەموو عاشقە غەمبارەکان بین ، ئەم هەموو غەم و حاڵ پەرێشانیە بەشی هەموو کەسێك نیە ، هەموو کەس ناگریت ، هەمووش پێناکەنن ، هەموو چاویان ڕەش نیە ، بەڵام نابێت ئەوانەی ناگرین گاڵتەجاری بە گریان بکەن ، چونکە ڕۆژێك دیت دەبێت بگرین ، ئەوان نابێت گاڵتەجاری بکەن بەوانەی کە چاویان ڕەش نیە ، ئاخر نابێت کە کەسێك لە عیشق بێ بەش بێت و نەتوانێت بە نێو نوری دونیای عیشق دا تێپەڕێت و ئەو مەملەکەتە ببینێت ، نابێت گاڵتەجاری بە عاشق و مەعشوقەکان بکات ، ئەوان کە ناتوانن بە نێو دونیای عیشقێکی جاویدانیدا بڕۆن ئیدی بۆ عاشقەکان کافر دەکەن ؟!**

**مەحوی دەڵێت :**

**کە بێ لێوی لە سەر لێوم بنێ ڕۆحم لە سەر لێوە**
**کە لێوی لابەرێ ، ئەڵبەت ڕۆحم دەردەچێ پێوە**





**شەکەر باری ، نمەك پاشی ، ئەگەر ببوایە من دەموت :**
**کە غونچەی تازە پشکوتو ، دەشوبهێ بەو دەم و لێوە**

**دەڵێ هەرکەس ببینێ یار و ، ئەغیاری بە ئەترافا:**
**خودا چین ئەم هەموو دێوە لە دەوری ئەم پەری شێوە**

**هەتا ڕۆژە دەبێ بۆ شامی شەو هەوڵی بدا هەر کەس**
**ئەگەر شاهەنشەهە ئەو ڕۆژە ڕۆیی شە بە بێ شێوە**

**بەهارێ بوو جوانی ، بوو بە سوخرەی پاییزی پیری**
**بەسەر چوو باغ و باقی ماوە وەی مشتێ چڵ و چێوە**

**مەگەر شاری عەدەم ، جێ ی وا تیا سەرگەشتە بم قاتە**
**بیابانە ، بەشی مەجنونە ، خاصی کۆهکەن کێوە**

**ئەمینی شێتی یە ((مەحوی)) لە مەکری نەفسی ئەممارە**
**مەگەر ڕەحمی خودا دەم بەستی کا ، ئەم مارە ، ئەنگێوە**

ئەوان مەغرورن و مەستی خەندەن درۆزنانەی دونیان ، ئەوانە هیچ کات مەستی بادەی عیرفان نین و هەر کات ویستیان دونیای ڕوناك دەکەن بە شەوە زەنگ ، بە هەر حاڵ پێم وابێت ئەوانەی کە عیشق بە گوناە دەزانن هەر ئەوەندەیان بەسە و هیوادارم بەخۆیان دا بچنەوە و دوا بە دوای ئەوە من دێم و عیشق بۆ عاشقان جێ ئەهێڵم و بەڵام گرنگە حەقیقەتی عیشق لە بیر نەکەن ، ڕێگای ئەم عیشقە زۆر دورەو بە هەموو کەس ناووردرێت ، عیشق لە وجوودی هەموومان دا نیە ، بەڵام کە هات ، ئیدی درەختی دڵ یان دەبوژێنێتەوە یان بێ گەڵا و لق و پۆپی دەکات ، ئیتر ئەوانەی کە لێم تێدەگەن ئافەرین ، تۆ حەقت نیە دڵی کەس بشکێنیت برادەر ، بەڵام بۆ ئەو حەقی ئەوەی بەدەستە کە دڵی تۆ بشکێنێت ؟ ئەمە ئەو غەمەیە کە من باسی دەکەم ، ئەو کەسینەت دەسوتێنێت و پێشی نازانێت لە پای چی ؟ کە سۆزت کرد و بە دەردەوە سەرت نایەوە ، ئەوە بزانە تۆ عاشقیت و غەمی عیشقت کوشتتی ، پێم بڵی ئەی کەسی عاشق ، بە دڵم بڵێ کە چۆن سەبوری دڵی خۆت ئەدەیتەوە ؟ تۆ لە غەمی عیشقی خۆتا تەواو نیەان بویتە و ڕەنگە بۆ هەتا هەتایە فەنا بیت ، دڵت وەکو تۆزی لێهاتوە لەبەر ئەو و ئەویش نازانێت ! ئاخر ئەوەیە غەمی عیشق ئازیز ، گەر





عاریف حەقی بینی ئەو دەیڵێت ، ئەو وەکو ئێمە نیە ، عاریفی حەپ بین هەردوو چاوی و چاوی دڵی دەسوتێت بۆ گەیشتن بە حەق ، ئەو هێندە عاشقە دەیەوێت لە عیشقی خۆیدا غەرقی خاڵی وجوود بێت ، عاریف پێویستی بە شاهێد نیە و ئەو بەردە و عیشق دڵۆپە ئاوێکەوە هێدی هێدی کونی دەکات تا ئاستی توانە لە نێو ئەو دڵۆپە ئاوەی کە نێوی عیشقە ، پەنجەرەی دڵی کراوەیە بۆ مەعشوق ، خەندەی عاشق دەرمانی دڵی بێچارەی عاریفە ، تانەی ئەو هەر مەرهەمە و وەکو ساقی دونیاکەی خۆی مەست دەکات بە بادەی غەم مەندی ، ڕەندە عاریف ، بەڕاستی ڕەندە ، نەی ژەنە بە دڵ، مەولانا نەی ژەنە و دڵی موغەنی و نەوای نەیەکە ، ئەو هەستەی کەلەلای مەحویش هەیە هەمان ئەو هەستەیە کە لەلای مەولانا هەیە ، پەردە لادەری جیلوەدەری عیشق عاریفانن ، ئەوان وەکو ئێمە زوو لە عیشق زویر نابن ، چونکە ئەوان عاشقی عیشقێکی جاویدانی و لە بن نەهاتووی نێو ئەو جیهانەن کە تەواو جیاوازە لەو جیهانەی ئێمە ، ئەو وای پێ باشە کە لەو دونیایەی خۆی بمرێت ، نەوەك لە لای ئێمە بژیت و ژیانێکی تا سەر درۆزنانە بباتە سەر ، ڕەندی عاریف تا ئاستێکە کە ئیدی هەموشتێکی مەستە و وەکو مەولانای ڕۆمی دەڵێت تەنانەت مستان

**سلامت میکنم ، واتا سڵاویشیان هەر بە بادەی عیشقەوەیە ، ئارەزوی ئەوان بە بیٚ پەردەیە ، واتا هەموو شتێکیان بە بیٚ شیفرەی دونیاییە ، ئەوان کەسێکی دی ناناسن جگە لەو ، ئەوان دەیانەوێت گیان و ڕۆحی هەموو مرۆڤەکان بریتی بێت لە ڕاستگۆیی بەرامبەر بە عیشقی جاویدانی و وتنی سرودی وەفا لە گەڵ عیشق دا ، ئەوان بە هەموو مانایەکەوە هەوری بارانی مەستین ، ئەوان بەورن و ئەوان بەرقن ، ئەوان شاەن و هەر بەتەنها ڕەندانە عاشقن ، گیانیان ئاسودەیە کە خزمەت کاری مەعشوقەکەیانن ، دیدەیان پڕە لە ئەشکی نەکەیشتن بە دۆست و چاویان سپی سپی بووە وەکو ڕیشیان ، نەسیمی ئەوان هەر عیشقە و نەدیمی ئەوان هەر عیشق ، ئەی کە ئەوەی دەتەوێت ئاو لە دونیای عاریفان بخۆیتەوە ، زووکە ڕاسگۆیانە عاشق ببەو زوو بێتاقە تو بێزار مەبە لەو دونیایە ، من لە خزمەت شیعرێکی مەولانا دا پێتان دەڵێم عیشق کاری عاریف و پاڵەوانەکانە کە دەڵێت :**

**عشق کار نازکان نرم نیست**
**عشق کار پهلوانست ای پسر**

**(کلیات١٠٩٧)**





**واتە : عیشق کاری ئەوانە نیە کە نازکن و خۆڕاگر نین ، عیشق کاری ئەوانەیە کە پاڵەوان و خۆڕاگرن .**
**عاریفان کەوکەبی ڕەخشەندەی عیشقی خۆیان هەیە و تەنها ئەو کەو کەبەش بەدیدەنی دەکەن ،ئاخر ببینن هاوڕێیان عاشقەکان بۆچی شادومان نین و هەمیشە غەمبارن ؟ بۆچی بۆنە و یادەکانی عاشقەکان هەمیشە گوزارشە لە غەم و غەم زیاترە لە شادی ؟ وەکو سروش دەڵێت ئایا غەم و ناخۆشی زیاتر نزیکە لە ئایندارییە وە ؟ من دەڵێم ئایا غەم و پەژارە زیاترە لە دونیای عاشقەکانەوە ؟ ئایا غەم و ناخۆشی و پەژارە لەگەڵ نا عاشق بوون دا سازگارەو لە گەڵ عاشق بوون دا سازگارە ؟ ڕێگاکانی دەرچوون چین لە غەم و پەژارە؟ ئێوە ببینن کە عاشقەکان هەمیشە لە خۆشترین ساتەکانی وەك جەژن و جەژنی سەری ساڵدا هەر غەمبارن ، بۆیە پێویستە سەرەتا تیۆرەیەکمان لەسەر هۆکار و میکانیزمەکانی زۆر بوونی غەم وە شادی دەربڕین لە دونیای عاشەکان دا ، ئەویش بۆ ئەوەی بتوانین وەڵامی ئەو پرسیارە بدەینەوە کە دەڵێت : ئایا عاشقەکان ئازاد بن باشتر نیە بۆیان بۆ دەرچوون لە غەم و خەمۆکی ؟ واتا**

**ئازادی هۆکارێکە بۆ ڕزگار بوون لە غەمی عاشقەکان ، وەکو سروش دەڵێت و لەو بڕوایە دایە لەزاری مەولەویەوە کە غەم و پەژارە هۆکارەکەی وەستانی ڕۆحە ، بەشێوەیەك ئەگەر جەریانەکانی ڕۆح چالاك بن و ڕۆحی مرۆڤ وەکو ڕودخانەیەکی ئاو دەتەقێتەوە و غەم ناچێتە ناخیەوە و شادی لە جێگە دا دەنیشێت ، هەروەك ئەوەی کی عاریفەکان زیاتر غەمیان خۆشتر دەوێت و بە شادی وەری دەگرن و ئەو نموونەیەی مەحوی گەورە کە لەسەرە هێنامانەوە کیفیایەت بۆ مەبەست گەیاندمان ، جا ئەگەر ئەم تیۆرەیە قبوڵ بکەین ، کە تتیۆریەك جێی بایەخ و گرنگیە ، دەبێت بڵێین ئەم تیۆریە ئەزموونی شەخسی و ڕاستەوخۆی ژیانی مەولانای ڕۆمیە وەکو سروش نموونەکەی لە بارەی ئەوەوە هێناوەتە وە و خستویەتیە ڕوو، وەڵام دانەوەی پرسیارەکەش هەر بە ئەریٚ دەبێت ، بەم شێوەیە ئەگەر عاشقەکان ئازاد بکەین بە حاڵی خۆیان یان ئەگەر تاکە کەسێك کە عاشقە ئازادی بکەین بە شێوەیەك کە تاکە کەس دوچاری وەستانی ڕۆحی دەروونی بێت ،وە چالاکیەکی ڕۆحی وەهای نەبێت و ئەمڕۆ و سبەینیٚ بۆ ئەو هیچ جیاوازیەکی نەبێت و ساڵی پار و ئەمساڵی وەك و یەك بێت و لە هەمان کات دا ئەم هەر لە جێگای خۆی وەستا بێت و پەژارەش دەوری لیٚ دابێت ،ئەمە واتای**





**وەستانی دەرونی یە ، هەر بەم شێوەیەش غەم و پەژارە ڕووی تێدەکات و وەکو یەکەمین حاڵەت ڕوو بە ڕووی دەبێتەوە ،پێم وایە بۆ نەمانی ئەو غەمە ڕێنمایی کردن هیچکات ڕێگا چارە نیە ، تەنها ڕێگە بە وتەی مەولەوی و بە پشتبەستن بە دیاریکردن و تیۆریەکەی مەولەوی ئەوەیە کە کەسەکە لەو وەستانە دەرونیە دەربکەین و ئەویش تا جەریانە فیبکری و مەعنەوی و ڕۆحیەکانی ئەو کەسە ئازاد بکەین و ئەو کەسە یە کۆنکرێتی چالاك بێت و ئیدی بگۆڕێت .**

**وە ئەمڕۆ سەرنجی ئەو بۆ خاڵە ڕابکێشین و سبەینیٚ بە شێوەیەکی تر نیگای ئەو بگێڕینەوە و دووبارە بۆ سبەی بە شێوەیەکی تر ڕێنمایی بکەین ، بەم شێوەیە ئەو ڕوو بە ڕووی جوڵە بکەینەوە و چالاکی بکەین و نەهێڵین دابڕاوی نێو ئەو دونیایە بێت کە دواجار ببێتە عاشقێکی حەقیقی و حەقیقەتی عیشق لە خۆیا بەرجەستە بکات ، بە لێکدنەوەی مەولەوی غەم وەکو پاشماوەی سەر ڕووی ئاو وەستاوە ،نامێنێت و دەڕوات ،لە ڕاستیدا مەولەوی نهێنی خۆسی و شادی عاریفان لە نێو غەمدا هەر لەبەر ئەو هۆکارە دەزانێت و دەڵێت :**

**چون بە غایت تیز ، جوگرد روان**

**غم نباید در درون عاریفان**

**واتە : لەبەر بیری ڕێك و تیژیان ناوەستێتەوە ئاو لە سەر ڕووی دەرونی عاریفان ، هەر لەبەر ئەوەشە کە غەم لە ناو دەرونی عاریفان دا نیە .**

**واتا ئەو غەمەی کە ئێمە هەمانە ئەوان نیانە ، ئەو دەڵێت عاریفان دڵخۆشن چونکە جۆگەی دەرونیان چالاکە ، هیچ شتێك لە دەرونیان دا نامێنێتەوە و هەمیشە لە حاڵەتی ڕۆیشتن دان و هیچ کاتێك لە یەك پۆینت دا ناوەستن .ئەمە تەنها بروای مەولانا رۆمیە ، بۆیە هەرکەسێك لە ئێمە دواجار نوێ دەبێتەوە و بەم شێوەیە هەرگیز دوچاری غەم نابینەوە ، غەم هەمیشە بەرهەمی مانەوەیە لەوەستان دا ، هەر کە دیوارەکانی زیندان بروخێندرێت و رودخانەکانی دەرون چالاك بکرێتەوە غەم نامێنێت ، هەروەکو وتم ڕاستە خەمۆکی شتێکە بە بێ ئەرك دەستی مرۆڤ دەکەوێت و مرۆڤ بە دەستی دەهێنێت و هەوڵ نادرێت بۆ بەدەست کەوتنی و بە خۆڕاییە زۆر جاران ، بەڵام دەبێت ئێمە ئاگەداری ئەو ڕاستیە بین کە**





**وەدەست خستنی شادی بە خۆڕایی نیە ، دەبێت بۆ بە دەستەێنانی هەوڵ بدرێت ئەم هەوڵدانەش تایبەتە بە جەریانەکانی ڕۆح و لابردنی دیوارەکانی زیندانی ڕۆحەوە ، ئیدی بەم شێوەیە ش شادی دێت بەرەو ڕوومان ، لێرە دا من مەبەستم لە شادی ئەوەیە کە بتوانرێت بەرەنگاری غەم بکەیتەوە ، واتا ڕاوەستان و شەڕکردن لە گەڵ غەم و لێبردنەوە لە غەم و چۆك پێیادادانی غەم ، ڕەنگە ئەگەر کەسێکی تەنانەت ئاسییش غەمی هەبێت ، بەڵام کە توانی بەرەنگاری بکات و بوەستێت و ئیفلیج نەبێت ، دەتوانین بڵێین کە ئەو کەسە غەمی وەکو شادی وایە ، چونکە هەرکاتێك ویستی دەتوانێت بەرەنگاری ببێتەوە ، وە لە پاڵ هەموو ئەو شتانەی کە وتم ، وەکو مەولانا دەڵێت غەم و پەژارە لە ئەنجامی گرانی پەیوەندیە ڕۆحیەکانی مرۆڤەوەیە کە هەڵبەت ئەمەش لەگەڵ ئەوەی پێشو دا یەك دەگرێتەوە ، کاتێك کەسێك باری سەر شانەکانی قورس بوو لە جوڵە دەوەستێت و ئەگەر بارەکە ئاسانتر بوو ئەوا جوڵەی ئەو کەسە ئاسانتر دەبێت ، کەسێك کە گرفتاری سەدان تێبینی و کێشەیە گرێ یە ، گرفتاری سەدان داواکارە کە دەبێت وەڵامیان بداتەوە ، کەسێکی وا کە ڕۆحێکی بێ جوڵە و وەستاوی هەیە ، وەکو خێمەیە کە بەسەد مێخەك بە زەویدا**

کوتراوە ، لەبەر ئەوە گرانی پەیوەندیە ڕۆحیەکانیش بۆ خۆی سەرچاوەی غەمهێنەرە و وە سوکی لەو پەیوەندیانە دا بۆ خۆی باشترین فۆرمەلەی شادیە(١٠) ، عاشقەکان ئەوانەن کە دەوڵەمەندن و ئەوانەن کە سەرچاوەی دەوڵەمەندیشیان لە ڕۆحیانەوەیە ، دەبێتئێمە لەوە تێبگەین کە دەوڵەمەندی و سەروەت دوو جۆرە ، سەروەت جارێك جارێك لە ناوەوە یە و جارێك لە دەرەوە ، ئەمەش بەس نیە کە مرۆڤ تەنها لە ڕوی بەرژەوەندی مادی دەرەکیەوە دەوڵەمەند بێت ، دەبێت ئەو کەسە خۆی بە توانت بێت و ئەو توانایەش بۆ ئەو زانراو بێت ، لێرە دا دەبێت ئەم کەسە بە هۆی ئەم توانایەوە شدا بن .

<u>حەزرەتی مەحوی لە بارەی عیشقەوە پێمان دەڵێت :</u>

بە سورمە بۆیە دولبەر خەنجەری موژگانی دا پەرداخ
دڵی هەڵناگریْ ببییْ لە کوشتە دەنگی ئۆف و ئاخ

بە تیریْ کوشتمی ، هەڵیاواسیم ، سوتاندمی ڕۆیی





دوعا بۆ حیفزی کەن ، کیْ دیویە جانانە وا گوستاخ

گوڵ و لالەی کەژ و کۆ ، کۆهکەن دێنێتەوە فکرم
کە خونی نا حەقی ئەو مەوج ئەدا ئێستەش لە کێو و شاخ

ئیدی لێرە بە دواوە هەر لەم شیعرە دونیا بینیەکی دی مەحوی دەبینێت و تەواو ڕۆ دەچێتە نێو ئەو دونیا مەعنەویەی عیشق کە هەر یەکێك لە ئێمە پێویستیەتی کە بەشێکی لەو دونیا مەعنەویەی هەبێت و کەمێك لە سەرگەردانی دونیای مادیەت خۆی بپارێزێت و دورکەوێتەوە ، غەزەلەکە تەواو دەکات و دەڵێت :

لەبەر قاپی خەراباتا ، کە یارەب دایمە ئاوا بیْ
مەگەر خاکیْ بەسەر داکەم ، بکەم گاهیْ دەماغیْ چاخ

خەرابی عیشقی تۆ وا بیْ سەر و سامان و دەروێشە
یەری بیْ تاجە ، کولبەی بیْ دەرە ، دیواری بیْ ساچاخ

نەگەینە کەعبەی ئامالە ، هەموو ئەسبابی ئامادە

**کە دەستە : بیٚ عەصا ، پیٚ خاوسە ، یەك قەتعە ڕیٚ: قوملاٚخ**

**لە ڕەشکی صەیدی فیتراکی چ شیرین شەهسەوارێکە**
**کە ((مەحوی)) هەروەکو دێوانە ، عەنقا کەوتە شاخ و داخ**

**ئەوەی جێگەی سەرنجە ئەوەیە کە مەحوی لێر زۆر گرنگی دەدات بەو توانایەی کە لە کەسی عاشق دا هەیە و بە تایبەت دەکەوێتە نێوباسی ئەم بابەتە و گوتارێکی شیعر ئامێزی لە بارەوە دەخاتە پێش چاو و هیوای عاشقەکان بەرز دەنرخێنێت و ئەو پیٚ ی وایە بەرەو دەشتی عیشق چوون گەورەیە و مرۆڤ دەبێت بچێت ئەگەر بزانێت تیاش دەچێت و دەڵێت :**

**دەزانم بادیەی عیشقە خەتەر ناك**
**کەچی هەر چووم ئەگەر مام و ئەگەر ((چووم))**

**لە حینی نەزعی ڕۆحا ، ڕۆحی عاشق**
**وتی : ئۆخەی لە میحنەت خانە دەرچووم**





**دوای ئەوە دێت و باسی ئەوە دەکات کە مرۆڤ تەنها بە عیشق پایەی بەرزە و هەر بەعیشقێکی هەتا هەتایی کە بۆ خودایە دەوڵەمەندە ، ئەگەر ئەو عیشقە نەبێت ئەك ئیدی شتێکی ئەو تۆی نیە تا نازی پێوە بکات و هەر لەو غەزەلەدا یە کە دەڵێت :**

**بە ئۆغر کردنی من بوومە قەقنەس**
**کە ئەو چوو بۆ سەفەر ، من بۆ سەقەر چووم**

**وتی : قەت وامەیە من واوە هەر دێم**
**نەهات ئەو وا قەت و من واوە هەر چووم**

**شوکر ! مورم بووە پاڵی میریٚ**
**بە بیٚ نامی ژیام و نامەوەر چووم**

**غەمی قاتیلمە ((مەحوی)) مونفەعیل ما**
**لە حەشرا کفنی خوێناوی بەبەر چووم**

عاشقەکان دەوڵەمەندن لە ڕووی تواناوە ، بەڵام ئەم تواناییە زۆر نیهان و شاردراوەیە ، تواناییش دوو جۆرە ، ئێمە کە تواناییەکمان هەیە و دەوڵەمەندیەکیش کە تەنها بریتیە لە پڕکردنی کۆگاکانمان ، من ئەمە یە توانایی نازانم ، واتا لێرەش تەلیسم هەیە ، ئەو تەلیسمەی کە ناوی هەمان زۆری پەیوەندیە ڕۆحیەکانە کە لە کۆتاییدا قورسی و غەم و پەژارە دێنێت ، کە ئەم بابەتی دەوڵەمەندیە و تواناییە تنا بۆ پڕ بوونی گەنجینە شادیەکانی مرۆڤ سەرف دەکرێت لە ڕوی سودی مادی دەرەکیەوە و دەوڵەمەند بوونی دەرەکی ، وەکو ئەوە وایە کەسێك کیسەیەکی پڕ لە پارەی هەبێت و هەمیشە لەسەر شانی بێت ، بەڵام نەزانێت کە ئاخۆ ئەم پارەیە بۆچی بەکار بهێنێت و خەرجیشی ناکات!

بەڵکو ڕەزیل و چاوچنۆك بێت و هەر لای خۆی هێشتێتیەوە ، گەنجینەیەکی لەم شێوەیە جگە لە بار قورسی و بارگرانی هیچی تری ناو لێنانێم و لە ڕاستیشدا خۆی هەروایە ، چونکە ئەوە بریتی نیە لە دەوڵەمەندی ، دەوڵەمەندی کاتێکە کە سەروەتەکەی ببێتە هۆی دەوڵەمەندی خاوەنەکەی ، واتا





ئەو لە برسێتی و نەداری ڕزگار بکات ، ئەمەش بە هەمان شێوە ڕاستە بۆ مرۆڤە عاشقەکان ، ئەوان کە هەستێکی دەوڵەمەندیان هەیە ، بەڵام جگە لە خۆ ماند و کردن هیچی تر ناکەن ، ئمەیە بارگرانی ، وە پێویستە یان ئەو هەستە فڕێ دەن یان ئەو هەستە ببێتە هۆی ئەوەی برسێتی ڕۆحی خۆی پێ ڕزگار بکات و دەرمان بکات، جگە لەمەش بەقەولی مەولانا چالاکیەکانی زیاتر بکات، بەو واتایەی دەستی ئەو لە کارەکان دا کراوەتر بێت ، لەم شێوەیە دایە کە دەتوانین بڕیاری ئەوە بدەین ئەو کەسە بە بە دەوڵەمەند و بە توانا بزانین ، کەواتە دەبێت لێرە دا ئەو دەرئەنجامە بزانین ، ئەگەربێت و ئێمە دەوڵەمەند ببین ، کام جۆرمان لە دەوڵەمەندی هەیە؟ ئایا دەوڵەمەند بە واتای بار گرانی؟ یان دەوڵەمەندی بەواتای یەکەم بێنیاز بوون، دووهەمیشیان بەواتای هەستی بەهرەبەرداری لەسەروەتەکەی بۆ کرانەوەی دەستی خەرجکردن و لابردنی بەربەستەکانی بەردەمی ، ئەگەر ئەوەی دووهەمیان بێت ئەوا چالاکی و ڕۆحیمان زیاد دەکات و توشی شادی دێین ، بەڵام ئەگەر جۆری دووەمیان بێت وەکو سروش ئاماژەی داوە ، ئەوا بە داخەوە غەم و پەژارەو تەمەڵی جوڵەی ئێمە زیاد دەکات و پێچەوانەیە . من ئەم بەشەیشم کۆتایی پێهێنا کە جۆری دووهەمی غەم

**خواردن بوو ، ئەویش غەم خواردنی عاشقانە ، بەڵام پێم چاکە ئەم بەشە بە غەزەلیکی مەحوی و غەزەلێکی وەفایی کە هەردەربارەی ئەو بابەتەی ئێمەیە کۆتایی بەێنم و بۆ ئەوەی زیاتر بەرچاو روونی بێت بۆمان دەربارەی غەمخواردنی عاشقانە :**

**عەجیبم دێ لە عەقڵی ئەو کەسە وا تێدەگا مەردە**
**کەچی وەك خان و خانم دائیما دڵ خۆش و بێ دەردە**

**بە پیری مەرگەوە فەرسەخ بە فەرسەخ ڕۆیون مەردان**
**ئەوی باکی لە مردن بێت دیارە بڵح و نامەردە**

**لە بەر قاپی مەحەببەت ئەو خودا پێداوەیە ڕووسور**
**حەزینە ، دیدە پڕ ئەسرینە ، دڵ خوێنینە ، ڕوو زەردە**

**لە ئەحبابی قەدیمی بەزمی ئولفەت ماوەتن دوو تەن**
**یەکێ پەروانە هەم دەردە ، یەکێ بولبوول کە هەم فەردە**

**براله ! ئەم هەموو ئۆبڵە بێ بەو گەردنە حەیفە**





**بنیشێ بەم حەددە ئەم گەردە لەو مینایی بێ گەردە**

**لە دەورمدا: حەصار،ئافەت،لە سەر سەر خەیمە،دودی ئاه**
**لە سایەی عیشقەوە بومە شەهی صاحێب سەرا پەردە**

**چلۆن ئەو دێتە چاوی من کە یەکسەر عونصوری ئاوە**
**مەحاڵە کە من بچمە دڵیەوە ، دڵ کیشوەری بەردە**

**تەپو تۆزی غوباری دیم و ڕێگەی گۆڕی یو دەیوت :**
**دەترسم دامەنم ئاخر ببێ ئالودە بەم گەردە**

**دەبینم ئەهلی دڵ یا سەنگسارە ، یا لەسەر دارە**
**دیاری عیشق ئەگەر ساغت دەوێ ، هەر دارە هەر بەردە**

**لە باغی سێو و بەی دا ، باسی ڕوخسار و چەنەی کەی بوو**
**خەجڵ ما سێو و ، بەی ترسا ، کەوا ئەو سورە ئەم زەردە**

**ئەگەرچی من گەدام ، ئەو شا ، لە عورقی عیشقدا((مەحوی))**
**بەسە نیسبەت لە بەینا ، من سیبەخت ، ئەو سیاه چەردە**

**غەزەلەکەی وەفایی :**

**چاوی پڕ خوێنم دەگێڕم قیبلەکەم پەیدا نیە**
**نووری چاوم ڕۆییوە یا دیدەکەم بینا نیە**
**وەك نەیستا ئاوریَ ئاوریَ بەربۆتە دەرونم بەند بەند**
**دلْ کە هەروەك نە دەنالْی دەم بە دەم بیَ جا نیە**
**ئەی چرا لەحزێك مودارا تێر ببینیَ ڕەنگ و ڕووت**
**وەرنە پەروانەی غەریب جان و دلْی پەروانە نیە**
**بۆ نیساری مەقدەمت عومرێکە دەگریم ڕۆژ و شەو**
**تابەکەی گەوهەر فشانی ، چاوەکەم دەریا نیە**
**چی دەکەم،دەگریم،دەسوتێم،ئاوری دلْ نامرێتەوە**
**چ بکەم ئاخر نوری دیدەم،سینەکەم سینا نیە**
**گەر هەزار جار بیَ بە کۆی زوخالْ بە نوری کێوی توور**
**ئەو دلْە ، جۆیایی یەك دیداری وەك موسا نیە**





**هات و ڕووی واکرد و دونیای کردە نالْەی عاشقان**
**دا نەلْێن نایێ قیامەت ، ڕۆژی واوەیلا نییە**
**حەلْقە حەلْقە تاری زولْفت خستە سەر ڕوی نازەنین**
**دا نەلْێن ڕۆژ حەلْقەگۆشی ماهی شەو ئارا نیە**
**پێکەنی مەمنونی کردم ، زولْفەکەی دامیَ بە دلْ**
**دا نەلْێن شەککەر فرۆشی ئێمە خۆش سەودا نیە**
**خۆم بەسەر گێڕا کوتم : قوربان پەرێشانی بەسە !**
**سوێندی خوارد بەو زولْفە وەسلْم عەینی سەرگەردانیە**
**مەنعی نالْینم لە شەوقی گەردەن و ڕوی خۆت مەکە**
**بولبوولی سوبحی بەهار بیَ شین و واوەیلا نیە**
**دلْ کە بەستەی زولْفە لەو لێوانە مەحرومی مەکە**
**بیَ شەککەر ئەم توتییە ناژی کە هیندوستانیە**
**گا بە ناز ، گاهیَ بە غەمزە مەمدە بەر تیغی برۆت**
**کوشتنی عاشق بە هیچ دینێکی قوربان چا نیە**
**با فریبی من نەدا واعیز بە گولْزاری ئیرەم**
**عاشقی ڕوی تۆ بە هەوێای (جنه المأوى) نیە**
**گەر هەموو عالەم بلْێن مەجنونە تا دەمرم دەلْێم :**
**هەردوو دونیا قیمەتی دیداری یەك لەیلا نیە**
**داد لە دەست حوسنت کە زولْفت نابیَ بە نالْەی دلْان**
**ئاریَ ئاریَ دائیرەی شاهانە بیَ غەوغا نیە**

**چت لە وەسڵی زوڵفی من ، فەرموو (وەفایی) ها دەمم**
**تالیبی عەیشی ئەبەد بە ، عومری دونیا فانی یە**
**سەد هەزار دڵ پێکەنی وەك گوڵ بەدەم بادی بەهەشت**
**با هەناسەی جان فزای گوڵزاری غەوسی سانیە**
**جانشینی حەزرەتی(غوپ الخلاین) قوتبی حەق**
**فەرعی (تاها) ئەسڵی (یاسین) نەوبەری گەیلانی یە**
**ڕەوشەنی چاو و قولووبی عاریفە عەکسی دڵی**
**کێوی توورە ، مەزەەری نوورە ،کلی سوبحانیە**
**پێ ی لەسەر شانی هەموو وەلییانە جەددی خۆی دەڵێ**
**جێ ی لەسەر چاوانە ، شاه و شانشینی سانیە**





## غەم خواری عاقڵانە (غەمی عەقڵمەند) :

**بەرلەوەی بێمە سەر باسەکە ، کە بریتیە لە غەم خواری عاقڵانە ، هەڵبەت من ببم بە قوربانی ئەو کەسەی کە عاقڵە ،بەڵام بەداخەوە کەسی عاقڵ زۆر کەمە ، لە ڕاستیدا پێم باشە کەمێك لە سەر مەسەلەی عەقڵ و باوەڕ قسە بکەم تا بتوانین بە ئاسانی بچینە نێو ماڵی غەمخواری عاقڵانە وە ، کەسی عاقڵ و کەسی بێ عەقڵ (غیر عاقل) دوو کەسن کە زۆر تەفاوت و جیاوازیان هەیە و ئەویش لەبەر ئەوەی سروشتی جیاوازیەکەیان لە ئاستێك دایە کە فەلسەفە هاتۆتە بەینەوە و تەداخولی ئەو بابەتەی کردوە ، تەماشاکەن ئەزیزان ، دەکرێت مەولانا گوتەنی ئێمەش بڵێین کە پارچە قوماشێك دەبەینە لای بەرگدرو و ئەو بە مەقەس پارچە پارچەی دەکات بە نیسبەت ئێمەوە ڕەواو دروستە ، بەڵام ئەگەر ئەو بەرگدروە کارامەیە ڕۆژێك هەڵەی کرد چی ؟**

ئەمە وەکو سەرەتایەکی پێویستە بۆ تێگەیشتن لە وەزیفەی
کەسی عاقڵ و کەسی بێ عەقڵ ، باوەڕی نێو دونیای
مەعنەویەت پڕیەتی لە ئینسانە هۆشمەند و باهۆشەکانە ،
وە دونیا بێ مەعنەویەتەکە دەشێت مرۆڤی عاقڵی تیا
وجوودی هەبێت بەڵام بە پێوەری دونیا مەعنەویەکە نیە ،
دەزانن مەعنەویەت چیە؟ مەعنەویەت مەعنەویەتە و هیچی
دی ، وەکو وتمان دەبێت ئیستێك بکەین لەسەر ئەو
کۆنسێپتە ، چونکە لە ڕاستیدا ئەم چەمکە کێشەیەکی زۆری
لەگەڵ خۆی هەڵگرتوە ، ئەویش بەهۆی ئەو شوناسگەلانەی
کە بۆی تەسمیم کراوە و بونەتە هۆکاری هەڵگرتنی زیاد لە
مانا و ڕەهەندێکی مەعریفی ، ڕۆژێك وتارێکی عەبدولکەریم
سروش م خوێندەوە دەربارەی مەسەلەی عەقڵ ، کە ئەم
وتارە لە یەکێك لە کتێبە بە ناوبانگەکانێتی بە ناوی
(صراطهای مستقیم) ڕێگا ڕاستەکان ، بەهەمان شێوە ئەو پێ
ی وایە کە دەکرێت زیاد لە خویندنەوەیەك بۆ ئەو چەمکە
بکرێت کە عەقڵە، لێرەوە من دەمەوێت ئەو پرسیارە بکەم کە
ئایا مرۆڤەکان کامیان عاقڵن ؟ بە تێڕوانینی ئێوە کە سروش
پیاوێکی عاقڵە دەکرێت ئیشەکانی لە هەمبەر نوسین هەموو
مەعقول بێت ؟ واتاکێ دەڵێت مرۆڤە عاقڵەکان کە کاریان
بەرهەمەێنانی مەعقولیەتە ، هەموو کارێکی کە ئەوان بە





مەعقولی دەزانن کێ دەڵێت و کێ بڕیار لەسەر مەعقولیەتی
ئەو کارە دەدات کە کەسێکی عاقڵ بە ئەنجامی گەیاندوە ، وە
دواجار ئەو کارەی کە بێ عەقڵێك وەئەنجامی دەگەیەنێت کێ
دەڵێت وەها کارێك نا مەعقولە ؟ لێرەوە کێشەیەك دروست
دەبێت کە ئەویش کێشەی نێوان عاقڵ و بێ عەقڵەکان و
دواتر کێشەی گروپەکانی نێو دونیای عاقڵەکان و کێشەی
نێو دونیای بێ عەقڵەکانە ، لێرەدا دەمەوێت هێزی شوناسی
نێو ئەم دوو دونیایە بخەمە ڕوو کە دواجار ەێزی شوناسی
عاقڵەکان لە زۆربەی شوێنەکان دا باڵ دەسترە وەك لە هێزی
شوناسی بێ عەقڵەکان ، هەڵبەت دەبێت بگەڕێینەوە نێو ئەو
دونیایەش کە شوێن و زەمەن حوکمی سەپاندنی مانا بەسەر
شتەکان دا دەدەن ، دەکرێت بڵێین عەقڵی دوای مۆدێرنە
جیاوازە لە عەقڵی پێش قۆناغی دونیای مۆدێرنە ،
دەسەڵاتی مۆدێرن لە هێماکانی زنیاری و لە وێنەکانی
مانیتۆر و تەلەفزیۆنەکان دا شاردراوەیە کە کۆمەڵگاکانی
خۆیان بە پێ یە ڕێکدەخەن کە کام ئیش مەعقولە و کامەیان
نا مەعقول ، وە بە دڵنیاییەوە خەڵکیش لە دەوری ئەو
ئۆرگانانە دا بناغەی ژیان پێك دەهێنن و لەمەڕ ئاکار و
ڕەفتاری خۆیان بڕیار دەدەن ، وە پێگەی دونیای پێش
مۆدێرن و دونیای دوای قۆناغی مۆدێرن لە مێشکی

خەڵكدایە ، لەم چاخی ئێستاش دا كە لە قۆناغی دوای مۆدێرنەین ، هێزێك ئامادەگی هەیە كە بڕیار لە سەر مەعقولیەت و نا مەعقولیەت دەدات ، ئەو هێزەش بریتیە لە ئیتنی و گروپەكان ، گروپە عاقڵەكان و گروپە بیٚ عەقڵەكان هێزی شوناسی چاخی ئێستاكیٚ یان لە دەستە و بۆ یە هەمیشە گرژیەك هەیە بۆ تێگەیشتن لەم چەمكە فەلسەفیانەی كە عەقڵ یەكێكە لەو چەمكانەی بوەتە مایەی نرخاندن لە لای ئەو گروپانە و هەر گروپە بە هێڵی خۆی قسەی لە بارەوە دەكات ، من پێم وایە ئەو گروپانە زۆرن كە بیری خەڵكی گشتییان بە خۆیانەوە خەریك كردوە ، هەڵبەت ئەم گروپانە لێە و لە دونیای كوردی دا بە هیچ شێوەیەك ئامادەگیان نیە ، چونكە تا ئێستاكیٚ تەنها سێبەر ئەو گروپانە هەن و بە فیعلی دەرنەكەوتوون ، كە ئەمەش مایەی نیگەرانی منە ، لێرەوە ئەگەر ئەو بیران هەشبن نەیانتوانیوە كەرەستەیەكی بەهێزو پڕ لە مەعنەویەت دروست بكەن و نەیاتنوانیوە لەگەڵ ئەو بیرانەی دی ڕكابەرایەتی بكات كە تێڕوانینی جیاوازیان هەیە لەمەڕ مەسەلەی عەقڵ ، ئێمە ئەوەندەی گرنگە لە مەسەلەی عەقڵ تێبگەین ئەوەندە گرنگ نیە كە لە غەمخواریەكەی تێبگەین ، لێرە هێما كلتوریەكان بە شێوەیەكی نا سەقامگیر وەرچەرخاون و بوونەتە مایەی





نەگەیشتن بە ئەزموون و شوناسێكی ڕاستەقینە ، من تا ئێستا نازانم مرۆڤە عاقڵەكانی دونیای ڕۆژهەڵات خواست و كردەیەكانیان بە چ شێوەیەك بەیان دەكەن تا بتوانین بڕیار لەسەر مەعقولیەت یان ناماقوڵیەتی ئەو كردارگەل و خواستانە بدەین ، لێرەدا شیكاری من بۆ ئەو بابەتە تەنها شرۆڤەیەكی زەینیە ، ئەگەرچی تێدەكۆشم ڕوانگەیەك ئاراستە بكەم كە بە پیٚ ی ئەزموون و شوناسەكان بێت ، ئەو بكەرانەی چ عاقڵ یان بیٚ عەقڵ كە پلان و پرۆگرامی شوناسیان هەیە و دەیانەویٚ هێماو نیشانە فەرەنگیەكان بگۆڕن تا بتوانن هێماكان ڕێك بخەن ، ئەوان دەبێت فەرهەنگی میجازی واقیعی كە لە كۆمەڵیٚ تۆڕ دا قاڵبەكان دروست دەكەن و پێكی دەهێنن ، دەبێت ئەو تۆڕە بگۆڕن ، چونكە ئەو تۆڕە خودی ئەم جیاوازیە دەكوژێت و پەیوەندیەكەش تێكدەشكێنێت ، بۆیە سەرەتا تێگەیشتن لەوەی كە پێویستە لەو كۆنێكتە بكۆڵینەوە كە عاقڵەكان كاری مەعقول ئەنجام بدەن و نا مەعقولیەتیش پیشە مرۆڤی بیٚ عەقڵە ، ئەوە سەرەتای دەركەوتی ئاڵۆزیەكانە لە هەمبەر ئەو پەیوەندیە و لیٚ تێگەیشتنی ، باشە خۆ ئێمە لەسەرەوە نموونەی قوماش و بەرگ دروەكەمان هێنایەوە و ئێستایش هەر لەسەر ئەو نمونەیە ئیش دەكەین بۆ ڕەت كردنەوەی

**ئەو بیرەی کە هاوکێشەی مەعقول=عاقڵ و نا مەعقول=بێ عەقڵ پەسەند دەکات ، ئەگەر بەرگدروەکە پارچە قوماشەکەی تێکدا و نەیتوانی ئەو شتەی لێ دروست بکات کە ئێمە ویستمان ، ئەکات خۆ ئەو هەر بەرگدروە ، بەڵام بەرگدرویەکی خاوەن هەڵە ، واتا ئەگەر هات و هایدگەر کە لەچەند مەسەلەیکی وجوودی کۆمەڵێك فەیلەسوفی گەورەی هاومێژوو و پێش خۆی بڕی ، ئەمە ناکاتە ئەوەی کە ئەو هەڵەی کردوە لەوەی کە ڕەگێکی نازیەتی تێا بەرجەستە بووە ، یان مەسەلەی کاتەکەی دیکارت و کۆمەڵێك مەسەلە تر کە هاوشێوەی ئەو مەسەلانەن ، ڕەها بوون لە بڕیاردان ، ئەمە بۆ خۆی هەڵەیە ، ڕەها بوون لە تیۆری فەلسەفی ئەمە گەورەترین کێشەیە لەبەردەم فەلسەفە ، ئەمانە هەموو نموونەن ، دیارە دەکرێت ڕۆژێك فەیلەسوفێکی وەکو شەریعەتی هەڵەی کردبێت ، وە بەهەڵەکەشی زانیبێت ، بۆ نموونە لە هەمبەر پلورالیزمی دینیەوە ، وە ڕەنگە هیچکاتیش دانی بەوە دانە نابێت کە هەڵەی کردوە ، بەڵام هەڵە خۆی نا مەعقولی نیە ؟ باشە خۆ ڕەنگە من لەم کتێبە دا چەند هەڵەیەکی فەلسەفیم هەبێت ، خۆ ئەگەر دان بە هەڵەکە دا نەنێم ، ئیدی ڕەنگە من ئیشێکە نامەعقولم کردبێت ، چونکە هەڵە خۆی یەکسانە بە نامەعقولی وە بە**





**پێچەوانەشەوە هەر ڕاست و دروستە، وە ئایا ئەگەر شێتێك کە ئێمە هەموو ناومان لێناوە بێ عەقڵ دەکرێت بڕیار لەسەر هەموو ئیشەکانی بدەین کە نا مەعقولە ؟ تا ئەو ئاستەی هەموو قسەکانی بە نامەعقول و هەموو کردارەکانی بە نامەعقول بزانین ؟ واتا بە نامەعقول دانانی گوفتار و ڕەفتاری شێتێك ئایا ئەمە بۆ خۆی تێنەگەیشتن نیە لەو چەمکە ، ئەوەتا مەحوی لە دەمی ڕەحە شێتەوە کە شێتیکی خەڵکی سولەیمانی بووە و هەمیشە ڕووت بووە دەڵێت :**

**(ڕەحە) بەو شێتیە (ألحق) قصێکی عاقڵانەی وت:**
**منم عاقڵ لە بەرگی عاریە خۆمم کە عاری کرد**

**مەحوی لێرەش دا دەیەوێت پێمان بڵێت کە وەزیفەی عاقڵ مەعقولیەت و وەزیفەی بێ عەقڵەکان نامەعقولیە ، بەڵام ئەم وتەیەی مەحوی بە یەك دونیا مەغزاوە وتراوە ، ئەو کە باسی ڕەحە شێت دەکات ، مەبەستێکی تر دەخاتە پێش چو ئەویش ئەوەیە کە ئەو پێ ی وایە وەزیفەی مەعقولیەت هەر مەعقولیەتە جا ئەگەر هی چ کەسێك بێت ، عاقڵ یان شێت ، دواجار ئەو پێ ی وایە دەشێت شێتەکان گوفتار و ڕەفتاری عاقڵانە ئەنجام بدەن و دەشێت ئەوانە کە خۆیان بە عاقڵ**

دەزانن و لەسەر مەسەلە یەءا قورسەکان قسە دەکەن ، ڕەنگە کاری نامەعقول ئەنجام بدەن ، ئەویش بە دوو نیوە بەیتەی کە پێمان دەڵێت :

قسە و باست لە عیرفانە ، کەچی دنیایە مەنزورت
لە عینوانی جەواهیر جۆییایی و ڕوو لە ئەعرازی

لێرەش دا مەحوی ئەو کەسانە دا دەشۆرێت کە خۆیان پێ عاقڵە و دەڵێن ئێمە وازمان لە دونیا هێناوە سەرقاڵی مەعریفە و عەقڵین ، کەچی هەر خەریکی کاری نا بەجێن و تەنها بەلای مەعقولیەتەوە ناچن ،من بۆ زیاتر گەیاندنی مەبەستەکەم دیسان دەبێت بڕۆمەوە بۆ لای مەحوی گەورە و غەزەلێکی ناسك و پڕ لە مانای بخەمە نێو ئەم نوسینەوە ، تا بتوانین زیاتر ئەو غەزەلە خۆراکی عەقڵمان بێت و دواتر دێینەوە سەر باسەکە ، ئەم غەزەلەی مەحوی یەکێکە لە غەزەلە پڕ لە شعور و عەقڵەکانی و پڕاو پڕە لە بەدەستخستنی ماناکانی تری عەقڵ و پێداچوونەوە جارێکی دی بە دونیای مەعقولیەت و نا مەعقولیەت دا کە بە مەجاز وتویەتی و باسی بادە و نوور و مەحەببەت و یاران و یاوەر





و دونیا دەکات ، کە لە پاڵ ئەم شیعرە دا ڕەهەندگەلێکی زۆر ئامادەن و هەر خۆشیان قسە لە سەر دونیای مرۆڤەکان دەکەن و دواجار قسە لەسەر مرۆڤەکانیش دەکەن :

بە نوری بادە کەشفی زوڵمەتی تەقوا نەکەم چبکەم
بە شەمعێکی وەها چاری شەوێکی وا نەکەم چبکەم

لە خەزنەی دڵمدا هەرچی هەیە ، هەر داغی سەودایە
دەسا ئەم نەقدە دەردی عیشقی پێ سەودا نەکەم چبکەم

لەگەڵ دەستی مەلا ڕێ ناکەوێ زونناری زوڵفی یار
وەکو شێخ ئیختیاری مەزهەبی تەرسا نەکەم چبکەم

لە ڕێ ی ئەو شۆخە دا خۆم کرد بە خاك و پێ ی نەنا پێما
دەسا خاکی هەموو عالەم بەسەر خۆما نەکەم چبکەم

دەمێکە شاری پڕ شۆری مەحەببەت مات و خامۆشە
بە قانونی تەجەننون شۆڕشێ ئینشا نەکەم چبکەم

**لە چاوانم نەما بۆ گریە ، نۆبەی سەجدە بەردەریە**
**سیاساڵم نەبارە ، نوێژی ئیستیسقا نەکەم ، چبکەم**

**لەسەر تۆم دوشمنە دنیا ، قەزییەم (مانع الجمع) ە**
**کە تەرکی تۆ نەکەم ، تەرکی هەموو دنیا نەکەم چبکەم**

**بەجێ ماوم لە یاران ، نا بەجێ ماوم ، ئەجەل زوو بە**
**بە مردن لەم قصوری ژینە ئیستیعفا نەکەم ، چبکەم !**

**ئەوا لەیلا بە ڕۆژی حەشر ئەدا وادەی لیقا((مەحوی))**
**هەتا قامی قیامەت ، ئاه و واوەیلا نەکەم ،چبکەم !**

**مەحوی لەم شیعرەی دا باسی کۆمەڵێك پێچەوانە و ڕاستی دەکات ، ئەوە گرنگە ئەوەیە کە دەبێت بڵێین ئیشی عاقڵانە**





**بریتیە لە چی ؟ لەم شیعرەوە ئەوە ڕوون دەکەینەوە کە کاری مەعقول کامەتا ؟**
**ئەگەر لەسەر ئەو تیۆرەی مەحوی گەورەوە ئیش لەسەر مەعقولیەت و نا مەعقولیەت بکەین ، پێم وابێت کارێکی مەعقول دەکەین ، مەحوی لەم غەزەلەی دا ئەوە ئاشکرا دەکات کە ، شێتی بەشێکە لە عاقڵی و ڕاستگۆیی و وەفا و پەیمان هەموو پەیوەستن بە بابی مەعقولیەتەوە ، وە هەروەها ئەوەش دەخاتە ڕوو کە عاشقەکان و شێتەکان کارێکی مەعقولیان کردوە کە عاشق بوون و شێتیان هەڵبژاردوە و تا ئەو ئاستەی کە خۆی دەباتە ڕیزی عاشقەکان و شێتەکان ، سەرەتای وێنا کردنی ئەوەی کە ئەشێت شێتەکان ئیشی مەعقول ئەنجام بدەن دەگەڕێتەوە بۆ ئەوە کە دونیای ئەوان پڕە لە پاکی و نەزیهی، واتا ئەوان هەموو شتێکیان ، هەموو کار و کردەوە و گفتێکیان بە ئینسافەوەیە ، فەیلەسوفێك پێم وا بێت درێدایە قسەیەکی جوان دەکات و دەڵێت : ئەو کەسانەی کە جاهیلن و هیچ ناڵێن دەربارەی حەقیقەت ترسێکم لێیان نیە ، بەڵام من هەمیش لەو کەسانە ترساوم کە عاقڵن و شتێك ناڵێن دەربارەی ئەم باسە کە حەقیقەتە ، وە مەرجیش نیە هەر کارێك کە عاقڵێك ئەنجامی بدا مەعقول بێت ، چونکە بە**

هەمان شێوە ئەوە گروپەکانن کە بڕیار لەسەر مەعقول بوون یان نا مەعقولیەت دەدەن ، وە بە هەمان شێوە ئەو گروپانەش مەرج نیە هەموو ئیشەکانیان بە پێرفێکتی لەمەر سیاسەت و ئەدەب و هونەر و ... هتد ، مەعقول وە یان نا مەعقول بێت ، دیسان لەبەر ئەوەی چەند گروپێکی تر ەەن ئیشەکانی ئەوان بە جۆرێکی تر هەڵدەسەنگێنن ، وە ئەو گروپەی سێ هەمیش بە هەمان شێوە گروپی بەرامبەر یان چەند گروپێکی دیگەر هەڵیان دەسەنگێنن کە ئەو کارەی ئەو گوفتارەی گرا و وترا مەعقول بوو یان نا مەعقول ، تا ئێرە ئەو کێشە تا ڕادەیەك چارە کرا ، واتا دەبێت ئێمە بڕوا بە یەکتری نەهێنین بە کۆنکرێتی و بڕواش بە یەکتری بێنین بە ڕێژەگەراییانە ، ئیدی ئەوەی کە ماوەتەوە ئەوەیە کە غەمخواری مرۆڤێکی عاقڵ جیاوازە لە مرۆڤێکی بێ عیقڵ و کاڵفام ، ئەوە مرۆڤە عاقڵەکانن کە جیاوازیان هەیە لە گەڵ کەم عەقڵ یان بێ عەقڵەکان ، هەڵبەت لە کردەوەش دا جیاوازن ، بەڵام بەشێوەیەکی ڕەها نا وەکو وتمان ،مرۆڤی عاقڵ گەورەیە و غەمی گەورەشی هەیە ، بەڵام مرۆڤە بێ عەقڵەکان و کەم عەقڵەکان تەواو پێچەوانەی ئەم شتەن کە بوونی هەیە لە لای مرۆڤە عاقڵەکان ، ئەوە مرۆڤە عاقڵەکانن کە دەتوانن بۆ دور بڕوانن و غەم بۆ دا هاتوو بخۆن ، بەڵام





ئەنتی عاقڵەکان ئەو غەمەیان نیە ، چونکە بیر لە داهاتو ناکەنەوە شتێك ناناسن بە ناوی داهاتوە وە ، وە ئەوکارانەی کە ەەندێك جاری کەم پێیان دەوترێت مەعقول لە ئینساف و بێ خەوشی و بێ گەردی خۆیانەوە ئەنجامی دەدەن لە ئێستا دا ، وەگەر نا شتێکی واش لەسەر ئێستا نازانن ، بۆیە کە مرۆڤە عاقڵەکان غەمی داهاتو وە ئێستا دەخۆن لەبەر ئەوەیە کە بیر دەکەنەوە ، کەسێك کە بیر بکاتەوە هەڵبەت عاقڵە وە کەسێك بیر لە پاشەڕۆژ و ئێستا ی خەڵك و خۆی بکات ئەمە بۆ خۆی پرۆسەی بیرکردنەوەکەی ناوی دەنێنێین پرۆسەیەکی مەعقول کە لە بەرابەر ئەو کۆمەڵە دەستەواژە و رموز و مەدلولانەی ئێستا و داهاتوو دەفکرێت،

بەڵام بە هەمان شێوە مەحوی دێت پێمان دەڵێت دونیا خۆی داهاتوی نیە و تەنها ئێستایە ، چونکە دونیا خۆی بریتیە لە کورتی و زەمەنی کورت :

**دنیایەکە، دو ڕۆژە، نەوازش بکا، سێ هەم**
**ڕۆژی گودازشە ، ئەمەتە داکی سێبەڕۆ**

**ڕووو ترش و ڕووو خۆشە لە ڕووێکا ، لە یەك دەما**
**قەهری درۆیە، میهری درۆ، هەردوو هەر درۆ**

**پیری نەمامی باغی جوانیمی کردە پوش**
**تازەم درەختی تولّی ئەمەل دەردەکا چرۆ**

**گەردن کەچی چڵێکە، سەر ئەفرازیە گوڵی**
**بڕوانە، چاوەکەم، کە لەسەر چاوە، جێ ی برۆ**

**بڕوا هێنان بە مەعقولیەتی کارێك و گوفتار یان پیشە و پرۆسەیەك ئەمە ئاسان نیە ، بەڵام کۆمەڵێك نیشانە و هێما هەن کە تەعبیر لە مەعقولیەت یان نا مەعقولیەت ی ئەو**





**بابەتە دەکەن ، وە ڕەنگە مرۆڤە عاقڵەکان ڕۆژێك ساتێك و چوزانم ، بینەوێت کارێکی نا مەعقول ئەنجام بدەن ، وە بۆ ئەنجامدانی ئەم کارەشیان ڕەنگە کۆمەڵێك پاساویان هەیە ، وە ڕەنگە مرۆڤە بێ عەقڵەکانیش بە بێ ویستی خۆیان کارێکی مەعقول بەجێ بهێنن و ڕەنگە ئەوانیش ئەو کارە بەشایستەی خۆیان بزانن و شانازیشی پێوە بکەن ، بەڵام ئیدی ئەمە دەکرێت کەسانی دی و چواردەورەیان زیاتر ئەم ماتەرە ڕوونتر بکەنەوە و وە ئەم تێزەش لە هەمبەر عەقڵ و ئەنتی عەقڵ زیاتر و زۆرتر شیکار تری بکەنەوە ، وە بتوانن ئەو چەمکگەلانە هەر هیچ نەبێت پکێجێك لەو کۆنسێپتانە تەرجەمەی نێو دونیای ئینسانە خراپ و سروشتی و سوپەرەکان بکەن ، کە بە بڕوای من ئێمە کۆمەڵگای گوزارشکەر کۆمەڵگا سونەتیەکان و پێم وابێت لە ڕیزی ئەو کۆمەڵگایانەشین کە زۆرترین قسەمان هەیە لەسەر ئەو چەمکە گشتگیر و نا گشتگیریانە ی وە عەقڵ و حەقیقەت و ئەخلاق و ... هتد، کە بە بڕوای من گومان نیە لە ڕێژەیی شتەکان لە نێو ژیان دا ، عەقڵ خۆی ڕێژەیی یە ، واتا ئینسانێك ئەگەر زۆر عاقڵ بێت ، دەشێت ڕۆژێك کارێك نا مەقول ئەنجام بدات ، وە ئینسانێك زۆر تەحقیقی بێت ، دەشێت ڕۆژێك کارێکی بەتاڵ و نا حەقیەت ئەنجام بدات و**

**هەروەها بۆ مەسەلەی ئەخلاقیش بەهەمان شێوەیە ، بەڵام بۆ مەسەلەی ئەخلاق ، ئەخلاق لە خودی خۆیدا لە ڕێژەی ئەخلاقەوە ڕێژەیی لە متنای ژیان قابیلی لێهەڵێنجانی نیە ، ئەوە مانا و واتای ژیانە ئەو شتانە بەرهەم دەهێنێت و ئەوە مانای ژیانە کە چی بکەم و چی نەکەمی مندا کاریگەری بەجێ دەهێڵێت ، نەك ئەشێ و ناشێ یەکان و مەعقول و نا مەعقولیەکانی من، ئەمانجەکان هەمیشە میکانیزم دەستنیشان دەکەن، میکانیزم خۆی بە خۆی بە دەنگ و گۆ نایەت تا ئامانج نەبێت ، وە ئەگەر مەبەست لەمانە ئامانج بێت و مەبەست لە لە ئامانجی ژیانیش ئەو ئامانجە بێت کە هەرکەسێك بۆ زیندەگی خۆی پیێ ی قایلە ، گومانی تێدا نیە کە مانای ژیان کارێکی ڕێژەییە، هەموو ژیانت لە پێناو ئامانجێك دا تەی دەکرێت و وە هەموو ژیانی منیش لە پێناو ئامانجێکی دیگەر دا تەی دەکرێت، وە بەم شێوەیە مانای ژیانی مرۆڤە عاقڵەکان لە مانای ژیانی مرۆڤە بێ عیقڵەکان جیاوازترە ، وە غەمی مرۆڤە عاقڵەکان لە غەمی ئەوانە جیاوازە کە بێ عەقڵن ، هەر لەبەر ئەوەشە کە تۆ ناتوانیت بڕیار لە سەر مانا مەعنەویەکەی ژیان بدەیت کە ژیان چیە و هەروەها ناشتوانیت بە مانا و جیهانبینیەکی فەلسەفیانە دەستەواژەی مەعقول بخەیتە پاڵ عەقڵ و نا مەعقولیەت**





**بخەیتە پاڵ بێ عەقڵی ، بگرە هەرچوار مەفهومەکە سەرەڕای لێکچووی دوانیان لە گەڵ دوانیان ، بەڵام جیاوازیەکی زۆری تیا بەدی دەکرێت لە ئاستی فیکری و فەلسەفی دا .**

**چیە دنیا ، ژنێکە، هەر شەوی سك پڕ بە صەد فیتنە**
**سبەینێ زوو بە خوێنی جەرگی ئەهلی دڵ دەکا بێزوو**

**کە دایەی خاکت ئاخر هەر دەبێ بگرێتە باوەش خۆی ،**
**بکە خاکێ بەسەر خۆتا لە قاپی (بو تراب) ێ زوو**

**((مەحوی گەورە))**

**لەم بابەتەشدا هەر پشت بەسەرچاوەیەکی گرنگ دەبەستم کە ئەویش دیوانەکەی مەحوی گەورەیە و لە بارەی عەقڵ و غەمەوە و ئەو پێ ی وایە کە غەمی ئینسانە بێ عیقڵەکان هەمیشە بە هۆی پوچی دونیاوەیە و غەمی مرۆڤی عاقڵی**

**ڕاستەقینەش ئەو غەمەیە کە تەنها بۆ بینیی ڕەهەند و ئاسۆکانی ئەو دیو دونیاوەیە کە ئەویش دونیای دوای ئێرەیە و دەڵێت :**

**ئەم عەصرە، عەصر و وەقتە لە بۆ فاجیرێ لە هیچ**
**دینی نەکا ویقایە، حەیا نەیگرێ لە هیچ**

**دنیا بە کامی هیچ کەسانە هەمیشە دەم**
**هیچ ئەڵبەت بە هیچ دەمێ نابڕی لە هیچ**

**دنیا کە هیچە ، جوملە دەزانن کەچی چ کەس**
**مەردانە بۆ خودا نیە دەس هەڵگرێ لە هیچ**

**تا سەر نەبۆتە گۆ ، دە لە دنیا دە تۆ شەقێ**
**هەر ئەم شەقە بەکارە ، کەوا هەڵدرێ لە هیچ**

**ماچی دەمی لە کەڵکەڵەما مابوو، چ خۆشی وت :**
**قرم، ئەی ئەسیری واهیمە، خۆش ناکرێ لە هیچ**





**دەم نادیار و نازی قسەی پڕ بە دەشت و شار**
**دنیایەك ئاوی زیندەگی و دەرخرێ لە هیچ**

**مەجنونە : شاهی عیشق و بیابانی: بارەگا**
**ئاهی، دەکا هەمیشە، بە پا چادرێ لە هیچ**

**دیققەت کە، غەیری ڕوشتەیی جان و میانی یار**
**ڕووشتەم نەدیوە، ((مەحوی)) ئەمن، بادرێ لە هیچ**

**چاوی کەوێ کە بەم غەزەلەم دورشناسی شیعر**
**کێ بێ دەڵی ئەمەندە گوهەر وەرگرێ لە هیچ**

**هەڵبەت سروش لە بابەتێکیدا بەناوی (شیر و شەککەر) دا کە پێموابێت لە شەهرەوەند بڵاوی کردۆتەوە ، دەڵیت من ڕوونم کردۆتەوە کە بەشێك لەفەلسەفەکانی زاتگەرایی چ**

وێرانەیەك درووست دەكەن كە دەبێت زۆر هۆشمەندانە و
لێهاتوانە حەزەریان لێبکرێت ، ئاخر دكتۆر ئەو بەشەی کە
نێوی فەلسەفەی زاتیە کامەیە ؟ من هەمیشە سەرم لەو پیاوە
سوڕماوە ئەزیزانم ، کەسێکە جیاواز لە هەموو فەیلەسوفانی
تر، ئەو دەتوانێت لە نێو پەرداخێك گەورەترین فەیەزان و
لافاو و تۆفانی فەلسەفی دروست بکات بە جێ ی بهێڵێت ،
ئاخر عەقڵ دواجار پەیوەندیەکی پتەوی لە گەڵ زاتیەت دا
هەیە، لێگەڕین کە بتوانم زاتیەت بکەم بە کوڕی عەقڵ یان
عەقڵ بکەم بە کوڕی زاتیەت ، هەڵبەت ئەم بابەت گرنگە
لەسەری بوەستین ، هەرکەسێك لە نێو فەلسەفەی دیندا ئیش
بکات دەبێت قەرزاری فەلسەفەی زانست و مێژوو بێت ، ئەمە
خۆ دکتۆر خۆی کۆکە لەسەر ئەم قسەیە ، ئێ ئەگەر وابێت
دونیای ئینسانەکانی ئێمە کام جۆرە لە فەلسەفە واتا دەست
باڵایی فەلسەفەی مێژوو و زانست چیە بەسەر فەلسەفەی
دینەوە ؟ وەفەلسەفەی شیکاری خۆ پەیوەندیەکی فراوانی
لەگەڵ عەقڵ دا هەیە ، باشە ئینسانە دیندارەکان بۆچی بەو
شێوەیە لە غەم تێگەیشتون ، باشە خەوی پەرێشان کامەیە ؟
ئەگەر وا بڕیار بێت مرۆڤە دیندارەکان هەموو بێ عەقڵ بن
ئیدی ئەمە چیە ؟ وە دەکرێت پرسیارەکە بە جۆرێکی دی
ئاراستەی بکەم ، دەکرێت مرۆڤە عاقڵەکان هەموو بێ دین بن





؟ بە دڵنیاییەوە ئەمە ڕاست نیە ، کتومت بەم جۆرەیە ،
مرۆڤەکان چەند ئیتنیەکن و جیاوازی عیقڵیشیان پەیوەندی
بە پێوەری دینە باوە کانەوە نیە ، واتا دینە نەریتی و
عورفیەکان ، بۆ یە تێزەکەمان لە هەمبەر بابەتی عەقڵ و
زاتیەت هەر بەم جۆرە بێت پێم وایە باشترە ، وە دەکرێت بۆ
ناسینی عاقڵەکان بێ عیقڵەکان بناسین (تعرف الشیاء با
أضدادها) ، خۆ ئێمە بێ عەقڵی کۆنکرێتی دەناسین و
دەتوانین لە ڕێگەی کردار گەل و ڕەفتار گەلە زیاتر و زۆرە نا
عەقڵانیەکانیەوە جیایان بکەینەوە لە عاقڵەکان ،بەڵام
کێشەکەکە هەر ئەمەیە کە عاقڵی گەورە و تەواو غەمی تەواو
و گەورە دەخوات و غەمخواری ڕاستەقینەیە ، وە عاقڵەکانی
دیٚ کە دەشێت عاقڵی ڕێژەیی (نسبی) بن ، ئیدی ئەمە دیارە
، کە غەمی ئەوان بۆ هەندێ مەسەلەی (استپناو) گەورەیە و
بۆ هەندێ مەسەلەی تریش بە پێچەوانەوە ،کەواتە باسی
داڕوخانی کردار گەل و گوفتارگەلی عاقڵگەرا ڕێژەییەکان
ئەمە بۆ خۆی غەدر و زوڵمە کە دەکرێت لە خودی عەقڵ ، لە
ڕاستیدا من کە دەستەواژەی عاقڵی تەواوم بە کار هێنا ،
ئەکە لە ڕووی فەلسەفیەوە تەواو نیە بەکار هێنانی ئەم
دەستەواژەیە ، بەڵام من لە قاڵبی لیکسیکۆلۆژی و زمانەوانی
دا بەکارم هێناوە ، ئەویش بۆ جیاکردنەوەی لە بەشەکانی

**تری (عەقڵمەندێتی) و بابەتە ڕاسیۆنالیزەیشنەکان ، تا بتوانین بابەتە ڕاسیۆنالیتەکان بە تەواوی و دروستی کلاسیفیکەیشنی بکەینە نێو دونیای واقیعگەرایی ، ئەمەش بۆ واقیع بەرهەمی تێروانینەو هیچی دی ، دواتر پێویستە عەقڵ لە هەواو هەوەس جودا بکرێتەوە ، ئەمەش بۆ ئەوەی بتوانین بە جوانترین شێوە گوزارش بکەین لەو بابەت ، مەولانا دەیوت ، ئێمە عەقڵمان لە هەواو ئارەزوو دابڕیوە ((عقل را معزول کردیم و هوا ڕا جدا زدیم)) .**





**سەرچاوەکان :**

**دیوانی مەحوی /عبدولکەریم مودەرریس/ چاپ ١٣٨٥/سێهەم/کوردستان ، سنە**

**(١)نزد عرفا/سروش دباغ/سایت عبدالکریم سروش**

**(٢)کلیات دیوان شمس/مولانا رومی / بدیع الزمان : فروز انفر/تهران ١٣٨٧/چاپ چهارم ، فیپا**

**(٣)غزلیات سعدی/ تهیە سایت : فرەنگی و اجتماعی / تربت جام**

**(٤)صدای پای اب/سهراب سپهری در سایت :**
www.kafshhayamkoo.persianblog.com

**(٥)عبدالکریم سروش/ صراطهای مستقیم/ مۆسسە فرهنگی سراط**

**(٦)هەژان/گۆڤار،ژمارە ٢٠٠٦/١٩دەروازەیەك بۆ ناساندنی فەلسەفەی دین/تەحسین حەمە غەریب/ل ٤٤**

**(٧)دیوان حافز شیرازی / خط : حسمین جعفری تبار/انتشارات: علمی /چاپ دوم/١٣٨١**

**(٨)دیوانی وەفایی/علی قرداغی/انتشارات کوردستان/١٣٨٩**

**(٩)دیوانی مەولەوی/عەبدولکەریم مودەریس/کتابخانە ملی ایران/١٣٧٨ چاپ دووەم**

(١٠)عبدالکریم سروش/روزنامە/همشهری /عدد ٢٠٧٠/سن ١٣٧٨

## لە نێوان (نالی) و (مەحوی گەورە) دا :
## (نالی)شاعیر و (مەحوی) عاریف

ئەم لێکۆڵینەوەیەمان زیاتر لەبەر ئەوە ئەنجام دا ، تا بتوانین سەرەتا کەمێك لە شیعر و شیعریەت تێبگەین و دواتر بتوانین لە دونیای شیعر کەمێك بدوێین و جیاوازیەکانی ئەم دونیایە لە گەڵ دونیاکانی تر ڕوون بکەینەوە و دونیای عیرفان و عیرفان ناسی بە نموونە ، ئەگەر بتوانین لەم لێکۆڵینەوەیە دا کەمێك لە خزمەت تێکستەکانی مەحوی گەورە و حەزرەتی نالیدا ڕابمێنین ، لە ڕاستیدا ئەم تێکستانەی مەحوی و نالی پێویستە زۆر بە حەزەرە وە ئیشی لەسەر بکرێت ، ئەویش لەبەر ئەوەی شیعر و عیرفان





تا ڕادەیەك لە دونیای سونەتی دا پەیوەندیەکی ڕاستەوخۆ و توندو تۆڵ و دانەبڕاوی هەمیشەگییان پێکەوە هەیە ، لەبەر ئەوە ئەگەر ئێمە بێین سەرەتا کار لەسەر هەردوو دونیاکە بکەین کە دونیای ئەدەب و عیرفانە ، ئەوا من پێم وایە ئیشێکی باشمان کردوە ، وە پێم وانیە کارێکی ناقۆڵامان ئەنجام دابێ ، ئەویش لەبەرئەوەی لە ئێستا دا لە ناو بەشێك لە خەڵکی خوێنەری تێکستە کلاسیکی و عیرفان دا قسەوباسێکی لەو چەشنە دەکرێت کە پێم وابێت ئەو قسە و باسانە زساتر بۆ تێکەڵاو کردنی مەسەلە مەعریفیەکانە لە مەڕ عیرفان و ئەدەب دا، هەر بۆیە سەرەتا وا پێویستە کە لەو دوو دونیا جیاوەزە تێبگەین کە ،مەحوی گەورە و حەزرەتی نالی هەیانە، دونیای مەحوی زۆر جیاوازە لە دونیای نالی ، هەم لە ڕووی سەردەم، وە هەم لە ڕووی ((مەعنەویەت)) و هەم لە ڕووی داڕشتنی فۆرمی شیعریدا ، بەڵام ئەوەی کە زیاتر جێگای سەرنجە لە لای بەندە ، دوو خاڵ یان باشتر بڵێم جیازازیەکی سەرەکییە لە نێوان ئەم دوو کەسە ئەویش یەکەم ((مەعنەوییەت)) و دوو هەم لایەنی ((فەلسەفی))، ڕاستیەکەی من کە ئەم بابەتەم هەڵبژارد، زیاتر لەبەر مەولانا مەحوی بوو ، چونکە خۆشەویستی من بۆ مەولانا مەحوی خۆشەویستیەکە ، بێ سنوور ، بێ مەودا ، لە خۆم تێر بووم

و لە دونیا تێر بووم ، کەچی لەو هەر تێر نەبووم ، مەحوی
ئەو دونیایەیە کە هەموو ژیانی منی بەخۆیەوە سەرقاڵ
کردوە ، کەسێك پڕاو پڕ لە ((مەعنەویەت)) ، من ئەو پیاوە
هەم خواردنی ڕۆحمە و هەم خواردنی عەقڵمە و هەم خۆراکی
دڵیشمە ، هەر لەسەرەتای چوونە نێو دونیای خوێندنەوە من
ئاشنای ئەم ئەفسانەیە بووم ، بەڕاستی بریتیە لە ئەفسانە و
هیچیتر ، هەڵبەت ئەفسانە بۆ ئەو کەسانەی کە لە
تێکستەکانی قاڵ بوونەتەوە ، ئەوەیشی کە بڕوای وایە کە
مەحوی شاعیرە ! ئەوا زۆر بە هەڵە دا چووە، ڕاستیەکەی بە
هەڵەیەکی گەورەشدا چووە ، چونکە پێویستە ئێمە سەرەتا
ئەوە بزانین کە شاعیر بوونی مەحوی پێش فەیلەسوف یان
عاریف بوونی یەتی ؟ وە یان بە پیچەوانەوە ؟
هەر تێگەیشتن لەمە بۆ خۆی تێگەیشتنە لە بەشێکی فراوانی
ئەم لێکۆڵینەوە زانستیەمان ، هەڵبەت بڕیاردان لەسەر ئەوەی
کە ئاخۆ نالی شاعیربوونی پیش بابەتەکانی تر بووە یان بە
پێچەوانەوە، ئەمەش هەڵەیە کە بڕیار لەسەر ئەوە بدەین ،کە
نالی دونیای شیعر بووە بە وەسیلەی گەیاندنی بیر و
بۆچونەکانی یان هەر خۆی ویستویەتی شیعر ئەو بابەت
بێت کە تەنها بۆ ئەو بژیت ، لێر ئەو مەبەستە گرنگە ،
بێگومان هەر کەس ئەهلی دڵ بێت ، ئەوا نزیکیەك هەست





پێ دەکات لە نێوان تێکستەکانی مەحوی حەزرەت و نالی ،
بەلام لە پلەی مەعنەویەت وە ڕۆحانیەت ، ئەو ئیدی وا
باشترە کە زیاتر قوڵ بینەوە بۆ نێو ئەم باسە عیرفانی-
ئەدەبی یە ، ئەهلی عیرفان و کەماڵ هەموو کەسەکان نین ،
ئەوانەی کە ئەهلی عیرفانن ، مەرج نیە کە تەنها و تەنها
دەبێت شاعیر بن، وە ئەوانەی کە شیعر دەنوسن و شاعیرن ،
مەرج نیە عاریف بن، چونکە عاریف بوون پیشەی
شاعیرەکان نیە، بەڵام دەشێت عاریف بتوانێت شاعیریش
بێت، هەڵبەت مەسەلەی دوای مەعنەویت ئەوەی کە گرنگە
قسەی لێ بکەین مەسەلەی (ڕۆشنفکری دینی یە ) ، واتا ئەو
مەودایەی کە هەیە لە نێوان مەحوی و نالی ، لە ڕووی
مەعریفەناسی دینی - ڕۆشنفکری دینی یە وە ، چونکە بە
ڕاستی وەکو سروش لە کتێبی ڕازدانی دا دەڵێت ، ەەموو
ڕۆشنیرە ئاینیەکان دەبێت بەم چەشنە بن : بیربکەنەوە و
دلێر و جوامێر و نەترس بن و خاوەنی قودرەتی خۆیان
بن(١) ، لەمەوە دەبێت بڵێین کە ئەگەر کەسێك بێت و ئو
خاڵانەی تیا نەبوو ، خۆ ئیدی ناتوانین پێ ی ڕۆشنفکریش،
چ جای ئەوەی بە عاریف بی ناسێنین بە خەڵك ، چونکی
بەڕاستی ئەو کارە حۆی بریتیە لە یەك دونیا بەرپرسیاریەتی
، جا لەبەر ئەوە گرنگە ئێمە بگەڕێینەوە بۆئەو مانایانەی کە

لکاون بە پرەنسیپی عاریفەوە، وە فۆرمەلەکردنی ئەو مانایانە ، وە تێگەیشتن لە عاریف ئیندیڤیجواڵتەکان و پەنهانیەکان و ڕاگوزەر بەسەر کۆمەڵێك کۆنسێپی جودا جودا دا ،لەم لێکۆڵینەوەیەدا هەوڵ دەدەین کە باسی هەموو چەمك و شیکردنەوەی ئەو چەمکانە بکەین و میتۆدی عەقڵی و مەعنەوی خۆشمان لە بەرامبەری دا بخەینە پێش چاو .

بێگومان کەسایەتی عاریف ئەو کەسایەتیە یە کە زۆر جیاواز لە شاعیرێك بیر دەکاتەوە ، هەڵبەت من دەمەوێت لەم بابەتە دا نالی بە شاعیرێکی نیمچە عاریف و مەحویش بە فەیلەسوف و عاریف و شاعیر بناسێنم ، هەڵبەت سەرەتا گرنگە ئەوە بزانین کە عاریف کێ یە ؟

لە میژووی عیرفان دا ، عاریفەکان هەمیشە ئەو کەسانە بوونە ، کە ویستویانە جیاواز لە کەسانی تر بڵێن و جیاواز لە کەسانی تر ببینن و ببیستن ، تەنانەت جیاواز لەوەی کە گۆشەگیر بن و تا غەمخواردن و چۆنیەتی ژیانیان لە کەسانی تر جیاواز بووە، بە تەعبیری سروش ئەگەر بگەڕێینەوە بۆ زیندەگی عاریفان و لێ تێگەیشتن لە ژیان ی عاریفێك و ناسینەوەی ئەوا دەبێت عاریف لە مەجالی ئەم چەمکانە دا قسەی خۆی هەبێت، وە ئەگەر لە هەمویشی قسەی نەبێت ، لانی کەم پێویستە لەسێ یەکی ئەم چەمکانە قسەی هەبێت :





١. لە بابەتە مرۆڤایەتیەکان ، هەبوونی نەتەوە

٢. لە بابەتی سیستەم دەسەڵات ، لەسەر ئەوە کە حەق لە لای سیستەمە و نەك سیستەم لە لای حەق .

٣. بێت، حەق لێرەیە کاتێك کە هێز و قودرەت لێرەیە.

٤. لە بابەتی بارودۆخ ی کۆمەڵگا/ لە مەوریدی درۆ زۆر ی و دزی و ڕا و ڕوت .

٥. لە گوتاری سیاسی و کۆمەڵایەتی

٦. لە زمان

٧. لە دین/ڕەخنە گرتن لە دینی تەقلیدگەراو چوون بەرەو دینی تەحقیقی.

٨. **لە کەسایەتی (٢)**

٩. **عیرفان و مەعنەوییەت**

١٠. **ڕوو کردن لە خوا و پشت کردن لە دونیا**

**ئەمە ئەو خاڵانەیە کە هەر عاریفێك دەخوێنیتەوە ئیدی لە تێکستەکانیدا زیاتر جەغد لە سەرچوار مەسەلە دەکاتەوە ئەویش :**

**یەکەم : دین / سەرزەنشت کردنی دینی کۆمەڵگا .**

**دووەم : کەسایەتی پاراستن / گرنگی دان بە کەسایەتی لە ڕێگەی دینەوە .**

**سێ یەم /مەعنەوییەت و عیرفان /واتا تەفسیر و تەئویل کردنەوە شتە مادییەکان بە مەعنەوی و جەهالەت بە مەعریفە.**

**چوارەم : دونیا نەویستی خودا ویستی .**





**یەکەم دین : تێڕوانینی عاریفان زۆر جیاوازە بۆ دین ، واتا عاریفەکان ئیدی وەکو ئێمە لە دین تێنەگەیشتوون ، ئەوان هەندێ جار بە کۆنکرێتی پیچەوانەی ئێمە دیندارن ، وە ڕەنگە ئەو دینداریەی ئەوان بە لایەنی ئێمەوە بەشێك بێت لە کوفر ، وە ئێمەیش بە نسبەتی ئەوانە گێلین و نازانین چی ئەپەرستین ، ڕاستیەکە دەڵێین خودا پەرستین ، بەڵام ئەو خودا پەرستیە پەیوەندی بەدڵەکانەوە نیە ، بەڵکوو تەنها خودا پەرستیەکی تەقلیدی سارد و سڕی بێ مەعنەویەتە ، بۆیە هەمیشەیش عاریفان ئازار دراون تا ئاستی کوشتنیش ڕاپێچ کراون ،(عارفان را شمع و شاهد نیست از بیرون خویش) ، وە بۆیە ئەم ملاملانێ یە هەیە ، لە نێوان کەسانی عاریف و بەشێکی زۆری کۆمەڵگا کە غەرقی جەهالەت و نەفامی بوونە ، نموونەی حەلاج کە لە دار درا و هەروەها زەیلنوون و کۆمەڵێکی تریش ، بەڵام ئەوەی کە کارەساتە هیچ ئەم عاریفانە نەیانتوانی بەر بە کۆمەڵگا بگرن و هەوڵ بدەن کۆمەڵگا لە گەڵ پلورالیزمی دینی ئاشت بکەنەوە ، ئەوەش لەبەر ئەوە کۆمەڵگا هیچ کات تەسلیم نەبووە بە حەققانیەت و هەمیشە لەسەر ئەو هێڵە گشتیە لەسەر ڕۆیشتن بەردەوام بووە ، کە نایشزانێت ئەو هێڵە بۆ کوێ ی دەبات .**

دووەم کەسایەتی : بڕوا دەکەم عاریفان و قسەکردن لەسەر کەسایەتییان کەمێك ئاڵۆزە ، ئەویش بەو پێ یەی کەسایەتی عاری کەسایەتیەکی تەمو مژاویە ، وە تەنانەت کەسایەتی ئەوان لە کەسایەتی فەیلەسوفەکانیش ئاڵۆزترە ، بەڵام بەشێوەیەکی ئەوان کەسانێکن تەنها لە دوورە وە سەیری خەڵکی دەکەن و ئەوەندە تێکەڵاوی نێو کۆمەڵگا نابن ، ئەمەش وەکوو لەسەرەوە دا وتم ، لەبەر ئەو گرژیەیە کە بەهۆی بیر و بۆچوونەوە هەیە، بۆیە ئەوان ئەوەندە تێکەڵاو نابن لە گەڵ خەڵك دا ،مەحوی لە شوێنێکدا دەڵێت :

قەی کردنی سوراحی ئەگەر تێبگەی دەڵێ
دڵ تێکەڵ هاتنە لەگەڵ ئەم خەڵکە تێکەڵی(٣)

مەحوی حەزرەت لەم بەیتە دا ، مرقەمرقی لە کاتی داکردندا لە سوراحی ، شوبهاندەوە بە قلّپ و قوّپی ڕشانەوە و دەڵێ سوراحی کاتێ کە شەرابی لێ دادەکرێ ، دەکەوێتە مرقە مرق ، ئەوە ، ئەگەر لێ ی حاڵی ببی، دەڵێ تێکەڵ بوون لەگەڵ خەڵك مایەی دڵ تێکەڵ هاتنە، ئەگینا ئەگەر من





نەمەوتمایەتە دەستی کەس و شەرابیان لێ دانەکردمایە ، ئەم مرقە مرقەم لە چی بوو ؟(٤)
وە بە هەمان شێوە نالی بێزاری خۆی دەربڕیوە بەرامبەر بەم خەڵکە و ئەم شیعرەی نوسیوە کاتێ خوڵکی بەجێ هێشتوە و سەری خۆی هەڵگرتووە ، بەڵام ئەم لە بەیتی سێ یەمدا وەکو عاریفی تەواو هەڵسو کەوت ناکات ، چونکە کە دەڵێت سەرم قەڵغانە بۆ تیری قەزاتان ، لەگەڵ تێکەڵ هاتن لەگەڵ خەڵك زۆریان جیاوازی هەیە، نالی حەزرەت پێمان دەڵێت :

ڕەفیقان ! من ئەوا ڕۆییم لە لاتان
لە مەزڵومان بڵا چۆڵ بێ وڵاتان

بڵا سا شار بە شار و دێ بە دێ بین
لە دەست یاران بکەین تەیی وڵاتان

مەڵێن کەڵکی نەبوو ڕۆیی جەهەننەم
سەرم قەڵغانە بۆ تیری قەزاتان(٥)

واتە : هاوڕێیان ! برادەرینە! وا من ڕۆیشتم و بەجێم هێشتن، ساخوا بکات پاش من ،وڵاتەکەتان ستەم لێکراوێکی تری

**تیا نەمێنێ ، یاخود هیچ وڵاتێك ستەم لێكراوێكی تری تیا نەمێنێت ، تا كەس وەكو منی لێ بەسەر نەیەت (٦) ، لەوە وە نالی دێت و گوتاری خۆی دەخوێنێتەوە سەبارەت بەوەی خەڵكی زوڵمیان لێ كردووە ، بەڵام نالی هەر هیوای هەیە ، هیوا بەوەی كە ئەم بڕوا ، دوای ئەم ئیدی زوڵم لەم شوێنە دا نەمێنێت ، نەك هەر لێرە بە ڵكو لە هیچ شوێنێك زوڵم و ستەم نەمێنێت ، تا خەڵكی تریش وەكو ئەمی لێ نەیەت ، دواتر بەردەوام دەبێت و بەخۆی دەڵێت ، تا چش و قەیناكات ، ئەگەر لە دەست دۆست و برادەر و هاوڕێ بە هۆی ئەوانەوە دەربەدەر بین و وە ئاوارە و بین و ڕێگای دوری وڵاتان و شاران بگرینە بەر و سەری خۆمان هەڵگرین ، واتا نالی سەرباری ئەو هەموو سوكایەتی پێكردنەی و دەركردنەی هەر قایلەو دەڵێ بابە قەیناكات با دەربەدەر بین، ئینجا دێت و لە بەیتی سێ هەم دا دەڵێت مەڵێن نالی كەڵكی هیچی پێوە نەبوو ، ڕۆیی ..دەبا بڕوا جەهەننەم ، من ، هەرچەند ئێوەش لەگەڵم دا خراپ بوون و بوون بە مایەی ڕۆیشتنم ، بەڵام من هەر دڵسۆزەكەی جارانتانم و سەری خۆم ئەكەم بە قەڵغان بۆ ئەوەی تیری قەزا و قەدەر نەتانپێكێت (٧).**





**بۆیە ئەوان هەمیشە ئازاریان خواردوە ، بەڵام هەمیشە هەر هیوایان هەبووە، كە ئەویش هیوای ژیانێكی باشترە ، ئەو ژیانەی كە دوای كۆتایی پێهاتنی دونیایە ، عاریفان چونكە شوێنكەوتەی پەیامبرانن ، ئیدی زۆر خەسڵەتیان تیایە لە هی پەیامبەرەكان دەچێت(٨)، یەكێك لەو خەسڵەتانەش هەڵبەت بریتیە لە خۆڕاگری و پشو درێژی ، خۆڕاگری پشو درێژی لەبەرامبەر ستەم و زوڵم دا ، بەڵی ئەوانیش هەر بەم چەشنەیان كرد و خۆ ڕاگر بوون ، وە ئەوەی وای لەوانیش كرد كە هەمیشە خۆڕاگری هەڵبژێرن بەرامبەر بە ستەم ، ئەو هەستە مەعنەوی و باوەڕەیان بوو كە هاندەرێكی سەرەكی بو بۆیان لە بەرامبەر ئەو ستەمەی كە لێیان دەكرا ، هەڵبەت نالی هەر بە دەركردن دەرا ، ئەویش بە پێ ی ئەو شیعرەی كە نوسیویەتی ی ئێمە سێ بەیتیمان هێناوەتەوە ، وە مەحوی ئەوەی كە پێ ی كراوە جیاواز بووە لەوەی كە بەنالی كرا ، چونكە مەحوی حەزرەت هەمیشە خەمخۆری ناحەزی و خراپەكاریەكانی خەڵك بووە ، ڕاستیەكەی خۆری ئەوان دەمێك بوو بوو لە لای مەحوی گەورە ، هەر بۆیەش ئەوەندە سەرزەنشتی خەڵك دەكات كە ئیدی بەسە دەبڵ میزاجی و دەبڵ ئەخلاخی لەبەرامبەر خۆیان خوا .**

سێیەم : مەعنەویەت و عیرفانخوازی ، عیشق و حەقیقەت ، هەمیشە مایەی سەرنجی عاریفەکان بووە ، ڕابیعەی عەدەوی لەیەکەمین عاریفەکانی مێژووی تەصەوف بووە ، کە لە ساڵی ١٣٥ هیجری کۆچی دوایی کردووە ، هەمیشە دەیگوت : خودای گەورە لە دۆزەخ دا بمسوتێنە ، ئەگەر بە هیوای بەهەشت تۆ بپەرستم ، وە بەهەشتم لیّ حەرام بکە ئەگەر من لە پێناوی تۆ دا تۆ نەپەرستم،بە تێروانینی فەریدەدین عەتتار نەیشاپوریش بێت :

با تۆ اینجا گر ویصالی مئی نهم
ان به ملك هرد و عالم کی وهم !

می بود این گلخنم روشن ز تو
چیست به از نو .که من می خواهم زتو

مرگ جان باد این دل پرپچ را
گر گزینه برتو ەرگز هیچ را

من نه شاهی خواهم نه خسروی
ان چه می خواهم می از تو هم تویی(٩)





واتە : ((گەر لێرە لەگەڵ تۆ دا بناغەی ژوانێك چی بکەم ، کەی ئەوە بە موڵکی هەردوو جیهان دەفرۆشم ، ئەم گوڵخەنەی من زۆر ڕووناکە بەهۆی تۆوە ، چیە لە تۆ باشت تا تامی لە تۆ داوا بکەم ، بمرێت ئەم دڵە پڕ جەنجاڵەی من ئەگەر بێت لە تۆ زیاتر شتێکی تر هەڵبژێرێت ، من نە پادشاییم دەوێت و نە خەسرەوی ، ئەوەی من لە تۆم داوایە ، بە تەنها هەر تۆی و بەس)) .

دونیا لە دەستی عاریفانە و لە دڵیان دا نیە ، ئاخر خۆ هەر ئەبێت ئاواییش بێت ، ئەوەی کە لە دڵ دایە مەعنەویەت و حەققانیەت و ڕۆحانییەت و ڕاستگۆییە، ئەوەیشی کە لە دەست دایە و بۆ فڕێدانە ، دونیایە ، هەڵبەت سەعدی شیرازی دەڵێت : دونیا وەکو زار وایە ، هەر کات هەڵتگرت بۆ ئەوەیە کە فڕێ ی بدەیت ، پیسییە پیسی ، یەکێك لە میتۆدە هەرە گرنگەکانی پرۆسێسی عاریف بوون ، ئیخلاصە ، ئیخلاص ئاکامی زەروری دڵ و ڕونکردنەوەی ئاراستەی خوایە ، وە تا ئەم ئاراستەیە نەبێت ئیخلاص مەحاڵە ، کاکڵە نوێژێشی لە هەمان ئامادەیی دڵ و ئاراستە دایە (١٠)،پێم وایە گرنگە پێداچوونەوەیەك بە کەڵام و فەلسەفە دا بکەین ،

چونکە عاریفان کۆنێکتییان زیاتر لەگەڵ هەردوو پێگە کە دا هەیە ، واتا هەم پێگەی شیر و هەمیش شەککەر وەکو سروش دەڵێت، وە ئەوەی کە زیاتر و زۆر تر کۆنێکتی لەگەڵ فەلسەفە دا هەیە ئەوە ئیتر فەیلەسوفەکانن، وە دواجار جیاوازی نێوان زانستی کەلام لەگەڵ فەلسەفەی دیندا بریتییە لەوە کە کەلامییەکان لە پێش دا ڕاست بوون و حەققانیەتی بابەتە ئاینیەکانیان سەلماندوە و ئینجا دواتر دەلیلی عەقڵی بۆ ئەو شتە بە ڕاست زانراو و چەسپێنراوەی خۆیان دەهێننەوە، وە ئەمە بە درێژایی مێژوو کاری کەلامییەکان بووە ، ئێستایش کاریان هەر ئەمەیە ، بۆ نموونە لە ڕۆژئاوا دا چەندەها کەلامی وەکو((شلاییر ماخەر و بارت و ... هتد )) و ئێسستایش چەندەهای دیکە لە زانستی کەلامی مەسیحیدا کاریان کردوە و وە بەردەوامیش مژۆڵی کارکردنن بۆ بەرگری کردنن لە کایە ئاینییەکان ، کە بەڵگەکانیان بە قازانجی ئاین و سەلماندنی ڕاستی بابەتە ئاینیەکانیانە ،وە هەروەها لە دونیای ئێمەی ئیسلامیش دا چەندەها کەس هەن کە پارێزگاری لە دینەکە دەکەن و بە قازانجی دینەکە ، وە ئەوەش هەڵبەت لە فرمێکی جیاواز تر دا ، کە ئەم دوو دونیاییە بە تواوی لە یەکتری جیاوازن لە زۆر ڕووە وە ، وەفەلسەفەی دین لەیەك خاڵدا هاوبەشە لەگەڵ





کەلام ، ئەویش ئەوەیە کە فەلسەفەی دین لەگەڵ کایەی کەلامی دیندا هاوبەشە بۆ مامەڵەیەکی عەقڵانی لەگەڵ ئاینەکان دا ، وە فەلسەفەی دین خۆی بۆ خۆی لە چەند کایەیەکی گرنگ پێك هاتووە ، دەکرێت ئەم کایایانە بە هاوبەشی لەگەڵ تێزی عاریفان لەمەڕ دین بخەینە ڕوو ، خۆی فەلسەفەی دین بریتیە لە بە دواداچوونی ئەزموونی دینی کە عاریفانیش ئەمەیان ئەنجام داوە ، وە دەتوانین بڵێین ئەمە لوتکەی فەلسەفەی دینە لە سەدەکانی نۆزدە و بیست دا، هەڵبەت لە لای عاریفان دەمێك ئەم بەشە تێپەڕیوە، بەشی تێگەیشتن لە بەدواداچوون بۆ ماناکانی تری دین کە مەعنەویەت و ڕۆحانیەت و حەقانیەتە ، لە کانتەوە تا وینگنشتاین، ئەمە سەرنجی فەیلەسوفان بووە سەبارەت بە ماهیەتی دین .

ئایین و ئەخلاق : ئەخلاق دەگۆڕیت و مرۆڤ دەگۆڕێت ، ئەمە تێزە لە هەمبەر ئەو پەیوەندیەی کە لە نێوان ئایندار و یان مرۆڤی ئایندار و ئەخلاقی ئایینیەت ، خۆی ئەخلاق بە بێ ڕێسای ئەخلاقی بونیاد نانرێت(١١)،وە دەبێت بێگومان بین لەوەی کە ڕێسا ئەخلاقیەکان ئایین دەیخوڵقێنێت ، واتا خوڵقێنەری ڕێسا ئەخلاقییەکن ئاینەکانن ، وە دواتر عاریفیش یەکێکە لەو مرۆڤانەی کە لەگەڵ ئەوەی

خوێندنەوەیەکی فەلسەفی بۆ ئایین هەیە ، لەگەڵ ئەوەش و لە هەمان کاتتدا ڕەهەندی ئەخلاقی ئەو هەمان ئەو ڕەهەندە ئەخلاقییەیەکە ئایین بەرهەمی هێناوە ، منی ڕۆشنفکرێکی دینی ، هەڵبەت دەردی دینم هەیە ، واتا دەمەوێت دیندار و لە هەمان کات دا عەقڵگەرا بم ، وە مرۆڤێکی سادەش کە تێکستە مەعنەوییەکان و تێگەیشتنی بۆ سوژە ڕۆحانییەکان هەبێت ، دەبێت ئیدیش بڕیاری ئەخلاقی خۆی بەسەر دین و دیندارەکان دا بدات ، خۆ کێشەی عاریفان لەگەڵ خەڵك دا زیاتر ئەوە بووە ، کە ئەوان خوێندنەوەیان بۆ دین هەمان ئەو حوێندنەوە ئەخلاقی و ئەقڵگەراییە بووە کە پێشینان هەیانبووە ، بەڵام لێرە دا هەم فۆرمی ئەخلاقی و هەم ستراکتۆری ئەخلاقی گرنگە ، وە دیسان فۆرم و ستراکتۆری مەعریفەی دین و دینداری دینگەرا ی ئەنتی عەقڵگەرایش گرنگە، وە پێچەوانەکەیشی هەر ڕاستە ، ئەو مەسەلەیەی کە نێوی مەعریفەی دینیە ئەوەیە کە دین ناسی عەقڵگەرایی، کە هەڵبەت ئەم مەسەلەیە دژە بە مەسەلەی ئەخلاقی تەقلیدگەرایی دینی ، ڕوخانی ناخی ئەخلاقی تەقلیدگەرایی لەوەوە دەست پێ دەکات کە مەعریفەی دینی بوونی هەبێت ، کە مەعریفەی دینی هەبوو ئیدی ئەم مەعریفەی دینییە هەڵدەستێت بە بونیادی ئەخلاقێك لەگەڵ خۆیدا، واتا هەر





کۆنسێپتێك نشونمای کرد ، ئیتر ئەخلاقی ئەو چەمکەش شانبەشانی چەمکەکە گەشە دەکات ، هەربۆیە مەعریفەی دینی کە هەبوو ،ئیدی ئەخلاقێك گەشەدەکات بە ناوی ئەخلاقی مەعریفەی دینی، هەربۆیەشە عاریفان چونکە مەعریفەی دینییان هەبووە، بەو هۆیەشەوە جۆرێکی تر لە ئەخلاق لەگەڵ خۆیاندا دەهێننە نێو دونیای دیندارە تاك ئەخلاقەکان ، کە لە ڕاستیا تاك ئەخلاقی مەبەستم لە درێژەدان بە کلتوری کوشتنی فرە ئەخلاقییە، وە پڕۆژەی کوشتنی فرە ئەخلاقی ئەمە سەرەتای دەرکەوتنی باڵادەستی تاك ئەخلاقی و سەرەتای ڕەهابوونی ئەوجۆرە لە ئەخلاقە دینیەیە ، کە ئەمە نا یەکسانە بە دیدی مەعریفەناسانی دینی و عاریفانی دونیای دین .

لەم سۆنگەیەوە دەمەوێت پەنجەرەی مەعنەویەت بکەمەوە بە ڕووی عاریفان دا ،ئەو پەنجەرەیەی کە هەوای ئەو دیو دونیای عاریفانمان بۆ بێت و بۆنی ئەوانمان بۆ بێت ، وە لەمەوە دەمەوێت لەو پرسیارەوە دەست پێ بکەم کە ئایا ئەو جیاوازیانە چین کە عاریفان لەگەڵ خەڵکی تر دا هەیانە ، ئایا عاریفان لە کوێ بن مەعریفەی دینیش لەوێ هەیە؟ ئەو نا ڕۆشنیە چیە کە بوونی هەیە لە پەیوەندی نێوان عاریفێك و نا عاریفێك دا؟ بێگومان لەسەر ئەو پرسیارگەلانە ،

چەندین وەڵام هەن، بەڵام ئایا تا چەند وەڵامەکان مایەی قبوڵن ، ئەوە مەسەلەیەکی ترە ،ئەو وەڵامانەش کە بەشێکیان فەلسەفین و بەشێکیان وەڵامگەلێکن کەسەرچوەکانیان مەعریفی دینین کە دەربارەی دونیای مەعریفی دینی و کێ بوونی خوا و مەعنەویەت و پلورالیزم و چاوەڕوانی مرۆڤ لە ئایین و هەروەها ناساندنی فەلسەفەی دین بە مرۆڤەکان، وە ئەو میتۆدانەی کە پێویستن بۆ وەڵام دانەوەی ئەو پرسیارانە لێردا بەکاریان دەهێنین .

عاریفان ئەو کەسانەن کە زۆر لە خەڵکی تر ناچن ، واتا ئەگەر ئەوان لە خەڵکی تر بچووبان ئیتر دەبوایە قسەمان لەسەر کایەیەك نەکردبا بە ناوی کایەی عیرفان ، هەربۆیە وا پێویستە کە جەهالەت پێناس بکەین ، چونکە ئەو دوو بابەت ئیدی تا خوێن دژو ئەنتی ئەکترن ، لە مەحوی و نالیەوە دەچینە سەر بابەتەکان ، ڕاستە کە مەحوی نالی میوەی یەك درەخت نین ، وە ئێمەش ئەم لێکۆڵینەوەیەمان هەر بۆسەلماندنی ئەو مەبەستەیە ، وە ئێستا بە پێ ی جیاوازیەکانیان ، وەڵامی ئەو پرسیارانەی سەرەوەش دەدەینەوە کە کردومانن :





دونیا بینی و قیامەت بینی : نالی لەو شاعیرانەیە کە قیامەت ناسێکی باش و دونیا ناسێکی باش نیە ، وە بە تەواوی پێچەوانەی مەحویە ، کە مەحوی دونیا ناس و قیامەت ناسێکی زۆر پێرفێکت بووە، وە ئەوەش ڕەنگی داوەتەوە لە شیعرەکانی دا و ئێمە دوو لێکۆڵینەوەمان لەسەر ئەنجام داوە هەر لە نێو ئەم کتێبە دایە ، بە ناوی دونیا ناسی لە لای حەزرەتی مەحوی، وە خودا ناسی لە لای مەحوی ، هەڵبەت خودای دونیا لە لای مەحوی خودای قیامەتیشە ، وە هەبوونی ئەو پەیوەندیە سۆزداریە لە لای نالی، جوانتر بڵێم نالی کەسێکی زیاتر جوانباز بووە، هەڵبەت لە دووجار زیاتر عاشق بووە و ڕەنگ دانەوەیشی هەیە لە شیعرەکانی دا و تەنانەت ناویان هاتووە ،مەستورە ، مەحبووبە ، حەبیبە ، هەڵبەت دەڵێن کەسێکی تریشی خۆش ویستوە بە پەنهانی لە ژێر ناوی (عائیشە) ، بەڵام لەلای مەحوی (ئافرەت) ئەو پێگەیەی نەبوو، جگە لەوەی کە دەڵێن گوایا بەیتە شیعرێکی هەیە موعەممایە و بۆ(گەوهەر) ی یاری نوسیویە ، کە من لە لێکۆڵینەوەیکی نێو ئەم کتێبە ئەوەشم شیکردۆتەوە ،بەڵام لە ڕاستیدا ئەوەی گرنگە ئەوەیە کە ئایا مەحوی بۆ گەورهەر ژیا؟بە دڵنیاییەوە نەخێر، چونکە ئەو ئەو بە تەنها ئەو بەیتە شیعرە نابێتە بەڵگەی

تەواو لەسەر ئەوەی کە مەحوی ژیانی خۆی هەموو بۆیار
تەرخان کردووە ، یان زۆرینەی ژیانی لە پێناو عیشقێکی
زەمینی دا تەواو کردووە، وە ئەو تێکستانەی کە ئێستا
لەبەر دەستمانن زیاتر ئەو تێکستانەن کە بابەتی ڕاستگۆیی
و خودا و مەخلوق و مردن و ئاداب و کۆمەڵێك شتی لەم
جۆرە وتراون ، بەڵام هەرچی نالیە بە کۆنکرێتی دیارە کە
بەڵی نالی لە کەسانەیە کە دەبێت ئێمە وەکو شاعیرێك
بیناسین نە وەك عاریفێك ، ئەویش بەم پێ ی ئەم
تێکستانەی کە لە خوارە نوسیومانن، ئەویش وەکو
بەڵگەیەك لەسەر عاریف نەبوونی ڕاستەقینەیی ئەو شاعیرە :

پێم دەڵێن، مەحوبە خێل و قیچە مەیلی شەڕ دەکا
خێل و قیچە ، یا تەرازوی نازی نەختی سەر دەکا

خێل و قیچە، یا بە غەمزە بۆ نیشانەی دڵ بە چاو
مەیلی ڕاست هاوێتنی موژگانی دڵ پەی کەر دەکا(١٢)

بۆ زیاتر ڕوون کردنەوەی ئەم دوو بەیتە ، هەر وەك لەم دوو
بەیتە دەرئەکەوێ ، مەشهوریشە کە وا حەبیبەی یاری نالی
خێل بووە، خێلیش لە ناو خەڵك دا بە عەیب ئەژمێردرێ و





ڕوانینی خێل نیمچە خێسە لێکردنێکە ، هەروا خێلیش
جارجار وا ئەونێنێ کە چاوێکی کردۆتەوە و چاوەکەی تری
ئەنوقێنێ، نالی لەبەیتی یەکەم دا بەرپەرچی ئەوانە دەداتەوە
کە خێل بوونی حەبیبەیان بە عەیبە داناوەوە ، دەڵێت:
ناحەزان پێم دەڵێن خۆشەویستەکەت خێل و چاولارە ،
خێسە لە خەڵکی ئەکات و وەك ئەوەی بڵێ ی کە شەڕیان پێ
ئەفرۆشێ ، نەخەیر نەخێلە و نە خێسەش لەکەس ئەکا ،
تەنها ئەوەندەیە کە تەرازوی نازی، کە چاویەتی، کەمێك
سەر ئەکا و بەسەر لایەکا ناز زۆرتر ئەکا تا بەسەر لایەکی ،
وە لەبەیتی دووهەم دا پێ ی وایە کە یار خێل و قیچ نیە،
بەڵکو ئەیەوێ بەغەنزەی چاوی ، تیری برژانگی کە دڵی
دڵداری پەی ئەکات، ڕاست بەاوێ بۆ دڵ و چوار پەلی دڵی
پێ ببڕێتەوە ، تا مەیدانی دەربازبوونی نەمێنێ ، دیار تیر
هاوێژتنیش بۆ ئەوەی نیشانە بپێکێ ، چاوێکی ئەگرێتە
نیشانەکەو چاوەکەی تریشی ئەنوقێنێ (١٣)وە لاوازی
ئادابی شاعیر لە شیعرێکیانا بە ڕوونی دیارە،خۆزگە سەد
خۆزگە ئەو شیعرەی نەنوسیایە ، هەڵبەت بۆ ئەوەی کە
ئێمەش بمانتوانیایە ئەو حەققە بەویش بدەین ، لەم پارچە
شیعرەی نالیدا ، سەرەتای ئەدەبی ڕووەهڵماڵراوی کوردی بە
دی دەکرێ کە تا ئێستاش داب و نەریتی کۆمەڵایەتی

نەیهێشتووە کە جێگای خۆی لە ئەدەبیاتمان  دا بکاتەوە، هەڵبەت ئەگەر نالی شاعیرێکی داشۆرەر بوایە ، نەك ئەوانەی بە عاریف نای دەەێنن و دەیخەنە ڕیزی مەولانا مەحویەوە، جا وتنی شیعر لە لای خوێندەوارێکی مزگەوتەوە و پتر لە ١٥٠ ساڵ بەر لە ئەمڕۆ و لە شارێکی لە ڕاددەبەدەر نەریت ڕاگر و سەرپۆش لەسەری وەك سنە دا ، وە بەرامبەر بە میرکچێك ، نیشانەی چاو نەترسان و بزێوی و جەسارەتێکی بێ سنورە لە نالیەوە ، ئەمە تا ئێرە، باشە ، ئەو شیعرە دەیسەلمێنێ کە نالی پادشای مەملەکەتی شیعر بووە ، بەڵام دەیشیسەلمێنێ کەهیچ کات نە سۆفی یەکی ڕاستەقینە بووە و نە عاریفێکی ڕاستەقینە ، ڕاستە کۆمەڵێك دەستەواژەی عیرفانی سۆفیگەرێتی بەکار دەهێنێت ، بەڵام ئەوە هیچ پەیوەندی بە کەسایەتی شاعیرەوە نیە ، نالی دەڵێت :

مەستورە کە حەسناوو ئەدیبە بە حیسابێ
هاتە خەوم ئەمشەو بە چ نازێك و عیتابێ(١٤)





واتە : مەستورە کە بە ئافەتێکی جوان و ئەدیب دا ئەنێن ، هاتە خەوم ئەمشەو ، بەڵام چ نازێکی بەسەر دا ئەکردم و چۆن بە گلەیی و لۆمە بو لێم ؟!

هاتوم وتی : عوقدەم هەیە ، قەت مومکینە وا بێ ؟
هی تۆم ئەگەرەم مەسئەلە حەلکەی بە جەوابێ !(١٥)

واتە : لە خەومدا هاتە لام و وتی گرێ و ئاڵۆزییەکم هەیە ، ئاخۆ لە توانا دا هەیە چار بکرێ و بکرێتەوە ، یا ئاخۆ هەر وا ڕەوایە بە چارنەکراوی و نەکراوەیی بمێنێتەوە ؟! ئەگەر تۆ بتوانی ئەم پرسیارەم بۆ یەکالا بکەیتەوە و ئەگەر یشێ ئەم گرێ یەم بە وەڵامێ بۆ چار بکرێ کە ڕاستەوخۆ جێ ی خۆی بگرێ ، یان ئەگەر بێتو ئەو داوایەم بۆ جێ بەجێ بکەی ، ئەوا دەبم بە هی تۆ ، دیارە مەبەست لە گرێ لەمەدا پەردەی کچێنی یە ، وە چارەکردنی ئەو گرێیە و کردنەوەی بەوە دەبێت کە نالی سێکسی لەگەڵ دا بکات .

ڕاستیەکەی لەم شیعرە دا ئەو بەیتانەی تری دوای ئەم دوو بەیتە پێویست ناکات بینوسین ، چونکە پێم وابێت ڕوون بۆتەوە ، کە لێرەدا نالی گوتاری سێکسی دەکات بەبەشێك لە

**کۆشـیعرەکـانی و دیوانـەکـەی ، دوای ئـەوە دیـسان نـالی دێتەوە سەر باسی حەبیبە و دەڵێت :**

**دەستم لە گەردەنی خۆت هەڵمەگرە ئەی (حەبیبە)**
**وا بزانە خوێنی خۆمە، یا میننەتی ڕەقیبە**

**سەر بەردەبازی ڕێتە، تەن تەختە بەندی جێتە**
**دڵ مەیلی خاکی پێتە، ڕۆح ماڵی خۆتە ، بیبە(١٦)**

**واتا : گیانەکەم ناچاری دەستبەرداربوونی خۆتم مەکە ، با هەر عەودالْ و سەوداسەرت بم ، ئەمەت لەلا گران نەبێت کە من دڵداری تۆم و هەرگیز دەستم لەیەخەت ناکەمەوە، خۆ تۆ منـت کوشـتووە و خـوێنم لـە ئـەستۆتدایە ، دە وابزانـە ئـەم دەست لەیەخە نەکردنەوەشم بارێکی ترە بەسەر شانتەوە وەك گوناهی خوێنم کە ڕشتووتە و لە ئەستۆتایە ، یا وەك ئەو منەتەی کە بەدکاری لەبارەی منەوە ئەینێتە سەرت ، سەرم بۆ کردوی بە بەردەباز تا پێ ی پیانەی و تا بەسەریا بپەڕێیتەوە بۆ ئەو شوێنەی کە ئارەزوت لێ یە، لەشیشم تەختە بەندی جێگای حەسانەوەتە، دڵیشم ئارەزویەتی کە ببێتە خاکی بەری پێت ، دەسا پێ ی پیا بنێ و و با خاکی**





**بەری پێتی پێوە بنوسێ، گیانیش ئەوە هی خۆتە، بیبە ، چی لێ ئەکەی بیکە .**

**دونیـای نـالی زۆر جیـاوازە لـە دونیـای عـاریفێکی وەکـو مـەحـوی ، لـە ڕاسـتیدا ئـەم جیاوازیـەش جیاوازیـەکـی بوونگەرایی وجودییە ، واتا بیرکرنەکانی نالی جیاوازە لە مەحوی لە ڕووی تێگەیشتن بۆ ئەو چەمکانەی کە پێشتر ناوم هێنان ، وەکو مەعنەویەت و حەققانیەت و مەعریفەی دینی و کۆمەڵێك شتی تر، نالی ئیشی لەسەر ئەو چەمکانە نەکردووە ، وە ئیشکردنی نالی زیاتر لە شوێنی خۆشەویستی زەمینی دا خولاوەتەوە و هیچی تر ، وە هەڵبەت شیعری تریشی هەیە دەربارەی چەمکەکانی تر ، بەڵام ئەمە ئەو ناگەیەنێت کە بڵێین نالی بۆ ئەو شتانە ژیاوە ، بەڵام هەرچی مەحوی حەزرەتە، زۆر گرنگی بەو چەمکانە داوە و ئیشی لسەر کردوون ، هەر بۆ نموونە لەسەر مەسەلەی مەعنەوییەت با بازنین چی دەڵێت :**

**هەر دڵێ پێوە نەبێ داغ و خەتتی جێ دەمی تیغ**
**دەعویی عیشقی ببێ دەعوییە ببێ مۆر و سەنەد**

**واتا ، تا جێگەی داغ و برینی تیغی یار بە دڵی دڵدارەوە نەبێ ، قسەی بە هیچ دانانرێ و بە دڵدار ناژمێردرێ ، چونکە سەنەد و قەباڵەی مۆرکراو و لێ نوسراوی پێ نابێ کە ئەوە بگەیەنێ کەوا دڵدارێکی ڕاستەقینەیە ، بەڵگەی دڵدارێتی بریتیە لەو خەتانەی بە تیغی دەستی یار لە دڵی دڵدار دەنوسرێن و لەو مۆری داخانەی کە دەیانێ بە دڵیەوە .**

**مەحوی لە کۆی تێکستەکانی دا تەنها گرنگی بە وشەی عیشق دەدات ، عیشقێك کە زۆر جیاوازە لەو عیشقەی نالی ، ئەو هیچ کات ناو ناهێنێت و هەمیشەیش لە دونیای میتافۆر و مەجاز دا دەخولێتەوە ، پێ ی وایە کە عیشق ئەو کاتە عیشقە ، ببێتە ئاگر ، وە ئاگرەش بەر ببێتە هەر کەس بیکاتە کەس ، واتا کەسایەتیکەك جیاواز لە هەر کەسایەتیەکی دی ، ڕەنگ و دەنگی خۆی هەبێت .**
**وە نالی هێندە پەیوەندی نەبەستوە لەگەڵ شاعیرە عاریف و موتەسەویفەکان دا ، تا ئەوەی کەمەحوی زۆرترین زانیاری لە بارەیانەوە هەبووە و تێکەڵکێشی شیعریانی لەگەڵ کردوون ، بۆ نموونە :**





**مەحوی و مەولانای ڕۆمی ((بەلخی)) :**

**مەحوی گەورە لە پێنج خشتەکیەکی فارسی خۆیدا بەیتێکی مەولانای تێکەڵکێشی شیعرەکەی خۆی کردووە و دەڵێت :**

**پش همان بەردم اری ((محویا))**
**رو بسوی بارگاه کبریا**
**با ده سد زاری از این شه خواهیا**
**(ای کرامت بخش جان اولیا)**
**(یا بکش،یا باز خوانم ، گو بیا)**

**مەحوی لەگەڵ شێخی سەعدی :**

**تۆ مەڵێ یەك مەرتەبە ، سەد مەرتەبە**
**(دشمن دانا ، بە از نادان دوست )**

**مەحوی لەگەڵ خواجە حافزی شیرازی دا :**

**دەزانێ ڕۆژە ئەو ، من شەو کەچی پێشم دەڵێ((مەحوی))**
**حزوری گر همی خواهی ، مشو (حافظ) از او غایب)**

لەمەوە دەردەکەوێت کە مەحوی بە کۆنکرێتی cnocrete ئاگەدار بووە لە ڕاسیۆنالیزەیشنی سۆفیگەرێتی و, دونیای عیرفان زۆر باش شارەزا بووە ، وە نموونەیەکی تر بۆ بەڵگە ، ئەو شیعرەیەتی کە بۆ مەولانا خالید نەقشەبەندی نوسیویەتی، وە تێکێەڵکێش لەگەڵ شیعرێکی ئەو دا ، هەڵبەت ئەمانە هەموو بەڵگەن لەسەر ئەوەی کە بەڵی مەحوی حەزرەت هەم عاریف و هەم سۆفی بووە ، بەڵام کامەتا بەڵگە لەسەر نالی کە عاریف بووە ؟ کە سۆفی بووە ؟

هەمیشە مەحوی ئیشی لەسەر (عەدەم) و (بوون) وە مەخلوق و ئاگری عیشق و دونیا و خودا و مردن کردووە ، بە پێچەوانەوە نالی زۆر بەکەمی تێکستی هەیە لەم بارەیەوە ، وە زیاتر تێکستەکانی بریتین لە تێکستی دڵداری سەرزەمینی و سۆز دەربڕین بۆ بەرامبەر کە هاوزڕەگەزە . ئێوە باوەڕ بەم هاوکێشەیە بهێنن یاخود ئینکاری بکەن ، ئیدی هەر ئەوەیەکە هەیە ، ئەویش نەبوونی بە دوومیوەی یەك درەختی مەحوی و نالی ن ، مەحوی هەموو شتەکانی تری خستۆتە خزمەت مەسەلەی تەسەوف و عیرفانەوە ، وە تەنانەت شیعریەتیش ، وە من دڵنییام ئەگەر زمانی ئەو کات





لە شیعر زیاتر ئامادەگی هەبووایە ، بەدڵنیاییەوە مەحوی میتۆدێکی تری بەکار دەهێنا بۆ گەیاندنی بۆچوونەکانی لەسەر ئەو کایە جیا جیا یانەی کە ئێستا بە سیعر قسەی لەبارەوە کردوون ، بەڵام لەبەر ئەوەی زمانی ئەوکاتەی نوسین زیاتر بریتی بووە لە زمانی شیعری ، هەر لەبەر ئەمە مەحویش بیروبچوونەکانی لە ڕێگەی شیعرەوە وتووە ، واتا مەحوی بۆ شیعر نەژیاوە ، بەڵکو بۆ : (تەریقەت و حەقیقەت و شەریعەت) ژیاوە ، بەڵام هەرچی نالی شاعیرە ، هەموو ژیانی نالی بریتی بووە لە ژیان وە مردن بۆ شیعر و شیعریەت ، وە دواتر نالی هەموو شتەکانی تری خستۆتە خزمەت زمانی شیعری و وێنە و ئاوەز و ئاوازی شیعری ، نالی شاعیرە ، بەو مانایەی شاعیرە و هیچی تر ، نالی موبە تەنها مەخاتەبەی سۆز دەکات ، بەڵام مەحوی تەنانەت قسە لەگەڵ عەقڵیش دەکات ، وە ژیانی نالی هەر بۆ خۆی جیاواز بووە لە ژیانی مەحوی ، نالی کەسێك بووە تا ڕادەیەك ڕەبەن ، ئەویش بەو پێ یەی تا ئێستا کەسی لە پاش بە جێ نەماوە ، بەڵام مەحوی خێزانی هەبووە و هەموو ژیانیشی لە خزمەت خەڵك دا لە ناو خانەقاکەیدا تەواو کرد ، تەماشا بکەن ئەزیزان ، مەحوی یەکێك بووە لە ڕۆشنفکبرە ئاینیەکانی سەردەمی خۆی ، نەك هەر ئەوەیش دەکرێت

ناوی بنێین فەیلەسوفێکی ئیسلامی تا ڕاددەیەك (ئسولّی ) ، ئەویش بەوەی کە مەحوی یەکێك بووە لەوانەی کە لە جیاتی ئەوەی بە شوناسی ئاینیەوە سەرگەرم بێت ، وە خەریکی حەقیقەتی ئاینی بێت ، شوناس بۆ ڕۆحانیەت ، ئیسلامی ڕۆشنبیرانی ئاینی ، ئیسلامی حەقیقەتە و شوناس لقێکە لەو ، مەحوی بە مەسەلەی ئیمان و ئەزموونی ئاینی و تەفسیرە جیاوازەکانی ئاین و فەراهەمکردنی توانای بە کردەیی کردنی ئەوانەوە خەرك بووە ، ئەمانە هەموو بریتین لە تیوری هێز ، بەکار هێنانی هێزە عەقڵی و مەعنەویەکانە ، تەنانەت هەر یەك لە ئێوە لە کایەی عیرفان دا بوویەکی بەهێز نەبن، ئەوا بە دڵنیاییەوە عیرفان گرنگیتان پێ نادات، بەڵام کاتێك بەهێز بوون لە بیرکردنەوە لە تێزە عیرفانیەکان ئەوا ئیدی بە شێوەیەکی ئوتوماتیکی دەچنە نێو چوارچێوە عیرفانەوە، من مەبەستم لە هێزی عەقڵە ، واتا هەبوونی تیوری هێزی عەقڵی، چونکە سەروبەندی هێز لە لای ڕۆشنبیرەکان زیاتر لەگەڵ عەقڵ دایە ، ئەگەر عەقڵ هێزی نەبێت بریتی نیە لە هیچ ، ئەوە هێزە کە عەقڵ دەکات بە داینەمۆی هەڵسوڕاندنی شتەکانی بەردەم عەقڵ ، خاڵی سەرەکی و مەبەستی بنەڕەتی و جەوهەری ئەم بابەتە ی ئێمە لێرە دا بریتیە لە (چاکسازی فیکری و سلوك و





خوێندنەوەی دەقە مەعریفی و ئاینییەکان )(١٧) وە بە جیاوازای لە لای هەریەك لە مەولانا مەحوی و نالی شاعیر ، کە هەڵبەت ئەویش بە پرۆسەیەکی زۆر گرنگ و پلان بۆ داڕێژراوی تەواو پێرفێکت دەبێت ، لە بواری پەروەردەی دەروون و چاکسازی مۆراڵ و ناخ ، د.شریعەتی گوتەنی گەڕانەوە بۆ خود (بازگشت به خود) ، گەڕانەوە بۆ خود واتا گەڕانەوە بۆ ناخ، مەحوی پێ ی وایە میوانە لە نێو دونیا ، وە هیچ کات پێ ی وانیە دونیا لە لای ئەو میوان بێت، ئەو پێ ی وایە کە مرۆڤەکان هەموو میوانن لە نێو دونیا و ئێرە کاروان سەرایە، کاروان سەرایش شوێنی حەوانەوە و پشودانە ، حەوانەوە و پشودانێکی کاتی، شوێنی نەفەس و تازەکردنەوە و خۆ شارزکردنەوەیە ، وێستگەیە بۆ گۆڕ و تیندان بە خود بۆ گەیشتن بە مەبەست و مەنزڵ و ئارمگا ، ڕاسل دەڵێت : ژیانی ڕاستەقینەمان لە ئاسمانەکان دایە ، بەڵام بە داخەوە ئێمە دامەنگیر و وابەستەی زەوی بووین ، تەنها لە ڕێگەی پاکی و بەرائەت و نەزاهەت و تەزکیە و پاککردنەوەی نەفس و ڕاهێنانەوەیەتی کە دەتوانین لەم پەیوەست بوونە بە زەویەوە دەرباز بین و دواجار چێژ و لەزەتی پەیوەست بوون بە خودای میەرهبانەوە ببەستین ، ڕوون و ئاشکرایە کە هێزی پەیوەست بوون لە دابڕان و

فیراق دایە ، بە دوور کەوتنەوە بەخۆت و ئەوەی پەیوەندی
بە تۆوە هەیە بۆ ماوەیەکی کەم ، ئینتیما و پەیوەندیت بۆ
ئەو شتە بەهێزتر و پتەو تر دەبێت ، ئێمەیش چونکی لە
ئاسمانەکانەوە هاتوین هەر لەبەر ئەوە ئیدی زیاتر تەماسی
ئێمە لەگەڵ ئاسمان دایەو هێندە لەسەر زەوی بێتاقەتین،
تەنانەت ببینن مرۆڤە بێدینەکانیش هەر هەمان ئەو دۆخەی
ئێمەیان هەیە لە بێتاقەت و بێزار بوون لەسەر زەوی ، بەڵام
ئەوەی کە ئێمە لەوان جیادەکاتەوە ئەوەیە، کە ئێمە
پەیوەندیەکی مەعنەوی — ڕۆحی مان هەیە لەگەڵ شوێنێك
کە هەم جیاوازەو هەم دوورە لە زەویەوە ، (١٨)لەلای
مەحوی هەر بەم شێوەیەیە، بەو شێوەیەی کە هەستێك هەیە
دەیجوڵێنێت بۆ ئارەزووکردن بۆ گەڕانەوە ،هەر لەبەر
ئەوەیش بووە کە ئیشی لەسەر بەرجەستەکردنی :
خوداناسی و خودا پەرستی و خودا دۆستی کردووە ، ئەوە
لەلای مەحوی خودی دین و ڕۆحی دین بووە ، هەڵبەت
خۆیشی ئەوە خودی دین و ڕۆح و جەوهەری دینە ، لەلای
مەحوی دین مانا و مەغزا و هێمای تایبەتی خۆی هەبووە
،(١٩)، هەربۆیە مەحوی سەرسەختانە پەیوەست بووە بەم
چەمکانەوە ، سەرەتا و کۆتایی نیە ئەم پیاوە ، واتا نازانین
لە چ چرکە ساتێك دا ئیشی لەسەر ئەو چەمکە فەلسەفی و





مەعریفیانە کردووە ، بەڵام داتا و فیلدی ئەو تەنها ئەوەیە کە
هەیە ، پیاوێك لێوانلێو لە مەعننەویەت و ڕۆحانیەت ،
پیاوێك بریتیە لە ((مەعریفە))، مەولانای دووهەم ، دوڕو
یاقووت ، پیاوێك خوداناس ، لەگەڵ ئەوەش دا دونیا ناس ،
خوداناسێکی دونیا ناس و دونیاناسێکی خودایی، لێرەوە
ئەم تێزەیە دەرگایەکمان بۆ دەخاتە سەر پشت ، ئەویش
دەرگای چوونە نێو دونیای فەلسەفەی مەعنەویەت ،
دەکرێت کە بڵێین فەلسەفەی مەعنەویەت ، چونکە
مەعنەویەت لە ئێستا دا پشکی شێری هەیە لە دونیا
فەیلەسوفە دینیەکان دا، ئەویش بە هۆی قبوڵکردنی
پلورالیزمی دینیەوە لە لایەن هەر فەیلەسوفێکی دینیەوە ،
کە لیبرالێکی سوننەتی و لیبرالێکی ئەخلاقی بێت، چونکە
هەموو فەیلەسوفە دینیەکان لیبراڵ نین بە مانای کەلیمە ،
ئەوە نیە سروش ڕەخنەی لیبرالیزمی ئەوروپی دەکات !
هەڵبەت بەڕیز سروش هەر بڕوای بە شتێك نیە کە ناوی
لیبڕالیزمی جیهانی خۆرئاوا بێت ، مەبەستم لە لیبرالیزمی
دونیای مەدەنیەکانە ، ئینسانە فەیلەسوفەکانیش بەشێکن
کە زیاتر تێکەڵاوی ئەو دونیا مەدەنیەن ، بۆیە من زیاتر
ئەوەم وروژاند تا زیاتر تێبگەین هەموو ،مەعنەویەت لەلای
مەحوی وەکو وتمان بە ئاشکرا هەست پێ دەکرێت ، بەڵام لە

لای نالی بە هیچ جۆرێك من ئەم هەستە ناكەم وەك ئەوەی كە لەلای مەحوی ئەو هەستەم بۆ دروست دەبێت ، دواجار وەكو ئەزموون زیاتر مەحووی ئەزموونی هەستی و ئەزموونی ئایینی هەیە، بەگوتەی جۆن هیك خاوەنی ئەو هەستەیە ، وە مەحوی بە قورسی ئیشی لەسەر فەلسەفەیەكی ئایینی ئسوڵی لەبەرگی لیبرالی داكردووە ، من لەو جێگەو قۆناغەوە لە نوسینی ئەم بابەتە بەردەوام دەبم ، یەكێك لە گرنگترین ئەو شتانەی بە ئێمەوە پەیوەستە ئەوەیە كە ئێمە بەشێكین( fragment)،لە گشتێكی زۆر گەورەتر وە فراوانتر ، وە هەر تەواوكاریەكی شیاو بۆ پێرفێكت كردنی ئەو شتانە كە (گشت) ن ،لە تەواوكاریەكی تاكانەیی خۆی نابینێتەوە ، بەڵكو كاتێك ئەو تەواوكاریە بەرجەستە دەبێت كە ئێمە بچینە پەیوەندیەكی ڕاستەوخۆوە لەگەڵ باقی گشتەكان دا ، مەحویش بڕوای هەر ئەمەیە ، ئەو پێ ی وایە كە لە ڕووی فیزیكیەوە ئێمە بریتین لە پنت و خاڵی ژێر گەردوون ، وە ڕەنگە ئەوەش نەبین و بچوكتریش بین ، وە پێ ی وایە (personality) وەكو كەسایەتی ، ئێمە ناتەواو و نا كاملین ، وە ڕەنگە نیو كاملیش نەبین ، ئەویش لەبەر ئەوەی كە هەمیشە پێویستیمان بە یارمەتی ئەوانی تر هەیە ، ئەمە تێگەیشتنی مەحویە بۆ چەمكێكی گشتگیر كە مردن و ژیان





و مرۆڤ پێكەوە كۆ دەكاتەوە ، وە بەمەش دێت قسە لەسەر فەلەسەفەی دینی دەكات و ئەزموونی هەستی و دینی خۆی دەخاتە پێش چاو ، ئەو هێندە قوڵ دەڕوات تەنانەت لە هێندێك وێستگەدا دەگاتە ئاستی فەیلەسوفێكی تەواو ، هەندێ جاریش وەكو مێژوو نووسێك بەرچاو دەكەوێت و هەندێ جاری تریش وەكو شتێكی تر ، هەڵبەت هەر یەك لە فەیلەسوف و بیریاری وەك : ڕاسل و ویتگنشتایین و مۆر و ئەنسێلم و گادامبێر ، تەنانەت پۆپەر وە هارتشۆرن و هیوم و كانتیش ئەوانەن كە وێنای فەلسەفەیەكیان تا ڕادەیەك كێشاوە كە فەلسەفەی دینە ، ئەویش سەرەتا بۆ پرسیاركردن لە پنتە جەوهەریەكانی دین و دواتر خوێندنەوە بۆ تێكستە دینیەكان ، بەڵام بۆ ئەوەی بمانەوێت لە ڕووی (فەلسەفەی دینی و مەعریفەی دینی ) لە نێو تێكستەكانی نالی دا قوڵ بچین ، ناتوانین و زۆر ئەستەمە ، ڕاستە نالی بڕوای بە ئەرگیومێنتی ئاینی هەبووە و شیعریشی هەیە لەو بارەوە ، بەڵام قەناعەتی تەنها بەیەك جۆر ئەرگیومێنت هێناوە ، ئەویش ئەرگیومێنتی (تەقلیدی ئایینی یە ) ، كە ئەمە وا دەكات ئێمە نەتوانین ڕۆبچین بە نێو تێكستەكانیا ، چونكە ئەو شیعری لەچەند سیاقێكی دیاریكراو دا نوسیوە ، دڵداریەكی سەرزەمینی سەختگەرا ،

**دیندارێکی تەقلیدی ئەنتی مەعریفەتگەرا ، کەسێکی لە خۆ بردوو ، ئەمە ئەو سیاقانەن کە نالی ئیشی تیا کردوون ، وە ئەگەر لەبارەی ئاڵۆزی و نا ڕۆشنی یەوە بدوێین ، زیاتر مەحوی ئاڵۆزتر وە ناڕۆشنترە ، چونکە مەحوی گوتاری گەردوونی (ambiguit) پێ یە و لە دیوە ئایینییەکەیدا بە میتۆدی تەحقیق ئەرگیومێنتی لە لا هەیە نەك بە میتۆدی تەقلیدی ، وە نالی زیاتر لە خەڵك بێ زار بووە و غەمێکی واقیعگەرایی هەبوە ، بەڵام لە لای مەحوی ئەم هاوکێشەیە تەواو پیچەوانەیە ، مەحوی لەو کەسانەی کە غەمی واقیعگەرایی نیە ، لەوانیە کە غەمێکی وجوودی و بوونگەرایی هەیە ، واتا غەمی مەحوی لە بوونبەوە تا نەبوونی هەر هەبووە و هەر دەبێتیش، چونکە مەحوی هیچکات بە واقیع خۆشی نایەت ، تا ئەوەی بڕوای بەوە نیە کە شتێك هەبێت ناوی واقیع بێت ، ئەوەیشمان ڕوونکردەوە لە سەرەوە کە مەحوی بۆ ئیشی لەسەر فەلسەفەی دین کردووە ، فەلسەفەی دین واتا ڕۆحی دین و جەوهەری دین ، هەربۆیە مەحویش ئەوەی هەڵبژاردووە ، دواجار کێ دەڵێت فەلسەفەی ئایین وەك فەلسەفەی یاسا و زەین و ئەخلاق وایە ، پێم وایە فەلسەفەی ئایین ڕاهێنانێکی (ئیکسەرسایس) انە نیە ، بەڵکو بان–ڕاهێنان (مێتا – ئیکسەر سایس)ە ، واتا**





**فەلسەفەی ئایین هەربەتەنها موڵکی ئەوانە نیە کە دیندارن ، بەڵکو موڵکی ئەوانەشە کە دینیان نیە ، ئەوەیشم لەبەر ئەوە خستە ڕوو تا بەهەڵە دا نەچین لەوەی کە فەلسەفەی ئایین مەحوی دەتوانێ لێیبکۆڵێتەوە چونکە توانای مومارەسەی دینی هەیە و نالی ناتوانێت چونکە کەسێکی تەقلیدیە ، ئەوە ڕاستە ، بەڵام ئەگەر نالی بڕوای بە پنتی تەقلیدیەت نەبێت ، ئەوا ئەویش دەتوانێت لە فەلسەفەی دیندا دەست باڵا بێت ، تا ئەوکاتەی نالی بێ دینش بێت ، مەحوییش بە هەمانشێوە کە وازی لە تەقلیدیەت هێنا و ڕووی کردە تەحقیقیەت ئیدی دەتوانێت ببێ بە بەشێك لەو فەلسەفەیە و فەلسەفەیش ببێت بەبەشێك لەو ، مەبەستم لەبەشێك لە گشت ی ئەو فەلسەفەیەیە .**

سەرچاوەکان :

(١)رازدانی و روشنفکری دینداری /عبدالکریم سروش/مجموعه معرفت شناسی/تهران/مؤسسه فرهنگی سراط/١٣٧٧،چاپ سوم/ص ٢٤

(٢)ه.س.ل /٣٤ – ٣٤





(٣)دیوانی مەحوی/عبدالکریم مودەڕڕیس/انتشارات کوردستان/١٣٧٩/ل ٣٠٧

(٤) ه . س . ل

(٥)دیوانی نالی /عبدالکریم مودەرریس/١٣٧٩/اتشارات کوردستان/چاپ : دوم /ل ٣١٧

(٦) ه . س . ل

(٧) ه. س . ل ٣١٨

(٨)أخلاق خدایان :عبدالکریم سروش/تهران/انتشارات گرح نو/١٣٨٢/ص٧٧

(٩)فردالدین محمد عطار نیشاپوری/غزلیات ، ترجیعات ،قصائد،ترکیبات/ەو : ١٢١

(١٠)هەژان ،گۆڤار/ژ: ١٩ /ل٢٧/پێگەی شەریعەت لە قەڵەمڕەوی عیرفان دا/یەحیا یسریبی/و: بیلال باسام

(١١)هەژان،گۆڤار/ هەمان ژمارە ، تەحسین حەمە غەریب دەروازەیەك بۆ ناساندنی فەلسەفەی دین

(١٢)دیوان نالی /ه . س .ل ١٠٨

() ه.س. ل ١٠٩

(١٤) ) ه.س. ل ٦٠٣

(١٥) ه.س. ل ٦٠٣

(١٦) ه.س. ل٣٩٠–٣٩٥

(١٧)حكمت و معيشت / د.عبدالكريم سروش/سراگ

(١٨)فلسفەو عرفان/ د.يحى يثريبى

(١٩)ڕۆحی دینداری ، فەلسەفەی دین/مودریك عەلی عارف /هەژان:١٩،ل٣٥٣

# چیەتی مەرگ

# خوێندنەوەیەك بۆ چەمكی مردن

**مردن واتا ساتە وەختی لە ناوچوون یان نەمان و سڕینەوەی ژیان،جا ژیانی هەموو ڕۆح لە بەرێك ،بەو مانایەی كە هەر ڕۆح لەبەرێك دەبێت دواجار ڕۆح بسپێرێتەوە بە مردن، بەڵامەكیَ دەبێت ئەوەشمان لە بیر نەچێت كە مردن خۆی لە خۆی دا قۆناغێكە لە قۆناغەكانی ژیان،بەڵام كام قۆناغ، قۆناغێك كە بریتیە لە قۆناغی تەواو كردنی قۆناغەكانی تری**





**ژیان كە بوونیان هەبووە پێش هاتنە پێشی ئەم قۆناغە ، ئەوەی گرنگە ئەم قۆناغە بە جۆرێك لە جۆرەكان بریتیە لە ئەنتی ژیان،یان ڕوون تر بڵێین ڕووی ئەو دیوی ژیان بەڵام پێچەوانەی ژیاناندنی مرۆڤەكان ،خاڵێكی گرنگ لە مردن دا ئەوەیە كە مردن تەواو پێچەوانەی ژیانە ،چونكێكم مردن تەنێكی گەردوونی نیە ،لەبەرئەوەی مردن لە خودی مرۆڤەكان دا بەرجەستە دەبێت،نەك بە پێچەوانەوە كە مرۆڤەكان لە مردن دا بەرجەستە بن،تا مردن نەیەت ئینسانەكان نامرن و لە ژیان كردنیان هەر بەردەوامن ،بەڵام كاتێك كە مەرگ هات، ئیدی مرۆڤەكە و تەواوی ژیانیشی دەبێت تەسلیمی مردن ببێت، وە ئەوەی دەبێت قسەی لەسەر بكەم ئەوەیە كە دواجار هەموو مرۆڤەكان مەحكومن بە مردن ،تەنانەت فەرمان ڕەوا و فەرمان ڕەواییكراوەكان و مرۆڤە لیبراڵەكانیش مەحكومن بە مەرگ،واتا دوا چارەنووسی ژیان بە بەردا كراوەكان مردنی ئەو ژیانە یە كە لە پشت دیوی مردنە چاوەڕوان كراو و چاوەڕوان نەكراوەكان دا وجوودی خۆی هەیە،گرنگی مردن بۆ مرۆڤ یان ڕۆحلەبەرێك زیاتر یان زۆرترە وەك لەوەی كە بۆ بابەتێكی مادی بیَ گیان گرنگی هەبێت ،چونكێكم ئەوە مردنە كە لێناگەڕێت شیعرەكانمان تەواو بكەین ، ئەوە**

مردنە كە لێناگەڕێت مرۆڤێك نیازی كوشتنی ئەوی دی بەێنێتە جیٚ ،ئەو مەرگە كە ناهێڵت چاكەیەكی دی یان خراپەیەكی دی ئەنجام بدەین،واتە مردن حاڵەتێكە لە بەردەم ڕێگرتن ئەنجام دانی دواهەمین بە پرۆسێس كردنی باشەیەك یان خراپەیەك،بە مانایەكی دی ڕێگرە لە پێش بكەرەكان بۆ كردارگەلێك كە دەبێت بیكەن ،مەرگ وا دەكات كە ئەو كردارگەلە دەشێت نەكرێن ،مردن بەربەستە لەبەردەم پێگەیشتن و نشونوما كردنی چاكەكانی ئینسان و خراپیەكانی،لە هەر جێگایەكی دونیا دا ژیان بەبەرداكراوێك ببینن هەر بەم چەشنەیە،لێرەوە مەرگ مرۆڤەكان ئاوارە دەكات،بەڵام ئاوارەییەك بۆ ئەو دیوی دونیای نێو زەوی ، ئەشێت مردن دەربەدەر كردنی مرۆڤ بێت لە دونیا ،هەر بەشێوەی وە دەرنانی مرۆڤ لە نێو دونیا گەورەو فراوانەكە كە كۆی دونیا دەگرێتەوە ،ئاوارەگی مرۆڤ لە دونیا تەواو جودایە لە ئاوارەیی مرۆڤ لە نیشتیمان،واتا ئاواریی دونیای گەردونی جیاوازە لە ئاوارەیی دونیای زێدێك یان نیشتیمانێك،چونكێكم ئاوارەیی لە نیشتیمان ئەگەری تێدا هەیە بۆ گەڕانەوەی تێدا هەیە ،بەڵام هەرچی ئاوارەگی یە لە كۆی دونیا و دونیای نیشتیمانیش ئەوا گەڕانەوە بۆی نەكراوە و ئەستەمە،واتا ئاوارە بوون لە نیشتیمان





جاویدانی و هەمیشەگی نیە، بەڵام ئاوارە بوون لە كۆی دونیا تا هەمیشەیە ،جۆرێك لە سنوراندن لە سەرگەردانی یان ئاوارەیی لە نیشتیمان بە دی دەكرێت ، بەڵام بۆ سەرگەردان بوون لە دونیا گشتاندنێكی مرۆیی یە بە بیٚ جیاوازی و نەگەڕانەوەش بۆ مرۆڤەكان ،وە ڕەنگیشە مردن خۆی ساتە وەختی ڕزگار بوون بێت لە دەست ئاوارەیی و سەرگەردانی مرۆڤەكان لە نێو دونیا دا ،واتە ڕەنگە دونیا خۆی بریتی بێت لە شوێنێك بۆ نەفی كردنی ئینسانەكان ،بۆ نمونە مەولانا مەحوی ئەفەرموێت :

بەجیٚ ماوم لە یاران، نا بەجیٚ ماوم، ئەجەل زوو بە
بە مردن لەم قسوری ژینە، ئیستیعفا نەكەم چی بكەم ؟

ئەم تێڕوانینەی مەولانا مەحوی جۆرێكە لە خۆ خستنە نێو پرۆسەی خواستنی هیوا بە مردنەوە ،ئەمەش تا ببێتە هۆی ڕزگاری بوون لە دەست ئاوارەیی دونیا و سەرگەردانی مرۆڤەكان لە دونیا ،لەم شیعرەوە دونیا كۆمپانیای دروستكردنی مرۆڤی ئاوارەیە ، واتا دونیا كارگەیەكە بۆ دروست كردنی مرۆڤی بیٚ ئومێد و گوماناوی كە دواجار دەبێتە دروستكەری مرۆڤی ئاوارە ،بە قەولی خۆی :

دنیا همه هیچ است ،ولی هیچ تر از وی
ماییم که در باختەایم این با همه هیچ

خۆی لە ڕاستیدا کۆی دونیا واتا مرۆڤەکانیش ،ئەو مرۆڤانەی کە هەمان چارەنوسی یەکتریان هەیە ، ئەو چارەنوسەی کە ناوی (مەرگ) ە ،جیهانی مرۆڤەکان تێکەڵەیەکە لە ژین و مەرگ ،بە مانایەکی دی دیوی پشت دونیای مرۆڤەکان واتا ئەو دونیایەی کە مرۆڤەکان تێیدا دەژین بریتیە لە مردن،ئەگەر بێت و فەزا فراوان و گشتیەکەی مرۆڤ دوو ڕوو بێت ،ئەوا ئەو دوو ڕووە بریتیە لە مردن و ژیان،یان مردن و نەمردن ،مردن وەکو مانایەك بۆ دژی نەمردن وهەروەها دروستی لە مانا پێچەوانەکەشی بە هەمان جۆر ئامادەیە،لە ڕاستیدا مردن و نەمردن دوو ناو یان دوو چەمکن بۆ دوو پرۆسە ، بەڵام دوو پرۆسەی ڕۆحی جیاواز و وەکو دوو جەمسەری جیاوازیش ،کە پێم وابێت مرۆڤی ئێمەش (مرۆڤی کورد)وەکو هەموو مرۆڤەکانی تری ئەم سەر زەمینە ئەو دوو چەمکەیان بەکار هێناوە یان ناوی ئەم دوو پرۆسەیان ناوە ،ئەمیش بۆ جیاکەردنەوەیان لە یەکتری، واتا بەکارهێنانیان وەکو میکانیزمی جیاکاری.





دەکرێت ئێمە لە ستراکتۆری شاردراوەی نێو دونیا زەمینیەکەی خۆمان حاڵی ببین، بۆ ئەوەی توشی هەڵەی فیکری و فەلسەفی نەیەین ،تەنها تێگەیشتن لەو کۆنسێپتە ئاڵۆزەی کە بریتیە لە مەرگ ، خۆی لە خۆی دا تێگەیشتنە لە دونیاش ،یان بە دیوێکی تردا ڕەنگە تێگەیشتن لە دونیا بۆ خۆی تێگەیشتن بێت لە مردن ، واتا تێگەیشتن لە دونیا دەبێتە هۆیەك بۆ تێگەیشتن لە دیوەکەی تری دونیا کە مردنە ،نمونەش بۆ ئەم تێڕوانینە تیۆریەیان مەولانا مەحویە کە لە شوێنێکدا دەڵێت :

تێگەیو شیوەنیە ئەمڕۆ دا سبەی شایی بکا
پێگەیو دەروێشە ،دا سوبحەی شەهەنشایی بکا

یان :

لە مانمدا نەدیوە حاصڵی غەیری تەوەحوش ، من
خودا پێداو ، ئەوانەی لەم وحوشستانە زو ڕۆیین

لە لای مەولانا مەحوی مەبەست لە وحوشستان دونیا خۆیەتی،وە مان و نەمان، یان مردن و نەمردن لە لای ئەم

**پیاوە گرنگ نیە یان تەنها تیاچون نیە، چونکێکم ئەوەی گرنگە لە لای ئەم تەنها گەیشتنە بە مەعشوق !**

**بێ چوونە عەدەم ، پەی بە سۆراغی دەمی نابەی**
**فایز ببە بەم گەوهەرە لەو بەحرە بە ڕۆچوون**

**مەرگ هیچ کات شەرمی لە ڕیشی سپی عاریفان نەکردوە ، وە شتێك نیە بە نێوی ئینتیمای مەرگ ،چونکێ دواجار هەموو یەك چارەنوسمان هەیە،وە هەروەها نەشترساوە لە پیاوە گەورە و دەسەڵات دارەکانی دونیا، وە بەزەییشی بە هەژاران و نەداران دا نەهاتۆتەوە ، مەرگ تەنها پێمان دەڵێت : کات تەواو و خۆت بپێچەوە .**
**لەوەتەی مرۆڤێك مرد ئیتر دونیا هەروەها هاتۆتە پێش و پێشوتریش هەروا بوە،بۆ نمونە مردنی مەولانای ڕۆمی و مەلانا مەحوی ، هەروەها مردنی کیسرا و قەیسەر ، وە مردنی مۆزارت و ڤان کوخ ، وە سبەینێ من و ئێوەش هەروا،وە لە گیان لە بەرانیش ، مردن و لە ناو چوونی دیناسۆرەکان دەزانین ،بەڵامەکێ پرسیارێکی گرنگ دێتە پێش ، کە ئەویش ئایا جۆری مردنی گیانلەبەرانی جیاواز**





**لە مرۆڤ هەمان جۆری مردن و گیان کێشانی مرۆڤەکانە ؟یاخود ئایا ئەو دونیایەی کە گیانەوەران پێیدا گوزەر دەکەن هەمان ئەو دونیایەیە کە ئێمەی مرۆڤ تێیداین، لێرە دا مەبەستی من دونیای ڕۆحە ،دەکرێت بڵێین دونیای پشت ئەو دونیا مرۆیی و گیانەوەریەی کە ئێستای هەردوو لامان پێ تەی تەکات نزیکن لە یەکدیەوە لە ڕوی :**

**یەکەم : هەردوو لا هاوبەشین لەوەی کە پێکەوە ژیانمان هەیە .**
**دوهەم : هەردوو لا هاوبەشین لەوەی کە دواجار دەبێت تەسلیمکەرەوەی ئەو ڕۆحە ببین .**

**ئێوە دەبێت ئەوە بزانن کە ئەگەر مرۆڤ لە نا مرۆڤ جودا بکەینەوە، ئەوا کۆمەڵێك پێوەر هەیە،ئەو پێوەرانەش بریتین لە ڕەوشت و مرۆڤدۆستی و بەرپرسیارێتی و دین داری و ماف و عەقڵ و هەروەها کۆمەڵێك پێوەری تریش هەن بۆ جیا کردنەوەی مرۆڤ لە تەنەکانی تر ،بەڵام پێوەرێك کە بریتیە لە ڕێز گرتن لە مرۆڤ، ئەویش پێوەری مرۆڤ بوون وەکو مرۆڤ، واتا بە جیا کردنەوەی لە ڕۆحلەبەرانی تر ، بۆ**

نمونه بۆ جیا کردنەوەی مرۆڤ لە ئاژەڵ ، بەو مانایەی هەر تەنێکی ڕۆحی بریتیە لە مرۆڤ وەکو جەستە ،ئەوا ئەو تەنە مرۆڤە و جودایە لە ئاژەڵ،ئەم بڕوایە نەچۆتە نێو جومگە ناوەکیەکانی ئینسانەوە ،تەنها ئیشی کردوە لە سەر دەرەوی مرۆڤ کە ئەویش لەش ە ،بەڵام ئەم قوتابخانەیە ئەوەی لە بیر چوە کە ئاژەڵەکانیش وەکو مرۆڤ دەژین و هەروەها وەکو مرۆڤ دەمرن ، بەڵام لە پێناو مردنی بەشێك لە مرۆڤەکان جیاوازە لە پێناو مردنی کۆی ئاژەڵەکان ،چونکێکم بەشێك لە مرۆڤەکان کە عاریفەکان لەو بەشەن خۆزگە خواستن بە مردن تێیان بە دی دەکرێت، واتا خۆزگە خواستن بە مردن لە پێناو گەیشتن بە نەمری و حەیاتی جاویدانی ،بۆ نمونە شێخی  سەعدی گەورە دەفەرموێت :

چنان به پای تو در مردن ،ارزومندم
که زندگانی خویشم ،چنان هوس نکند(٢)

لە ڕاستیدا ناخۆشی بینین لە ژیان و خۆش نەژیان دەبێتە هۆیەك بۆ ئاوات خواستن بە مردن و خۆشویستنی مەرگ،هۆیەك بونی گوزەراندنی ژیان بۆ خۆشەویستی مردن ،ڕێگایەکە بۆ دۆزینەوە ەێزێك کە ئامادەیی هەیە لە دیوی





پشت مردنەوە ،واتا گەشبین بوون بە دونیایەکی دی کە دواجار مرۆڤ ئاسودەگی دێتە ڕیگا، وە ئەوەشی گرنگە بۆئەو جۆرە لە مرۆڤانە ئەوەیە کە ئەم مرۆڤە ئەبێت خۆی نەبەستێتەوە بە دونیا زەمینیەکەی ،شوێنهاوەر لە شوێنێکدا گوتبوی سەفەر کردنی ئینسانەکان بێهودەیە، چونکە دواجار هەر لە ژێر ئەم ئاسمانە دان .
ڕزگار بوون لە ژێر ئەم ئاسمانە ئاسانە ، بەڵام بۆ ڕزگار بوون لە دروست بوونی دونیای دوای هەبوونی ئەو ئاسمانە ئەمە خۆی تا ڕادەیەك ئەستەمە، چونکێکم ئینسانەکان هەمیشە لە دۆخێکی زۆر ئاڵۆز دا ژیاون و نەیانزانیوە کە پشت لە کێ و لە کۆێ بکەن و روو لە کێ و لە کوێ بکەن، بۆ ئەمە بەشێك کە عاریفانن ، جا عاریفێکی مەسیحی یان یەهودی یان ئیسلام بگریت  ڕویان لە خودا کردوە و خودایان بە مەبەست گرتوە، بۆ نمونە مەحوی گەورە دەفەرموێت :

لە خۆم و لەو کەسە خۆشم دەوێت و خۆشی دەوێم
خودایە  خۆشببی و تۆ ببی خودایە خۆش

یان :

**چ خۆشە بەم هەموو عیسیانەوە یا ڕەبی بم بەخشی**
**ببەخشە  بگرە دۆزەخ خۆڵەمێشی کەم بوو یەك میسقال**

**پەیوەندی نێوان ئینسان و ترس یاخود ئینسان و عیرفان بریتیە لە مردن ،هەمیشە مرۆڤە جوانەکان و عاریفەکان ویستویانە عەدالەت و دادپەروەری پیادەبکەن ،چاکە بکەن و خۆشەویستی و موحیببەت بنوێنن ، ئەڵبەتە ئەم جۆرە مرۆڤانە لە پلەکانی خوارەوەی مەعنەویەتدا لەگەڵ کەسانی تر لەسەر بنەمای عەدالەت و دادپەروەری مامەڵە دەکەن،بەڵام کاتێك پلەو مەعنەویەکانیان چوونەسەرەوە ،کاریان سەر دەکێشت بۆ ئیحسان و چاکەکاری و لە قۆناغی سێهەمیشدا دەگات بە موحیببەت و خۆشەویستی ،هەر بۆیە پەنا گرتنە بەر خودا کە عەدالەت و چاکە و موحیببەت لەوەوە بەدی دەکەن ، چونکە مرۆڤ ناتوانێت بۆ هەتا هەتایە دەبڵ میزاجی بێت لە گەڵ خۆیدا،بۆیە هەڵبژاردنی ڕێگای خۆشویستنی مەرگ ی عاریفان بیَ حیکمەت نیە ،چونکە عاریفان دوای بە جیَ هێنانی ئادابی خلوس لە موحیببەتدا ، دەقاو دەق هەنگاو بەرەو عیشقی مەجازی و دواجار هەنگاو بەرەو عیشقی حەقیقی دەنێن و تێیدا ون دەبن و بەیەکجاری**





**خۆیان بەو عیشقە دەبەستنەوە ، ئێوە ببینن و بزانن کە مەولانای ڕۆمی ئەفەرموێت چی ؟**

**اگر همه عالم همه پر خار باشد**
**دل عاشق همه گلزار باشد**
**وگر بی کار گردد چرخ گردون**
**جهان عاشقان برکار باشد**
**همه غمگین شوند و جان عاشق**
**لطیف و خرم و عیار باشد**
**(کلیات / ٦٦٢)(٤)**

**خاڵێك هەیە کە دەکرێت لێرە دا بیخەمە پێش چاو، ئەویش ئەوەیە کە مردن ئالیەتی نیە ،چونکە مردن ڕەنگە خۆی ئالیەتی لە ناو بردنی ژیان بێت ،لە ڕستیدا بۆ لە ژیان مانەوە پێویست بوون هەیە بە ئالیەت، بۆ نمونە وەکو ئۆکسجین و ئاو و خۆراك ،بەڵام ئەو وەسیلانەش تا کۆتایی یاریەکە نین، واتا تا هەتاهەتایە نا شێن بۆ مانەوە ژیان ،ئەتوانین بڵێین هەم ژیان بەرەەم هەێنەری مردنە،هەم مردن بەرهەمەهێنەری ژیانە ،چونکی ئەگەر ژیان وەکو وجوود**

نەبوایە ،ئەوا شتێك نەدەبوو بە نێوی مردنەوە، ئەوە ژیانە کە دواجار مردنیش بە دوای خۆی دا دەهێنێت ،ئەگەر شتێك نەبێت بە نێوی ژیانبەبەرداکراو ، ئەوا مردن هیچ ڕۆڵ و وەزیفەیەکی نیە لەم جۆرە دۆخەدا،وە هەروەها ئەگەر مردن نەبوایە ، ئەوا تەفسیر نەدەبوو بۆ مانا قوڵەکانی ژیان، ڕەهەندە جیاجیاکانی ژیانمان بۆ نەدەخوێندرایەوە ،لی ڕوە جیاوازەکانی ژیان حاڵی نەدەبوین، بۆیە دەکرێت ژیان و مردن هەردووك پێکەوە بەرهەمهێنەری یەکدی بن،لە ڕاستیدا وەکو چۆن عاریفێك لە مردن بیٚ باکە ، بە هەمان شێوەش فەیلەسوف و شاعیرەکانیش هەروا بیٚ باکن لە مردن، بەدر شاکر سەیاب لە سەرە مەرگ دا بوو ، بە خێزانەکەی وت : من ئەگەر ئێستاش بمەوێت نەمرم ، دوا جار هەر ئەبێت بمرم، بۆیە ئامۆژگاری خێزانەکەی و کوڕەکەی کرد کە بە تەنگ هەژارانەوە بێن و یارمەتیدەریان بن و ئینسانیانە هەڵسوکەوت بنوێنن، وە هەروەها هایدگەری بیریار لە دواساتی سەرەمەگیدا بوو بە ئاسپایی لە ژێر لێوەوە وتی (سوپاس) و مرد .





## دیدگای مەحوی بۆ مردن و دونیای دوای مردن :

هەروەکو وتمان فەیلەسوفە بونگەراکان بایەخێکی زۆریان بە بابەتی مردن داوە ، وە زۆریش لیٚ دەدوێن تا ئێستاشی پێوە بێت ، لە بوونی ڕاستەقینە دا مردن یەکێکە لە تواناو ئیمکانەتیکانی بوون و هەردەم پابەندی دەکات ، واتا مرۆڤ دەکەوێتە سەر تایبەتیترین توانای بوونی خۆیی و هیچ پەیوەندیەکی بە دازاین و مەجوودەکانی تری خۆیەوە نامێنێت ، واتا مردن توانانی نەمانی گشت توانا و ئیمکانیەتێکە لە کەسە کە دا و لە مردن دا هیچ پەیوەندیەك لەگەڵ دەرەوە دا نامێنێت و تایبەتە بەکەسەکە خۆیی و ڕەسەنترین توانای دازاینە ، چونکە ئەگەر مرۆڤ لە بوونی ڕۆژانەی یان ساختەی دا بتوانێت لە شێوەی بوونەکانی تر دا دەربکەوێت و تواناو ئیمکانەکانی ئەوان بێنە ناو ئەم و تەحقیقیان بکات، ئەوا لە مردن دا بە هیچ شێوەیەك ناتوانێت ئەمە بکات ، چونکە مردنی تەنها تایبەتە بە خۆیی و تەنها خۆی دەمرێت (٥)، نە دەتوانیٚ لە جیاتی کەس بمرێت، نەکەسیش دەتوانیٚ لە جیاتی بمرێت ، وە ئەم

مردنە وەکو توانایەك هەر لە لەدایکبوونیەوە لەگەڵیدا هەیە و کەسەکە چاوەڕوانی ئەوە بووە یاخود هەستی کردووە ، ڕۆژێك لە ڕۆژان ئەم توانایە دێتە دی ، بۆیە کەسەکە ترسی لە مردن نیە و لیَ ی ڕاناکات و وەکو هەر توانایەك لە تواناکانی خۆی تەماشای دەکات (٦). بەڵام لە بوونی ساختە دا مردن وەك وەك توانایەکی ڕاستەقینەیی بوونی مرۆڤ تەماشا ناکرێت ، ئەویش بەهۆی ئەوەی کە ئەم بوونە خۆی لە خی دا نا ڕاستەقینەیە و بریتیە لە ساختە ، بەڵکو وەکو ڕوداوێك تەماشا دەکرێت کە هەموو ساتێك و هەموو ڕۆژێك ڕوو دەدات و بەسەر کەسەکان دا دێت ، بۆیە نە دەبیَ سەرنجمان ڕابکێشێت و نە بەخۆیەوە سەرقاڵمان بکات ، هەروەکو چۆن کە نابێت کارەکانمان ڕابگرێتو لە هەوڵدانمان بۆ شتەکان پەك بخات ، بوونی تواوە لەخەڵك دا هەروەکو خەڵك دەڕوانێتە مردن و خەڵکیش بەوە لە بایەخی مردن کەم دەکەنەوە کە لە داهاتودا بەرەو ڕویان دەبێتەوە ، بۆیە لە لای ئەوان لە ئێستا دا هیچ جێگەی بایەخ و مەبەستێك نیە و ئەویش لەبەر ئەوەی هەر هیچ نەبێت ئەم جارە ئەوانی نەگرتۆتەوە ، وە هەموو کەسێکیش دەبێت بمرێت ، ئەمە بە پیَ ی تیوریزەی هایدگەر ، کاتێکیش خەڵك ئاوا سەیری مردن دەکەن و لەبارەیەوە دەدوێن ، ئەوا حەقیقەتی مردنیان





لیَ تێکدەچێت و لای ئەوان مردن بۆخۆی شتێکی دیاریکراو نیە ، واتا خاوەنی چوارچێوەی خۆی نیە ، بەڵکو ڕوداوێکە لە کاتێکی نادیار و شوێنێکی نادیارەوە دێت و یەخەمان دەگرێت ، بەڵام ئێستا مردن جیَ ی مەترسی نیە ، تا کاتی خۆی دێت ، واتا هێشتا بەسەر ئێمە دا نەهاتووە و بەسەر کەسانی تر دا هاتووە ، ئەمە جگە لەوەی کە ڕوداوێکە دەبێت هەموو مرۆڤێك بگرێتەوە ، واتا مردن ئەوە نیە کە پێمان وابێت گروپێك دەگرێتەوە و ناچێت بەلای کەسێك یان گروپێکی ترەوە ، مردن دۆخێکی گشتگیریە ، بەڵام هەرچی ژیانە ، گشتگیری نیە ، چۆن ؟ لەبەر ئەوەی کیَ دەڵێت کیَ لە دایك دەبێت ؟ واتا دەشێت کیَ بڵێت ئەوەندە کەسەی تر لە دایك دەبن و دەژێن ؟ ئەمە ئەوە دەسەلمێنێت کە ژیان بۆ هەمووومان نیە و مردن بۆ هەمووومانە ، چونکە مردن ڕوداوێکە لە لای هەموو ئەوانەی کە دەژین یەقینیە ، واتا هەموو ئەوانەی کە دەژین بڕوایان وایە کە هەموو دەمرن ، من پەیوەندیم بە حاڵەتی جیاکاریەوە نیە وبەگشتی قسە لەسەر مەسەلەیەکی گشتگیرگەرا دەکەم، ئەو قسەیەی کە ئەوانە دەیکەن کە زۆرینەن دەربارەی مردن ، بریتیە لە ئەزموونی کەسانی تر کە بۆیان ماوەتەوە و ئەمانیش گومانیان نیە کە ئەوانیش دەبێت بمرن ، ئەم شتەیشیان لە

ژیان بیستوە و خۆیشیان بینیویانە کە مرۆڤەکان یەکەیەکە وا خەریکە دەمرن و پێش ئەمانیش چەندەها مرۆڤگەلی تر هەبوون کە لە ئێستا دا نەماون و مردوون، وە بە هەمان شێوە ئەمانیش دەمرن و نامێنن ، هەر لەمەوە مردن لە لای کۆهەستی مرۆڤەکان بوەتە ڕوداوێکی ڕاستەقینە و نا گوماناوی ، ڕوداوێك تەنانەت لە یەقینیش پلەیەك بەرزترە ، ئەویش پلەی (علم) ە ، واتا پلەی زانست هەبوون دەربارەی مردن و هەبوونی زانیار بە وەی کە مردن هەیە ،ئەم جۆرە تێڕوانینەش بۆ مردن حەقیقەتی مردن دەشارێتەوە و وەکو توانایەك تەماشای ناکات کە لە ناو خودی مرۆڤ دا بوونی هەیە ، یاخودی لە بوونی مرۆڤدایە ، بەڵکو ئەم وەکو ڕوداوێك تەماشای مردن دەکات کە لە دەرەوە و لە شوێنێکی نادیارەوە دێت و یەخەی مرۆڤ دەگرێت و کۆتایی بە ژیانی دهەێنێت .

مەحویش بەدەر لەوەی کە کوردە و عاریف و شاعیرە ، دەبێت سەرەتا وەکو خودێك – مرۆڤێك تەماشا بکرێت هەڵبەت خود کە کەسیش دەگرێتەوە، ئەو لایەنەی کە ئەرکی پارێزگاری کردنە لە جەستە ، ئەویش پارێزڤاری کردن هەم لە ڕوی ناوەوە، وە هەم لە ڕوی دەرەوە، پارێزگاری کردنی جەستە لە ڕووی ناوەوە ئەوەیە کە دەرگا بەڕووی بوونی





ڕاستەقینە دا بکاتەوە بۆ ئەوەی ڕاستەقینە بژیت ، وە بواری پێ دەدات کە بێتە ناو جەستەوە و بیکاتە نشینگەی خۆی یو تیایدا بەرجەستەبێت و بەدی بێت ، وە پارێزگاری کردنی جەستەیش لە ڕوی دەرەوە لەلای مەحوی بەوە دەبێت ئەو دەرگایەی جەستە کە بەڕووی دەرەوە دایە ، بگیرێت و نەهێڵێت بوونی درۆ و ساختە بێتە ناوە وە ، بەمەیش جەستەیەکی پاك ڕادەگرێت و دەیکاتە نشینگەیەکی ئامادە بۆ هاتن و بەرجەستە بوونی بوونی ڕاستەقینە ،بۆیە دەبێت بوترێت ئەم دوو دەرگایە ڕاستە هەردوویان دەرگان ، بەڵام ئەم دوو دەرگایەی جەستە هەرگیز لەیەك کاتتدا هەردوکیان پێکەوە ناکرێنەوە ، واتا داخستنی یەکێکیان و کردنەوەی یەکێکیانە ،واتا داخستنی دەرگای دەرەوە بە ڕووی بوونی ساختە دا ، دەرگای دەرەوە بریتیە لە چی ؟ دەرگای دەرەوە ئەو دەرگایەیە کە دونیای لێ دێتە ژورەوە ، هەڵبەت مەبەستم لە دونیا ، لە فەلسەفەی دونیایی تەقلیدگەرایی ، وە کردنەوەی دەرگای ناوەوەیە بە ڕووی جەستە دا ، بۆ ئەوەی کە ئیدی مرۆڤ مەعنەوی بژیت و ماددی نەژیت، ڕاستگۆ بژیت و درۆ نەژیت ، ئازاد و ئازا بژیت ،کۆیلە و ترسنۆك نەژیت ، لە ڕاستیدا ئەرکی مەحوی لێرەدا ئەوەیە کە بە ڕووی دەرەوە دا پارێزگاری لە جەستە بکات و

نەهێڵێت بوونی ساختە بێتە نێو جەستەوە و جەستەی ناوەوە لە ڕەسەنایەتی بخات، وە خۆی لە جێگای بوونە ڕەسەنەکە جەستەی ناوەوە بکاتە جیٚ نشینگەی خۆی ، وە دواجار بوونە ڕاستەقینەکەی خۆی لە دەست دەدات و توشی شکست دێت ، مەبەست لە شکست دەستنیشانکردێکی وجوودیە سەبارەت بەم تێزە وجوودیە ، هەڵبەت شکست بە نیسبەت فەلسەفەی بوونگەراییەوە واتا مردنی ڕۆح ، هەر بۆیە مەولانای ڕۆمی بە هەمووماں دەڵێت تکایە ڕۆحتان ئازاد بکەن ، وە مەحوی گەورەش بە فیعلی ئیشی لەسەر ئازادکردنی ڕۆحی کردوە ، مەحوی ویستویەتی ڕۆحی توشی شکست نەیەت ، چونکە شکست ئەوەیە کە مرۆڤ خۆی بەشتانێکەوە سەرقاڵ بکات کە پەیوەندی بەو جەستەیەی ناوەوە نەبێت ،مەحوی خودێکە کەویستویەتی ڕۆحی توشی شکست نەیەت، ئەم خودە خاوەنی جەستەیەکە کە شتێکی دیارو زیندووە، بەڵام ڕۆحی پەنهانە، وە هەر ئەو ڕۆحەشە هاتۆتە نێو ئەم جەستەیەوە و جەستەی کردووە بە ئامێرێکی کارا ، لە ڕاستیدا جەستە ئامێرە و هیچی تر، بەڵام هەر کات ئەو ڕۆحە تێکشکا، ئیدی ئەو ئامێرەش کە جەستەیە، هێدی هێدی خاپور دەبێت .





<u>سەرچاوەکانی ئەم لێکۆڵینەوەیە :</u>

١. دیوانی مەحوی /مەلا عبولکەریم مودەریس .١٩٨٤
٢. غزلیات سعدی در سایت /
TorbatJam.com
٣. کلیات دیوان شمس/انشارات نگاه
٤. اشکالیه التواصل في الفلسفه الغربیه المعاصره/عمر مەیبل/ص١٥٥
بوون لە شیعری مەحویدا/د.موحەمەد ئەمین/کوردۆلۆجی/٢٠٠٨/ل٣٤

# مەولانا مەحوی و خودا :

ئەوەندەی ئەهلی دنیان ئەهلی دنیا ، تاقە ڕۆژێ گەر
بە قەرنێ من ئەوەندە ئەهلی خودا بم دەبمە پێغەمبەر
چ کەس نابێ بە کەس دارن ، نیە لەو بەردەرە یارم
خودایا تۆ بکەی چارم ، کەسێکم بێ کەس و بێ دەر
(مەولانا مەحوی)





هەوڵدەدەین لە کۆی بابەتی شیعرە عیرفانیەکانی مەولانا مەحوی و تێگەیشتنەکانی بۆ کۆی چەمکە گشتگیرەگان ، ئەم لیکۆڵینەوەیەوە  تایبەت بکەین بە خودا ناسی لە لای مەولانا مەحوی و تێگەیشتنی ئەم پیاوە گەورەیە بۆ خودا، واتا چۆنیەتی و چیەتی خودا لە لای مەولانا و دواتر چۆنیەتی و چیەتی مەولانا لە لای خودا ،بەڵام سەرتا گرنگە کە بپرسین خوا کێ یە ؟یاخود چیەتی خوا، لەهەر بوونەوەرێك ی عاقڵ و خوێندەوار بپرسیت خوا کێ یە، بە تەعبیرەکەی جون هایك، دەڵێت خوا بریتیە لە بونێکی بێ کۆتا و بێ سنوور کە ئەم جیهانە و جیەانەکانی تری درووست کردووە ، ئەو کەسەیە کە پیاوانی ئاینی و خودا پەرستەکانی لێ دەپاڕێنەوە و نوێژی بۆ دەکەن، وە بە بڕوای ئەوان ئەو خودایە ی ئەوان خوای ئەوانەشە کە ناپپەرستن، بەڵام ئەوانە گوم ڕاە بوونە، وە هەروەها دەستیشی ئاوەڵایە لە کار و باری مرۆڤەکان دا و وەڵامی نزا و پاڕانەوە کانیان دەداتەوە ، بەڕای من ئەوە وێنایەکی ڕاستە کە جون هایك بۆ خودا دەیکات، وە لە ڕاستیدا لە دونیای ئیسلامیش دا کۆمەڵێك وێنای جوان و ناسك بۆ خودا دەکرێت و من ئەو وێنا جوانانە پەسند دەکەم دەربارەی کێ یەتی خودا و چۆنیەتی و چیەتی خودا ، کە هەڵبەت بە پێ ی ئامرازی

**شەرعی و فیقهی و باوەڕی دانراون ، وە ئەم تێڕوانینە لە لای بێ دینەکانیش atheists یش جێگیر بووە ، ئەمە کارێکی خراپ نیە ، وە بەهەمان شێوە لە لای باوەڕدار (مؤمن theist) یش هەر جێگیرە ، ئەمە ئەو خودایە یە کە لە لای خەڵکی جێگیر بووە و لە ناخەوە باوەڕیان پێ یەتی یان ڕەنگە بڕێك و هەندێکیشیان لێ ی دڵنیا نەبن و بە یەکسانی لە ناخی ئەو خەڵکانە نایەتە دەرێ و ئەویش وەکو نیچە دەڵێت مردنە، ئێمە لەم سۆنگەیەوە دەمانەوێت بچینە نێو دەمار و شانەکانی تێگەیشتن لە خوداوە و بە پێ ی مەعریفەی شەرعی و فەلسەفی و عیرفانی قسەی لە بارەوە بکەین ، دۆستان هەڵبەتە ئەمیش لە ڕێگەی تێکستە شیعریەکانی مەحوی ەوە دەتوانین پەی بەرین بەو بابەتە تا ڕادەیەك قوڵ و بە ئەستەم پەی پێ براوە دا، سەرەتا گرنگە کەمێك لە کۆنسێپتی خودا تێبگەین و دواجار پەیوەندی و ئیرتیباتەکانی خودا بە پارچەو بەشەکانی تری جیا لە خودا دەخەینە پێش چاو ، لە ڕاستیدا بۆ تێگەیشتن لە خودا وەکو زمانەوانی ، بڕوایەك هەیە کە پێ ی وایە ،وشەی خودا لە (خودان ) ەوە هاتوە ، کە بە مانای خاوەن دێت ، بە ڵام بە پێ ی ڕۆیشتنی زەمەن ئەم وشەیە (ان) ە کەی قرتاوە و وشەی (خودا) یە کەی ماوەتەوە ، وە ئێستاش هەندێك**





**کەس دەڵێن (خوا ) واتا قرتاندنی (أ) ەکە ،وە لایەنێکی تری تێگەیشتن بۆ خودا ، تێگەیشتی دین بۆ خودا ، واتا ناساندنی خودا لە ڕێگەی ئاینەوە ، ئاین دێت و خودامان پێ دەناسێنێت ، وە ئەوەی کە گرنگە باسیبکەین، ئەوەیە کە ئاینەکان هەمیشە خودایەکیان وێناکردوە جایاواز لە خودای ئاینەکانی تر ، بۆ نمونە ئەو خودایەی کە ئاینی جولەکە وێنای دەکات و دەیناسێنێت جیاوازە لەو خودایەی کە مەسیحیەت وێنای دەکات، وە بە هەمان شێوەیش ئەو خودایەی کە لە قورئان دەناسێنرێت جیاوازە لەو خودایەی کە لە ئینجیل و تەورات و هەروە ها جیاوازیشە لە خودا بینی بوزیەکان کە کتێبەکەیان ڤیدا یە،بۆیە سەرەتا گرنگە ئەو ئاینەی کە مەولانا مەحوی خودای لە ڕێگایەوە ناسیوە بیناسین و دواتر شۆڕ دەبینەوە نێو ڕەهەندە جیا جیا کانی خوداناسی ئەم عاریفەوە،چونکێ هەندێ کەس پێیان وایە مەولانا بە کتێبە بوزیەکان کاریگەر بوە و زیاتر ئاشنای لە گەڵ تەسەوف و فەلسەفەی هیندیەکان هەبوە ، لەبەرئەوە کەمێك ڕوونکردنەوە پێویستە تاکو نەکەوینە هەڵەی گەورەی مەعریفیەوە .**

**مەولانا مەحوی ئاینی ئیسلام نزیکترین ئاینی بوە وە دەتوانین بە عاریفێکی ئیسلامی ناویبەرین ، وە بەڵگەش بۆ ئەمە ، قەسیدەی بەحری (نور ) هەروەها (عقد العقائد) و (ستایشی خودا ) وە هەروەها قەسیدەی (پارانەوە لە خودا ) و کۆمەڵێك شیعری تریشی هەر دەربارەی خوداناسی ئیسلامی نوسیوە :**

**بۆ گوم بوانی چۆڵی مەحەببەتیەتی ، خودا**
**تەبشیری (والسلام علی تابع الهدی )**

**نیوە بەیتی دووهەمی بەیتەکە ئاماژەیە بۆ ئایەتی ( و السلام علی من اتبع الهدی ) وە هەروەها**

**زلەی موعەللیم ، ئەو گوڵی ڕومەتیە خستە تەب**
**( تبت یدا أبی لەب ) ی بێ ئەدەب ( و تب )**

**ئازاری دام و هەرکەسە کردی لە گردی خۆی**
**هێزم کەشی جەهەننمە ( حماله الحطب )**





**ئەو دوبەیتەی سەرەوەش هەر ئاماژەیە بۆ سورەتێکی قورئان کە سورەی (مەسەد) ە ،وە زۆرێك لە غەزەلەکانیش ئاماژەی داوە بە ئایەتێك یان حەدیسێکی پەیامبەری ئیسلام (درودی خوای لەسەر) ،یان باسی جێ نشینەکانی دوای پەیامبەری کردوە کە دەفەرموێت :**

**دەپرسن : کیمیا ؟ خدمەت بە مەرد ، ئەمما بە ئیخلاصی**
**وەگەرنا کەم لە (ئەبوبەکر) ی نەبو خدمەت (ئەبوگالیب)**

**ئەمە پەیوەندیەکی سەرەتاییە لە لە نێوان مەحوی و خوادا ، دواتر دەکرێت بە شوێن مانای پەنهان و شاراوەی تردا بگەڕێین ، ئەویش بە پێ یەی کە مەحوی میتۆدگەرابووە ، لەبەرئەوە بە میتۆدی خۆیی و لە چوارچێوەی شەرع دا خوای ناسیوە و بەڵام ئیشیشی لەسەر (بان خوداناسی) کردوە ،وە ئەوەی ئەم کردویەتی لە بابەت خوداناسیەوە زۆر گرنگ بووە ، ئەو بە خودا پارێزگاری لە مەعریفە کردووە و بە مەعریفە پارێزگاری لە خوا کردووە ، ئەمە بۆ ئەو کەسانەی کە داوەری بکەن لە نێوان تێکستە شیعرەکانی مەحوی گەورە بە ئاسانی هەست بەوە دەکەن ، کە ئەو پارێزگاری کردنە دواجار دەبێتە هۆیەك بۆ بەرهەمەێنانی**

شتێك بە ناوی (مەعریفەی دینی ) و (خواناسی عاقڵانە) ، من قسەم لەسەر ئەوە نیە کە عەقڵ لە دڵە یان لە دەماغ ، لەمەوە مرۆڤ بە خواستی خۆی شتەکانی بەرهەم هێنا ، مەحوی ش مرۆڤە ، کەواتە ئەوە دیاردەناسی ڕۆحانیەت و مەعنەویەتە لە هەندێك یان گروپێك لە مرۆڤەکان ، من پەیوەندیم بەوەوە نیە کە بۆ هەموو مرۆڤەکان ناتوانن ئەوە بکەن، چونکە ئەوە بابەتێکی ئاڵۆزەو ئەگەر بمانەوێت قسەی لەسەر بکەین دەبێت لە سیاقی عیرفانی دەربچین و بچینە سەر فەلسەفەی گومان و وجودیەتی ئەزموونگەرایی ، بۆیە ئێمە تەنها لە ڕووە عیرفانی و فەلسەفە دینیەکەوە تێروانین بۆ ئەو مەسەلەیە دەکەین ، وە گرنگە ئەوە بزانین کە بیستنی خودا ئەو شتە بۆ ئەو گروپە دەکات و بۆ ئەو گروپە نایکات، ڕەتی بکەینەوە، وە دواجار خوێندنەوە بۆ ئەو مەسەلەیە بکەین، چونکە بیستن لە پێش خوێندنەوەیە و دوای بیستن پێویستە ئیدی خوێندنەوە بکرێت بۆ ئەو بابەت ، وە هەڵبەت ئەمجۆرە خانەبەندیە لە پرۆسەی زمانفێربوونیشدا هەر ئیشی پێ دەکرێت ، هەر بۆیە مەحوی لەم ڕوانگەیەوە ویستویەتی لە خودا تێبگات و ئاراستەی بۆچوونەکانی خۆی بکات لە هەمبەر خودا ناسی دا ، دیارە مەحوی ئەم کارەی کردووە بۆ ئەوە بووە کە لە جەهالەتی دیندارەکان





ڕزگار بێت ، چونکە بەشێکی زۆری دیندارە تەقلیدیەکان ئاینی پیرۆزی ئیسلامیان کردۆتە ئەفیون ، کە خۆی لە ڕاستیدا تەواو پێچەوانەیە و ئیشی بۆ ئەوە کردووە کە ئەم ئایینە نەبێتە بابەتێکی ئەفیونی ،لەبەرئەوە پێویستە هەریەك لە ئێمەش کار لەسەر ئەوە بکەین دونیا لە گەڵ دین و دونیا لەگەڵ دونیا ئاشت بکەینەوە ، چونکە ئێمە هەمیشە پێویستیمان بە خودای ئاسمانەکان و زەوییە ،بۆ تێگەیشتن و بۆ ئارەزومەندەگی بۆ تێگەیشتن لە جەوهەری شتەکان .

سەرچاوەکان :

(١) دیوانی مەحوی /مەلا عەبولکەریم موددەریس١٣٨٥/ چاپ سێیەم/انتشارات کردستان

(٢) غزلیات سعدی /تهیه و تنظیم .سایت فرهنگی ,اجتماعی ,
خبر تربت جام ,ل ٣٥
Torbatjam.com

(٣ )کلیان دیوان شمس/مؤسسۀ انتشارات نگاه

/تهران ,۱۳۷۸/ ص۵۳۱
عرفان و میرات روشنفکری دینی/سروش دباغ
www.drsoroush.com/

**سەرچاوە کوردیەکان :**

١. دیوانی مەحوی /عبدولکەریم مودەرریس/ چاپ ١٣٨٥/سێهەم/کوردستان، سنە

٢. هەژان/گۆڤار،ژمارە ٢٠٠٦/١٩دەروازەیەك بۆ ناساندنی فەلسەفەی دین/





٣. تەحسین حەمە غەریب/ل ٤٤

٤. دیوانی وەفایی/علی قرداغی/انتشارات کوردستان/١٣٨٩

٥. دیوانی مەولەوی/عەبدولکەریم مودەریس/کتابخانە ملی ایران/١٣٧٨ چاپ دووەم

٦. بوون لە شیعری مەحویدا/د.محەمەد امین عەبدوڵا/٢٠٠١/کوردۆلۆجی

٧. سۆفیگەری/لە شیعری ئاینی و لە شیعرە کوردیەکانی مەحویدا/

٨. د.ئیبراهیم ئەحمەد شوان/چاپی یەکەم،هەولێر/٢٠٠١

٩. کۆچ/ژمارە ١٤/ چاوپێکەوتن لەگەڵ د.ئیبراهیم ئەحمەد شوان/٢٠١١

١٠. .

١١. دیوانی نالی /عبدالکریم مودەرریس/١٣٧٩/اتشارات کوردستان/چاپ : دوم /ل ٣١٧

١٢. هـەژان ،گۆڤـار/ژ: ١٩ /ل٢٧/پێگـەی شـەریعـەت لـە قەڵەمڕەوی عیرفان دا/یەحیا یسریبی/و: بیلال باسام

١٣. هەژان،گۆڤار/هەمان ژمارە ، تـەحسین حـەمـە غـەریب دەروازەیەك بۆ ناساندنی فەلسەفەی دین

١٤. ڕۆحـی دینـداری ، فـەلسـەفـەی دیـن/مودریك عـەلـی عارف /هەژان:١٩،ل٣٥٣

سەرچاوە فارسیەکان :

١. نزد عرفا/سروش دباغ/سایت عبدالکریم سروش

٢. کلیـات دیـوان شمـس/مولانـا رومـی / بـدیع الزمـان : فروز انفر/تهران ١٣٨٧/چاپ چهارم ، فیپا

٣. غزلیات سعدی/ تەیە سایت : فرهنگی و اجتماعی / تربت جام





٤. صدای پای اب/سەراب سپەری در سایت : www.kafshhayamkoo.persianblog.com

٦. عبـدالکریم سـروش/ صـراطهای مـستقیم/ مؤسـسة فرهنگی سراط

٧. دیـوان حـافظ شـیرازی / خـط : حـسمین جعفـری تبار/انتشارات: علمی /چاپ دوم/١٣٨١

٨. عبــدالکریم ســروش/روزنامــە/ەمــشەری /عــدد ٢٠٧٠/سن ١٣٧٨

٩. قـصە اربـاب معرفـت /عبـدالکریم سـروش / سـراط/ ١٣٨٣

١٠. اخلاق خدایان/عبدالکریم سروش/سراگ/کتابخانە ملی ایران/

١١. غزلیات سعدی در سایت :

١٢. TorbatJam.com

١٣. **دیوان رباعیلت / ابو سعید ابولخیر**

١٤. **عرفان و میراپ روشنفکری دینی/سروش دباغ** /www.drsoroush.com/**اڑر ١٣٨٩**

١٥. **فرهنگ لغات و اصطلاحات و تعبیرات عرفانی.د.سید جعفر سجادی**

١٦. **,کتابخانه /گەوری,تەران/چاپ دوم ،١٣٥٤/ە.ش**

١٧. **عبدالکریم سروش/سایت سروش/**www.drsoroush.com

١٨. happiness is like the rainbow it comes suddenly , and before you can enjoy it – it disappears

٢٠. **رازدانی و روشنفکری دینداری /عبدالکریم سروش/مجموعه معرفت شناسی/تهران/**

٢١. **مۆسسه فرهنگی سراگ/١٣٧٧،چاپ سوم/ص ٢٤**







٢٢. **فردالدین محمد عطار نیشاپوری/غزلیات ، ترجیعات ،قصائد،ترکیبات/ەو : ١٢١**

٢٣. **حکمت و معیشت / د.عبدالکریم سروش/سراگ**

٢٤. **فلسفەو عرفان/ د.یحی یپریبی**

**سەرچاوە عەرەبیەکان :**

١. **فلسفة الحب/افلاطون،ت : د.ولیم الميري،دار المعارف/مصر/١٩٧٠/ص٣٠-٣١**

٢. **أصل اخلاق و فصلها/فردريك نيتشة/ت :حسين قبيسي/بيروت ،لبنان/سنة ١٩٨٣/ص٩٥-٩٦**

٣. **نداء الحقيقة/ مارتن هايدجر/ت.أ.د. عبدالغفار المكاوي،دار الشرقيات**

٤. **للنشر والتوزيع/القاهرة/٢٠٠٢/ص ١١٧-١١٦**

٥. **موسوعة علوم فلسقفة /مجلد الثاني ،هيجل /ص ٢٦٢**

٦. **سورين كيركجارد/مؤسس الوجودية المسيحية / دار المعرفة الجامعية /د.علي عبدالمعطي /سنة ١٩٨٥/ص١١٤**

٨. الوجود و العدم/جان بول سارتر/عبدالرحمن بدوي/دار الأدب-بيروت/ط/١

٩. سنة/ ١٩٦٦/ص :٧٠٤

١٠. اشكالية التواصل في الفلسفة الغربية المعاصرة/عمر مةيبل/ص١٥٥

١١. كتابات أساسية / الجزء الثاني / مارتن ةيدجر(ما الينافيزيكا) ، تأليف/اسماعيل المصدق ، المجلس الاعلي للثقافة / طبعة ١ / س ٢٠٠٣ /ص٢٠

**ئەو کتێب و بڵاوکراوانەی لقی کەرکووکی یەکێتی نووسەرانی کورد پاش کۆنفرانسی ئازادی بەچاپی گەیاندوون جگە لە گۆڤاری گزنگ کە بەردەوام مانگانە دەردەچێت**

| ز | ناوی کتێب | بابەت | نووسەر | وەرگێڕ | ساڵ |
|---|---|---|---|---|---|
| ١٠٨ | خوێندنەوەی چەند دەقێکی | خوێندنەوە | سامان محەمەد | | ٢٠١٠ |
| ١٠٩ | هەرمێیەکانی فیرعەون | شیعر | ئەحمەدی مەلا | | ٢٠١٠ |
| ١١٠ | تەونێك لە شیعر و وشە | لێکۆڵینەوەی ئەدەبی | مەحمود نەجمەدین | | ٢٠١١ |
| ١١١ | ١ ١ ١ نامەی سۆزداری | تێکستی دڵداری | کۆکردنەوە و ئامادەکردنی: | | ٢٠١١ |
| ١١٢ | دانای کوێخا شەوکەت | ڕۆمان | موعتەسەم ساڵەیی | | ٢٠١١ |
| ١١٣ | سەمای روح | کورتە چیرۆك | نەوزاد یوسف کاکەیی | | ٢٠١١ |
| ١١٤ | سلێکوك هۆکلێر عاجباتیی هەشتەم | ڕۆمان | عەبدوڵڵا سەڕاج | | ٢٠١١ |
| ١١٥ | خەزان و شنەی بەیان | شیعر | غازی ڕەشید زەنگنە | | ٢٠١١ |
| ١١٦ | بزووتنەوەی ڕوانگە و شاعیرانی حەفتا و | لێکۆڵینەوەی ئەدەبی | د.هیمدادی حوسێن | | ٢٠١١ |





| ز | ناوی کتێب | بابەت | نووسەر | وەرگێڕ | ساڵ |
|---|---|---|---|---|---|
| ١١٧ | ئاوابوونی جەستە لە سەفەری دڵدا | شیعر | ستار ئەحمەد عەبدولڕەحمان | | ٢٠١١ |
| ١١٨ | دەرگاکان | کۆچیرۆك | خالید مەجید فەتحوڵڵا | | ٢٠١١ |
| ١١٩ | تەنیا لەبەر مەعاشەکەیە | کورتیلە چیرۆك | بەکر دەروێش | | ٢٠١١ |
| ١٢٠ | گەشەکردنی زمانی منداڵ | زمانی منداڵ | | و: د.ئازاد باخەوان و | |
| ١٢١ | لە لووتکەی ئەدەبی ئەڵمانەوە | لێکۆڵینەوەی ئەدەبی | عومەر عەلی شەریف | | ٢٠١١ |
| ١٢٢ | وازیەکانی رەشە گۆم | ڕۆمان | کاکە مەم بۆتانی | | ٢٠١١ |
| ١٢٣ | شاری لەغەم ئاوسبوو | ڕۆمان | سالار ئیسماعیل | | ٢٠١١ |
| ١٢٤ | ململانێ لەگەڵ پرسیاردا | کۆدیدار | دانا عەسکەر | | ٢٠١١ |
| ١٢٥ | ئەو نامانەی بۆ پیرێتی خۆم دەیاننێرم | دەق | سوارە نەجمەدین | | ٢٠١١ |
| ١٢٦ | عامُ الصِّفْرْ | شعر | صباح رەنجدەر | ترجمة: المهندس | ٢٠١١ |
| ١٢٧ | ڕاکشان لە تەنیشت تارمایی نیشتمانەوە | چەند دەقێکی | عەبدوڵا سڵێمان (مەشخەڵ) | | ٢٠١١ |
| ١٢٨ | لقاءات تحت أشعة الحروف المشرقة | مجموعة حوارات | سردار زنكنه | | ٢٠١١ |
| ١٢٩ | دزەکان | کۆمەڵە چیرۆك | | ئازاد نةجم | ٢٠١١ |
| ١٣٠ | ڕووبەرێکی ڕەخنەیی | ڕەخنەی ئەدەبی | د. فوئاد ڕەشید | | ٢٠١١ |
| ١٣١ | کتێب | خوێندنەوەی بیست | جەلیل کاکەوەیس | | ٢٠١١ |
| ١٣٢ | لە سۆاخی عیشقدا | کۆمەڵە چیرۆك | سەلمان شێخ بزێنی | | ٢٠١١ |
| ١٣٣ | عومەر سەیفەدین | لێکۆڵینەوە | | و. لە تورکییەوە: | ٢٠١١ |
| ١٣٤ | مەحوی ناسی | لێکۆڵینەوە | هیمداد شاهین | | ٢٠١١ |

